

زنجیرەی
شاکارنووسانی کورد
لە سەدەی بیستەم دا

٣



# جەمیل سائیب

دەرچواندن و ئامادەکردنی:

د. ئازاد حەمە شەریف

زنجیرەی شاکارنووسانی کورد لە سەدەی بیستەم دا / /ژمارە (٣)

# (جەمیل سائیب)ی شاکارنووس

## کۆمەڵێك وتار و لێکۆڵینەوەی رەخنەیی

نووسین و ئامادەکردنی

پ. ی. د . ئازاد حەمە شەریف




هەولێر - ٢٠١٢




**دەزگای توێژینەوە و بڵاوكردنەوەی موكريانی**

- **(جەميل سائيب)ی شاكارنووس**
- نووسين و ئامادەكردنی: پ. ی. د. ئازاد حەمە شەريف
- نەخشەسازی ناوەوە: تەها حسێن
- بەرگ: ئاسۆی مامزادە
- ژمارەی سپاردن: (٣٢٨)
- نرخ: ٣٠٠٠ دينار
- چاپی يەكەم : ٢٠١٢
- تيراژ: ١٠٠٠ دانە
- چاپخانە: چاپخانەی هێڤی (هەولێر)

**زنجيرەی كتێب (٦٣٧)**

ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئيمەيل: info@mukiryani.com


**تێبينی: زۆربەی ئەم نووسينانەی لێرەدا بڵاوكراونەتەوە، كەم و زۆر دەستكاری رێنووس و زمانی نووسينيان نەكراوە چونكە ستايل و شەقڵی ئەو رۆژگارەيان پێوە ديارە كە تيايدا نووسراون. (د. ئازاد)**

# ناوەرۆك

# له جیاتی پێشەکی:
# (جەمیل سائیب) وەك خۆی

د. ئازاد حەمە شەریف

زۆرن ئەو نووسەرە بلیمەتانەی لە سەردەمی خۆیان پشتگوێ دەخرێن. هی وا هەن لەبەر هۆی سیاسی و هی واش هەن لەبەر هۆی کۆمەڵایەتی و هەندێکیان لەبەر هۆی ئایینی و هی تریش هەن لەبەر هۆی رەوشتی. جا بە تێپەڕبوونی کات و رۆژگار ئەو نووسەرانەی کەوتوونەتە بەر شاڵاوی سەرکوتکردن و پشتگوێ خستن زۆر لە نووسەرانی دیکە بەهێزتر دێنەوە ناو گۆڕەپانی ئەدەب و فیکر و زۆر لەوانەی لەسەردەمی خۆیان رێزیان لێگیراوە بە هەرمێنتر دەکەون.

ئەگەر سەیرێکی ئەدەبی میللەتانی دنیا بکەین، لەو نووسەرانەی کە بەهۆی سیاسەتەوە بەر شاڵاوی بەربەرەکانێ و ململانێ و پشتگوێ خستن کەتوون ژمارەیان لە سەدان نووسەر تێپەڕ دەکات. هەموو ئەو نووسەرانەش کە بەربەرەکانێ کراون نووسەری رەسەن و کاریگەرن، چونکە ئەوان خاوەن روانینی جیاواز بووینە لەو سەردەم و رۆژگارەی تیایدا ژیاون و هەندێکیش لەوان زۆر بە پێش رۆژگاری خۆیان کەوتوون.

لەو نووسەر و بیرمەند و فەیلەسوف و روناکبیرانەی کە بەر ئەم شاڵاوەی سەرکوتکردن و لەناوبردن و هەندێك جاریش ناوزڕاندن کەتوون هێندە زۆرن کە

وەختە بڵێیم بۆم لە ژمارە نایەن. هەر بۆ نموونە من لێرەدا ناوی هەرە دیارەکانیـان دەهێنم کە ئەمانەن: سوکرات، ئیمپیدۆکلیس، تۆماس مۆر، برۆنـۆ، مەنسـووری حەلاج، جۆن گالبرێس، جۆناسان راندڵ، ئێریش ماریا ریمارك، جۆرج ئۆروێڵ، جۆن میلتن، ریچارد رایت، نادین گۆردەمیر، گاو خینگیان، ئەلێکزاندەر سۆلژێنسـتین، کورت ڤۆنیگوت، هاوارد فاسـت، کـارڵ مـارکس، بـۆریس پاسـترناك، جۆناسـان سویفت، جۆن شتاینباك، ئیسماعیل بێشکچی، یەشار کەمال، حەسـەن قزڵجـی، گۆران، هێمن موکریانی، سەمەدی بـەهرەنگی، عەبـدولخالیق مـەعروف، محـەرەم محەمەد ئەمین، جەمیل رەنجبەر، دڵشاد مەریوانی، ووڵ سۆینیکا، ڤیکتۆر هیوگۆ، ئوپتن سینکلێر، دونگ سو هوانگ، ئێدوارد سەعید، لیـۆن ترۆتسـکی، تۆمـاس پێین، نێلسن ماندێلا، تۆماس جێفرسن، میگێل ئەستۆریاس، هارێت بێشەر ستاو ، تۆم رید، ها جین، نۆرمان مێیلەر و دەیان نووسـەر و فەیلەسـوف و بیرمەنـد و روناکبیری تر.

بێگومان ئەگەر نووسەر لە بەرامبەر جەور و ستەمی دەسـەڵاتداران بێـدەنگ بێت ئەوا هەرگیز نەتووشی کێشە دێت و نەکەسیش پێی دەڵێت لە بەری چـاوانت دوو برۆ هەیە. خۆ ئەگەر قەڵەمەکەی بفرۆشێت و ببێتە زۆرناژەنی فەرمانڕەواکان و بە فیتی ئەوان هەڵپەڕێت، ئەوا دەستی کەرەم و بەخشندەیی ئەوان ئەوەندە پارە و سامانیان بەسەردا دەبارێنێت تا سووك و ریسوا و گێل و گەمـژەیان دەکـات و وایان لێدەکات ببن بە کۆیلەی پارە و سامانەکەیان. ئەوساش ناکرێت ناوی نووسەر بەم جۆرە کەسانە رەوا ببینرێت چونکە دوای بوون بە مووچـەخۆری خـەڵکانی تـر ئەوان ناتوانن گوزارشت لە راز و خورپەی دڵ و مێشکی خۆیان بکەن، بەڵکو ئەوان بە فەرمانی کەسانی سەرووی خۆیان دەنووسن و لە نووسەرییەوە دەبن بە نووسیار. نموونەی نووسیاری وا لە هەموو سـەردەم و رۆژگارێکـدا ئەوەنـدە زۆرن پێویسـت بەناوهێنان ناکات چونکە هەمووومان ئەو جۆرە نووسـیارانە دەناسـین و ئـەوانیش بەخۆیان لە ئێمە چاکتر خۆیان دەناسن.

بەڵام ئەو نووسەرانەی قووڵ و رەسەنن، ئەو نووسەرانەی کاریگەر و خامەتیژن، ئەو نووسەرانەی لە ئاست راستیدا خۆیان کەڕ و کوێر ناکەن و ویژدانی خۆیان نامرێنن، بێگومان ئەوانن دەکرێنە نیشانە و لە هەر ساتەوەختێکدا بۆ دەسەڵاتداران بلوێت بەخوێنی سەریان تێنوون. خۆ ئەگەر نەشتوانن بە جەستە بیانکوژن، بەسەدان شێوە کەسایەتی و رۆحی ئەوان دەکوژن.

جا ئەگەر بەرهەمی نووسیارانی دەسەڵات تەنیا لە رۆژگاری خۆیان تەپڵی رەسەنایەتی و مەزنێتییان لە لایەن دەزگاکانی راگەیاندندا بۆ لێ بدرێت، ئەوا بێگومان بە بەسەرچوونی ئەو کات و رۆژگارە ئەوان لەبیر دەچنەوە و زۆر جارانیش بە گۆڕانی رۆژگار بەر نەفرەتی مێژوو دەکەون. نموونەی لەو بابەتە نووسیارانە لە هەموو وڵاتێکدا هێندە زۆرن، پێویست ناکات ئاماژەشیان پێ بدرێت. کەچی پێچەوانەکەی ئەمە لەگەڵ دەستەی نووسەر و روناکبیرە راستەقینەکان راستە. لەگەڵ بەسەرچوونی رۆژگار، ئەو نووسەرانەی بەهۆی جیاوازی بیروباوەڕەکانیان تووشی سەرکوتکردن و چەرمەسەری هاتوون، ئەوان دێنەوە سەرتەختەی شانۆ و جێ بە نووسیارانی پێشوو چۆل دەکەن. ئەم راستییەش وەکو رۆژ روونە و با سەدان ساڵیش تێپەڕ ببێت، گرەوی مێژوو هەر دەستەی سەرکوتکراوان نەك دەستەی نووسیارە قەڵەم فرۆشەکان دەیبەنەوە.

ماوەی ٨٧ ساڵ لەمەوبەر (جەمیل سائیب)ی شاکارنووس بە تاقە یەك بەرهەم کە (لە خەوما)یە رۆژگاری خۆی هەڵسەنگاندووە و هەر بەو تاقە بەرهەمەش لە گەورەترین دەروازەوە چووە ناو مێژووی چیرۆکی کوردییەوە و بووە سەرەتا و سەرمەشق بۆ هونەری چیرۆك نووسین و هونەری نۆڤلێت. هەرچەندە کۆنەخوازان و شێخپەرستان و خێڵپەرستان ویستیان دەنگی ئەم نووسەرە رۆشنبیرە دلێرە کپ بکەن، هەرچەندە لێرە و لەوێ بە کاردانەوەی سۆز دەیان وتار و نووسین بڵاوکرانەوە بۆ ئەوەی لە بەهای شاکارەکەی ئەو کەم بکەنەوە، بەڵام تا رۆژی ئەمرۆش ئەو بەرهەمە دانسقەیەی (جەمیل سائیب) چ لەلایەنی هونەرییەوە و چ لەلایەنی شێوازی

نووسین و چ له لایەنی وەسفکردنەوە و چ لەلایەنی فیکریشەوە بەهێزترین نۆڤلێتە لە ئەدەبی کوردیدا نووسرابێت.

ئەگەر بەدوای راستی رووداوەکانی هەر سەردەمێکیش دا بگەڕێین، ئەوا کتێبی مێژوو پڕە لە درۆی رەنگاورەنگ، بەڵام بەرهەمی ئەدەبی جۆرە راستییەك دەخاتە روو کە لە هیچ کتێبێکی مێژوو نادۆزرێتەوە. هەر بۆیەش ئەو بەرهەمە راستترین بەڵگەنامەیە کە بەچاوێکی ریالیزمی رەخنەگرانە و بە وێژدانێکی زیندووەوە پەنجە لەسەر هەموو ئەو برینانە دادەنێت کە تا رۆژگاری ئەمڕۆش کۆمەڵگەکەمانی پێوە دەتلێتەوە.

ئەگەر نووسینی کوردی لە رێچکەی (جەمیل سائیب) لای نەدابووایە و بە لاڕێدا نەبرابووایە و لە چاوسوورکردنەوەی دەسەڵاتداران نەترسابووایە و بە ئافەرین و خەڵات و بەخشش فریووی نەخواردبایە، مسۆگەر ئێستا نووسینی کوردی گەیشتبووە ئاستی جیهانی و نووسەرانی کوردیش وەکو هی وڵاتانی جیهان لەناو کەتەلۆگی دنیا ناسرابوون و رەنگیشە خەڵاتی (نۆبل) بەر نووسەرێکی کورد بکەوتایە.

ئەو نووسینانەی رەخنە لە بەها و سیستەمە رزیووەکانی کۆمەڵگەکانیان دەگرن و پانتاییەکانی ئازادی تاك فراوان دەکەن، هەر ئەوانن سەرنجی خوێنەرانی ناوخۆیی و دنیا بەلای خۆیاندا رادەکێشن نەك پێچەوانە. بەڵام ئەو نووسینانەی لە ترسان یان لە برسان ملکەچی سەردەم و رۆژگار و دەسەڵات دەبن، دەبێت وەکو خاوەنەکانیان شەو تا بەیانی بەسەرخۆشی وڕێنە بکەن و نووسینەکانیشیان لە بۆنی ئارەق و مەی زێتر بۆنی گوڵ و خاك و مرۆڤی لێ نایەت.

نووسەرانی دڵسۆز بەپێی هەموو پێودانگە جیهانییەکان ئەو کەسانەن کە زۆرترین رەخنە ئاراستەی کەموکوڕی و ناتەواوییەکانی سەردەم و کۆمەڵگەی خۆیان دەکەن، نەك ئەوانەن کە بە درۆ تەپڵی خۆشگوزەرانی و بەختەوەری لێدەدەن. هەر بۆیەش نووسەرێکی وەکو (جەمیل سائیب) کە لە بنەماڵەیەکی رۆشنبیر و کوردپەروەری

سلێمانی هاتۆتە دنیاوە و خوشکەزای پیرەمێردی شاعیر بووە، ناکرێت کەس بە خەیاڵی دابێت کە لە نادڵسۆزییەوە رەخنەی لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتی شێخ مەحموود گرتووە. چونکە ئەو رەخنانەی ئەو و هی شێخ محەمەد خالصی کوڕی شێخ رەزای تاڵەبانی و هی شاعیری کوردپەروەر (حەمدی) بۆ ئەوە نەبووە کە حوکمداریێتی شێخ مەحموود بڕووخێت، بەڵکو بۆ ئەوە بووە کە چاکسازی و پاکسازی لە دارودەستە و جۆری فەرمانڕەوایەتی شێخ مەحموود دا بکرێت بەر لەوەی ئەو دەرفەتە زێڕینەی پێش دامەزراندنی حکومەتی عێراقی لە دەست کورد بچێت. هۆی گرتنی ئەم رەخنە توندانەش لە شێخ مەحموود بۆ ئەوە بووە لەو خەوەی واگابهێننەوە کە دارودەستەکەی بە شەو و بە رۆژ خەواندبوویان.

هەر لەسەرەتای مێژووشەوە تا رۆژی ئەمڕۆ نووسەران و روناکبیران زەنگی هۆشیارکردنەوەی دەسەڵاتداران بووینە لەو مەترسییە شاراوانەی دەورووبەری دەسەڵاتدارانی گرتووە و هەر ئەوانیش هەوێنی گۆڕانی کۆمەڵگەکەیانن. رەخنەکانی ئەم جۆرە نووسەرە راستەقینانە هەمیشە تەرمۆمەتری گەرمی و ساردی پەیوەندی نێوان دەسەڵاتداران و هاووڵاتیان بووە. جا ئەگەر شێخ مەحموود بە قسەی روناکبیران و نووسەرانی سەردەمی خۆی بکردایە، ئەوا نە بەخۆی تووشی نوشستی دەهات و نە کۆمەڵگەی کوردەواریش هێندە ئازار و چەرمەسەری دەبینی و نە خەونی سەربەخۆییشمان هێندە بەدوا دەکەوت.

**هەولێر: ١/١/٢٠١٢**

# ژیاننامەی جەمیل سائیب

**د. ئازاد حەمە شەریف**

- بنەماڵەی (جەمیل سائیب) لە بەرەبابی (مەلا حەسەن قەرەداغی- سائیب)ە.
- باوکی (جەمیل سائیب) ناوی (مەلا ئەحمەد سائیب)ە و دایکیشی ناوی (حەبیبە مەحموود ئاغای مەسرەف)ە.
- لە رۆژی ١٦ ی ئابی ١٨٨٧ لە شاری سلێمانی لەدایك بووە.
- بەمنداڵی لە حوجرەی (مەلا ئامینە) قورئان و فارسی خوێندووە.
- کاتێك باوکی قازی بووە لە هەڵەبجە لە حوجرەی (مەلا ئەحمەدی تەکیەیی) خوێندوویەتی.
- دواتر کە گەڕاونەتەوە سلێمانی لە حوجرەی (مەلا عەزیزی زلزلەیی) خوێندوویەتی.
- دوای حوجرە چۆتە قوتابخانەی سەرەتایی لە سلێمانی.
- پاشان کاتێك باوکی چۆتە قەڵادزە بۆ ماوەی ساڵ و نیوێك لە خوێندن دابڕاوە.
- دواتر چۆتەوە بەر خوێندن لە مزگەوتی هەمزاغای باپیری پیرەمێرد. لەو کاتەدا تووشی نەخۆشیی رۆماتیزم بوو کە تا مردیش هەر پێیەوە دەیناڵاند.
- دوای مردنی باوکی بۆتە فەرمانبەری میری بە ناونیشانی (وێرگۆ- باج) لە سلێمانی.
- لە ساڵەکانی ١٩١٩- ١٩٢٠ دا نووسینی خۆی لە رۆژنامەی (پێشکەوتن) کە لە سلێمانی دەردەچوو بڵاوکردۆتەوە.

- ساڵی ١٩٢٠ لەو پێشبڕکێیەی کە (مێجەرسۆن) بۆ بە کوردی نووسین لە رۆژنامەی "پێشکەوتن" رایگەیاند بوو، جەمیل سائیب بە پەخشانێکی هونەری بەناونیشانی "رۆژەوەبوونێك" بەشداری تێدا دەکات و گرەوی سێیەم دەباتەوە.
- کوژرانی (جەمال عیرفان) لە رێکەوتی ١٢ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٢٢ کە برادەری (جەمیل سائیب) و برای (حەبیە و حەفصە)ی ژنی (جەمیل سائیب) بوو لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتی شێخ مەحموددا گرێیەکی دەروونی لەلای (جەمیل سائیب) دروستکرد.
- دوای کوژرانی (عارف سائیب)ی برای (جەمیل سائیب) لە شەوی ١٦ی مایسی ١٩٢٣ بە دەستی خزمێکی شێخ، برینێکی قووڵ کەوتە ناخی (جەمیل سائیب) و بەتەواوی دڵی لە شێخ مەحموود دەڕەنجێت. شایەنی گوتنە ئەو برایەی (جەمیل سائیب) ئەفسەرێکی پایەبەرزی سوپا و شاعیرێکی هەست ناسکیش بوو.
- لە ساڵی ١٩٢٤ دوای نەمانی حوکمی شێخ مەحموودی (حەفید) دەبێتە سەرنووسەری رۆژنامەی (ژیانەوە) لە سلێمانی.
- دواتر وازی لە کاری سەرنووسەری هێنا و بۆوە بەڕێوەبەری (گەنجینە) کە تا کاتی خانەنشین بوونی لە ساڵی ١٩٤٩دا لەوێ مایەوە.
- دواتر ماوەیەك بۆوە سەرنووسەری رۆژنامەی (ژین)ی پیرەمێردی خاڵی و تا لە پاییزی ١٩٥١ تووشی نەخۆشییەکی قورس بوو و بردیانە بەغدا و رۆژێك دواتر ، لە رێکەوتی ١٩٥١/١٠/١٣ کۆچی دوایی کرد. تەرمەکەیان هێناوە سلێمانی و لەسەر گردی (مامەیارە) لە تەنیشت "پیرەمێرد"ی خاڵی نێژرا.
- (جەمیل سائیب) زمانەکانی (کوردی) و (عەرەبی) و (فارسی) و (تورکی) بەباشی دەزانی.
- چوار ژنی هێناوە: (أ) لە ژنی یەکەمی کە ناوی (عائیشە حاجی سلێمان کەماڵانی) بوو ئەو منداڵانەی بووە: (فەوزی، محەمەد کامیل، محەمەد عەلی). (ب) لە ژنی دووەمی کە ناوی (بەهیە محەمەد ساڵح ئاغای فەرالمورز عەتار)بوو هیچ

منداڵێکی نەبووە. (ج) لە ژنی سێیەمی کە ناوی (حەبیبە عەبدوڵلا عیرفان ئەفەندی) بوو ئەو منداڵانەی بووە: (نەژاد، بەدیعە، وەدیعە، نەسرین، درەخشان). (د) لە ژنی چوارەمی کە خۆشکی هاوسەری سێیەمی بووە و دوای کۆچی ژنەکەی پێشووی، ئەوی خواستووە و ناوی (حەفصە عەبدوڵلا عیرفان ئەفەندی) بوو ئەو منداڵانەی بووە: (نەوزاد، پەروین، ئازاد، روناك، بەهزاد، شازاد).

- (جەمیل سائیب) تەنها نۆڤڵێتێك بە ناونیشانی (لە خەوما) و پەخشانێکی بە ناونیشانی (رۆژەوەبوونێك) بەشێوەیەکی بەربڵاو بڵاوکردۆتەوە.
- دەیان بابەتی جۆراوجۆری لە رۆژنامەی (پێشکەوتن) و (ژیانەوە) و (ژین)دا چ بەناوی خۆیەوە چ بەبێ ناو بڵاوکردۆتەوە و تا ئێستا ئەم بەرهەمانەی کۆنەکراونەتەوە و رەنگە کۆکردنەوەی ئەم بەرهەمانە زیاتر تیشك بخەنە سەر چەند لایەنێکی دیکەی توانا و زمانپاراوی ئەم نووسەرە بلیمەتە.

---

(*) لێرەدا بە پێویستی دەزانم کە سوپاسی برای نووسەر کاك (عبدالخالد صابر– مامۆستا خالید) بکەم کە هەندێك زانیاری بەسوودی لەبارەی ژیانی (جەمیل سائیب) و بنەماڵەکەی پێدام. هەروا بۆ نووسینی ئەم ژیاننامەیە سوودم لە کتێبە بەهادارەکەی ئەو کە (شەجەرەی بنەماڵە دێرینەکانی سلێمانی)یە بینیووە. هیوادارم هەر نموونەیان زۆر بێت بۆ خزمەتی ئەدەب و کەلتووری کوردی. (د. ئازاد)




# سەرەتای چیرۆکی کوردی و جیاوازی نێوان یەکەم و دووەمیان!

**ڕەوف حەسەن**

هەرچەندە باسی یەکەمین چیرۆکی هونەری کوردی و بەراوردکردنی لەگەڵ یەکەمین چیرۆکی نەتەوەکانی دەوروبەرماندا و لە یەکچوونی ناونیشانەکانیان و پێوەندی یەکەمین چیرۆکمان، یان چیرۆکە سەرەتاییەکانمان بە کەلەپووری نەتەوایەتیمانەوە و کەلەپووری جیهانییەوە و سوودوەرگرتن لە هونەری چیرۆکنووسی هونەرمەندان و ئەدیبانی دی. ئەمانە و چەندەها کێشە و جەمسەریتریش هەن و ئەمەندە بەربڵاون و هێندە پەلوپۆیان لێدەبنەوە کە هەریەکەیان بە باسێکی تێروتەسەل و کامڵ نەبێت ڕێکبخرێن. هەروا بە پەرش و بڵاوی دەمێننەوە، بەڵام ئەوەی لەم وتارەمدا مەبەستمە بیخەمەڕوو چەمکێکە لەو باسانە و بۆ ئەوەی مەبەستەکەشم پەرش و بڵاو نەبێتەوە. ئەوا لێرەدا دەستنیشانی بابەتەکە دەکەم و دەیکەم بە دوو بەشەوە:

بەشی یەکەمیان: ڕای تایبەتی خۆم لەمەڕ پەیوەندی و سوودوەرگرتنی کۆچکردوان (جەمیل سائیب و ئەحمەد موختار جاف) لە کەلەپووری نەتەوایەتیمان و هونەری جیهانی لە دانانی چیرۆکەکانیاندا.

بەشی دووەم: بەراوردکردنێکی هەردوو چیرۆکەکە و شیکردنەوەی ئەو ڕایانەی لە کتێبی (چیرۆکی هونەریی کوردی)دا دەربڕاون.

## کەلەپووری کوردی و سەرەتای چیرۆکی کوردی

ئەوی راستی بێت کتێبەکەی (حسێن عارف) (چیرۆکی هونەریی کــوردی) جگــە لەو بایەخە تایبەتییەی خۆی نرخ و بەهایەکی دیکەی گرتۆتە خۆی ئەویش ئەوەیــە: دەرگەی کۆمەڵێك باس و لێکۆڵینەوەی دیکەی بە دووی خۆیدا خستە سەرپشت. جا ئیدی ئەمەیان ئەنجامی ئەو دەلاقە و نامەییوی را و بۆچوونەکانی نووسەر بێت یــان نوێباوی بابەتەکە بێت کە بۆ یەکەمینجارە کتێبێك دەکەوێتە نێوەنــدی رۆشــنبیری کوردییەوە و یان ئــەو پرســیارانە بێــت کــە تیایــدا خراونەتــەروو و داوای وەڵام لــە کەسانی دی دەکات. (حسێن عارف) لە کتێبەکەیدا دەپرسـێت (داخـۆ پەیـدابوونی چــیرۆکی هونــەریی لــە ئــەدەبی نوێمانــدا هــیچ پەیوەنــدیی هــەبوو بــەو میراتــە فۆلکلۆرییەمانەوە. ئەمجا دەڵێت: ئەوی راستی بێت ئەم باسە لێدوانێکی دووردرێژی دەوێ کە من بۆ ئەم لێکۆڵینەوەیەم بە پێویستم نەزانی..ل١١) جاریٚ با لە سەرەتاوە ئەو راستییە بخەمەڕوو کە زۆرم لامەبەستە و تا ئێستا ئاماژەی بۆ نەکراوە، ئەویش دەستنیشانکردنی یەکەمین چیرۆکی کوردییە لەلایەن (حسێن عــارف) خۆیــەوە. لــە ساڵی ١٩٦٠دا و لە ژمارە (١٠)ی گۆڤاری بلێسەدا (حسێن عارف) لــە وتارێکـدا بەناونیشانی ((چیرۆك و شانۆی کوردی لە نیــو ســەدەی رابــوردوودا) نووســیویەتی: (کۆنترین بەرهەمی ئەم ماوەیەمان کــە دەســگیرمان بــووبیٚ. چــیرۆکێکی درێــژی- جەمیل سائیب-ە کە بە زنجیرە لە رۆژنامەی ژیان و ژیانــەوەدا لــە ســاڵی ١٩٢٥دا بڵاوی کردۆتەوە لەژێر ناوی (لە خەوما). بەڕاستی ئــەو چــیرۆکە ئــەهێنی پێیبلێــی سەرەتا و دەسپێکردنێکی بەهێز و پتەو لە چیرۆکی کوردیدا.) نامەوێت لە بایــەخ و بەهاداری ئەم دەستنیشــانکردنەی (١٨) ســاڵ لەمەوبــەری حســێن بــدوێم. چــونکە گرنگی ئەم کارە بەلای گشت رەخنەگران و ئەدیبانەوە ئاشکرایە، بەڵام ئایا بەر لــەم چــیرۆکە هەوڵــدانی بڵاوکــراوەی دیکــەمان هەیــە یــان نــا؟! بێگومــان کــە باســی سەرەتاکانی چیرۆکی هونــەریی کــرا هەرچــی بەشــێوەی شــیعر دانرابێــت (١) یــان دەمەتەقێی شانۆیی بێت ناچێتە ریزەوە، بەڵام هەر لە رۆژنامەی (ژیانــەوە)دا و لــە

ژماره (١٥)ی ساڵی یەکەم و لە شـوباتی ١٩٢٥دا کورتـە نووسـراوێکی تێدایـە و دەلوێت ناوی چیرۆکیشی لێبنرێت ئەویش بە ناونیشانی (بۆچی جلخـوارم) و کـەریم سەعید ناوێك (٢) نووسیویەتی و بریتییە لە بیر و خولیای کابرایەکی بێکـار و لـە سەرەتاوە بڕیاری ئەوە دەدات کە بە بەرگ و کـاڵاوە وا خـۆی نیشـانبدات سـەر بـە جلخوارە تورکەکانە و ئیدی دەستبکات بـە رووتاندنـەوەی خـەڵکی و بـەکارهێنانی فڕوفێڵی جۆراوجۆر بۆ ئـەو مەبەسـتەی. وەلیّ دوای ئـەوەی بەخۆیـدا دێتـەوە لـەم بڕیارەی پەشـیمان دەبێتـەوە و دان بـەوەدادەنێت ئـەو کـارە لـە رەوشـت جـوانی و مرۆڤایەتییێووە بە دوورە یان ئیدانەیەکی کردارە ناپەسەندەکانی جلخوارەکان دەکات (٣). خستنەڕووی ئەم مەسەلەیە بە هیچ جۆرێـك لـە بایـەخی (لـە خـەوما) کـەم ناکاتەوە، چونکە لە لایەکەوە لە غایلە و ختوورەی کابرایەك تێپەڕناکات و لەلایەکی دیکەوە هەرچەندە (لە خەوما) پاش دوو سێ مانگ دوای ئەم بڵاوکراوەتـەوە. وەلیّ ئەو پشوو درێژییەی تیایدا بەدیدەکرێت دەیسەلّمێنێت کە ماوەیـەکی زۆر لەوەوبـەر ئامـادەکراوە و لەبـەر درێـژی یـان هـەر هۆیـەکی دی، ئـەو دەرفەتـەی نـەبووە بڵاوبکرێتەوە. سەرەڕای ئەوەی ئەمیان لایەنی هونەریی زۆر بایەخداری گرتۆتە خۆی. جا بۆ ئەوەی بەرچاومان روونتر بێت و بتوانین ئەوە دەربخەین کە پێوەندی چیرۆکەکان بە کەلەپووری نەتەوایەتیمانەوە چۆن بووە ئەوا با سـەیری نـاوەرۆك و بابەتـەکانیان بکەین. هەموو دەزانین چیرۆکی (لە خەوما) و (بۆچی خلخـوارم) و (چـۆن بـووم بـە خانەدان) باسی سەردەمێکی دیاریکراو دەکەن و بێزاری لە دەست رژێم و زۆرداری و دواکەوتوویی کۆمەڵ دەردەبڕن، بەڵام چیرۆك و ئەفسانە و داسـتانە میللییـەکانمان و هی زۆربەی نەتەوەکانی دیکەش لە دەور و خولی پاڵەوانبازی و سوارچاکی و دلّداری پاشا و میرەکان و کوڕ و کچەکانیان و کوڕە کەچەلّەکان دەسووڕێنەوە کە چۆن دێو و درنج تێکدەشکێنن و بە سواری ئەسپی باوبۆران بە گژ لەشکری دڕندەکاندا دەچـن و هەرچی (دۆنکیشۆت)ییێك هەیە (بـە دیوەکـەی دیکـەدا) لـە پێنـاوی چـاوی کچـە بچکۆلانەکەی پادشادا دەیکەن. یان ئەوەتا بێستوون دەنەخشـێنن یـان وەك دێوانـە

دەدەنە دەشت و هەرد و بیابان...هتد. ئەمە بەم بارەدا، بە بارێکی دیکەیشدا کە ئەویش سوودوەرگرتنە لە چیرۆکی هونەریی جیهانی بابزانین ئەمەیان چۆن دەکەوێتەوە؟! چیرۆکی هونەریی جیهانیی لەسەر بنکە سێ کوچکەیەکەی (سەرەتا.. لوتکە.. کۆتایی) یان (سەرەتا-گرێ-کردنەوە) دامەزراوە. هەرچەندە سەرەتا هەمیشە لە خزمەتی دروستکردنی گرێ یان بەرەو لووتکە چوندا بووە و شیاویشە و دەشێت سەرەتا لەگەڵ لوتکە (گرێ)دا بکرێنە یەك، وەلێ ئەو بروسکە مەزنەی کە لە کۆتاییدا تیشکدەداتەوە و مچوڕکەی ئارام و بە ئامانجگەیشتن دەداتە خوێنەر بە بنچینەیەکی پتەوی ئەوتۆ دادەنرێت کە تەنانەت هەر چیرۆکێکی هاوچەرخانەش لێی بێبەش بێت نەك هەر ئیفلیجی دەکات، بەڵکو ناچێتە ریزی چیرۆکەوە. کەواتە ئەگەر ئەم بۆچوونانەم لەجێی خۆیدا بن و بۆچوونی پێچەوانەی دی نەبێت لەمەڕ ئەم باسە ئەوا دەتوانین بڵێین:

١- چیرۆکە یەکەمینەکانی کوردی هیچ تانوپۆیەکی بەهێزیان نییە لەگەڵ میراتی نەتەوایەتیماندا تیایدا بیانهۆنێتەوە، جا ئەو میراتە هی خۆمان بێت یان لەگەڵ نەتەوەکانی دیکەی رووی زەمینیشدا بەشدار بین.

٢- لەبەر ئەوەی کۆڵەکەیێکی گرنگی هونەری چیرۆك چ لە (لە خەوما) و چ لە (چۆن بووم بە خانەدان)دا بەدی ناکەین کە ئەویش (زەربە)ی کۆتاییە و بە ئەنجام گەیاندنی کارەساتەکانە، کە ئەم بروسکە و کۆڵەکە بنچینەییە نەبوو مانای ئەوەیە سوودوەرگرتنی چیرۆکی سەرەتایی کوردیمان لە هونەری بێگانە کەم و کورتی هێناوە و ئەوەندە نییە شایانی باس بێت.

٣- ئەم چیرۆکانە هەڵقوولاوی بارودۆخێکی رامیاری نەتەوەکەمان بوون و مرۆڤە هەست ناسك و رۆشنبیرەکان بەدەست ئەو بارە ناهەموارەوە ناڵاندوویانە و لە شێوەی رووداوێکدا بە زمانەکەی خۆییان بێزاریان دەربڕیوە و تۆماریانکردووە.

٤- تەنیا بنچینەیەکی پتەو هەبێت بۆ ئەم هونەرە ئەوا لەو پەخشانانەدایە کە لەوەوبەر لە رۆژنامەکاندا بڵاوکراونەتەوە.

## جیاوازی نێوان یەکەمین چیرۆك و دووەمیان

(حسێن عارف) دەربارەی مەبەستی چیرۆکەکەی (ئەحمەد موختار جاف) دەڵێت: (زۆر بە ئاشکرا و زۆر لە روو مەبەستی رەخنەگرتن و تیروتوانج بووە لە کاربەدەستە دز و بەرتیلخۆرەکان و لەگەڵیاندا بازرگانە چاوچنۆکەکان و دەرەبەگ و ئاغا چاوچنۆکەکان کە ئەمە لە ئەنجامدا رەخنەگرتن و توانج دەبەخشێت لەو رژێمەی دەستگای حوکمی بەدەستەوە بوو..ل ٣٥) هەروەها لە هەمان لاپەڕەدا دەڵێت: ("مەسەلەی وێژدان" بەم بارەدا شەهادەتنامەیەکی گەلێك بایەخداری ئازایەتی و مەردایەتی ئەحمەد موختارە لە گوناهبارکردن و ریسواکردنی رژێمی کۆنەپەرستی گەندەڵی ئەو سەردەمەی خۆی و لایەنگرتنی بەرەی چەوساوەکان و..هتد) ئیدی دوای ئەمە نووسەر لەوە سەرسامە کە ئەحمەد موختار خۆی کاربەدەستێکی ئەو رژێمە بووە. (چ عەجەب لەو چیرۆکەیدا ئەو هێرشە توندوتیژەی بردۆتە سەر..ل ٣٧).

ئەمجا دوو (فەرەزییە) دادەنێت:

١- تۆ بڵێیت نووسەر دژی یەکێك یان چەندانێك نووسیبێتی؟!

٢- یان هەر راستەوخۆ ئەوەی مەبەستبووە کە ئێستا ئێمە-واتە حسێن- لێیتێدەگەین؟! بۆ ساغکردنەوەی پەنا دەباتە بەر دوو نموونەی شیعری (ئەحمەد موختار) خۆی و بە ئاشکرا دەردەکەوێت کە ئەو بۆچوونە قەبانەی حسێن دەیانداتە پاڵ (ئەحمەد موختار) ناڕەوایە و هەرگیز ئەمەی دواییان نە لە چیرۆکەکەیدا و نە لە شیعرەکانیدا مەبەستی رژێم نەبووە و تەنیا بە (چەند کەسێکی تازە پیاکەوتوو) و (بەعزێ مۆزەف) زێتر نییە و پاسەپۆڕتی پەڕینەوەی نادرێتێ تا بگاتە سەر ریسواکردنی رژێم. چونکە پەڕینەوە لە هەندێك دیاردەی ناهەموارەوە بۆ سەرچاوە و دۆزینەوەی سەبەبکاری سەرەکی و تاوانبارکردنی لەبەردەم جەماوەردا لە ئەنجامی هۆش و بیرێکی چەسپاو و هونەر و لێزانینێکی تەواوەوە دێتە ئاراوە. کەچی حسێن دەربارەی چیرۆکەکەی (جەمیل سائیب) دەڵێت کە گوایە (وەك داخ لە دڵێك دژی شێخ مەحموود وەستاوە نەك وەك ئینگلیزخواهێك..ل ١٧).

هەروەها دەڵێت: (دێر بە دێڕی تەرخانە بۆ هێرشبردنە سەر شێخ مـەحموود..ل ١٨ و ١٩) بـەمجۆرەش هـەڵاتنی (جـەمیل سـائیب) لـە سـلێمانییەوە بـۆ کـەرکووك وادەستنیشان دەکات. (ئیدی سا لە دژایەتی شێخەوە بووبێت یا لـە کەمتەرخـەمی و بێلایەنییەوە هەڵاتبێت بۆ کەرکووکی ژێر دەسەڵاتی راستەوخۆی ئینگلیز..هتد ل ١٨) هەرچـییەك دەکـەین نـاتوانین رایـەکی چەسـپاوی (حسـێن)مان لـەم مەسـەلەیەدا دەستبکەوێت. جا بۆیێ دەمەوێت لێرەدا دوو خاڵی سەرەکی دەستنیشان بکەم:

١- چیرۆکی (لە خەوما) تەنیا دژی شێخ مەحمود نەنووسراوە و بـەس بـەڵکو ئـەم چیرۆکە (نەك ئەوەکەی ئەحمـەد موختـار) بەوپـەڕی توندوتیژییـەوە بـەرەنگاری رژێـم دەبێتـەوە و دەسـتەویەخەی دەوەسـتێت و رووت و رەجـاڵ و ریسـوای دەکـات و لـە سەرەچاوەکەیەوە پیایدا دێتە خوارێ بۆ دەستە و دایەرەکان و هەرچی کارێکی نابـەجێ هەیە کە بەرامبەر رەش و رووت و چەوساوە و بێدەسەڵاتەکان بەناوی ئایینـەوە کـراوە هەمووی دەخاتە روو هەروەك (شوکری فەزڵی) شاعیریش لە قەسیدە شاکارەکەیدا شێخ وریا دەکاتەوە کە مەسەلەکە زۆر لە نوێژ و دوعاکردن گەورەترە.

ئیش کە رووی ئێستا لە هەورازە سەرەولێژی نەکەی/ بیری وردیشی ئەوێ هەر بـە دوعا و نوێژی نەکەی. لێرەدا ڕووندەبێتەوە کە بە یەکجاری بیری زانستییانە پشـتگوێ خراوە و وردبینی پووکاوەتەوە یان هەر لە ئەسڵدا نەبووە کار خەریکە لە کار دەترازێت و لەمەش رووناکتر و پوختتر لە دێرێکیتردا داوای لێدەکات کە ئەو مرۆڤە پاکانەی لـە ژێر جەور و ستەمدا بوون، دەبێت بەرامبەریان وەفادار بێت و دڵنەواییان بکـات نـەك ئەوەندەی دی بچەوسێنرێتەوە: حەیفە چاوێ کە جـەفا کۆڵـەووژێ تێدەشـکان تـۆ بـە کلچێوکی وەفا عەینی گەلاوێژی نەکەی. هەروەها شاعیرانی دیکەش لـە دڵسـۆزییەوە ئیدانەی زۆر لایەنی ناتەواو و ناپەسەندی فەرمانڕەواییەکەیان کردووە.

٢- هـەر بەمەشـدا بۆمـان دەردەکـەوێت کـە (جـەمیل سـائیب) نـە لـە (کەمتەرخەمی)ییەوە بووە و نە لە بێلایەنییەوە بووە کە سـلێمانی بەجێهێشـتووە، بـەڵکو بـە هۆشـیارییەکی تـەواوەوە بـەرەی شـێخی بـەرداوە و لەگـەڵ

ئینگلیزخواهەکاندا گیرساوەتەوە کە ئەو سەردەمە زیاتر مانای بـیری زانسـتییانە و دوور لە میسالییەتی دەبەخشی، گەر لای هەموانیش وانەبووبێت ئەوا لای جـەمیـل وابووە و لە چیرۆکەکەشدا ئەم لایەنەی روونکردۆتەوە. سەرەڕای ئەوەی حکوومـەتی بەریتانیا لەو سەردەمەدا هەرگیز ئـارەزوو و خواسـتە رەواکـانی میللـەتی کـوردی پشـتگۆی نەخسـتبوو. جـا ئەگـەر بەسـەرزارەکیش بووبێـت بـە پێچـەوانەی تۆرانییەکانەوە کە تەنانەت بـەرەنگاریی چـەکدارانەی ئـەو مافانـەیان دەکـرد کـە بەهۆی پرۆتۆکـۆل و بەیاننامـە دەوڵەتیەکانـەوە پـێیڕەوا بینرابـوو، بـەڵکو هـەوڵی تواندنەوەی ئێجگـارەکی میللەتەکـەشمانیان دەدا. نامـەوێت لێـرەدا گشـت لایەنـە رامیاری و مێژوویـیـەکان شـی بکەمـەوە، بەخۆشـدا راناپـەڕمووم کـە ئـەمکارەم پێمەیسەر بێت ئەویش لەبەر ئالۆزی و بەیەکداچـوونی کێشـە رامیارییـەکانی ئـەو سەردەمە و (جەمیل سائیب)یش لە چیرۆکەکەیدا و لەو بەشەدا کـە لـە دیوەخـانی شێخدا کارەسات دێت و دەڕوات زۆر لایەنی ئەو بارودۆخە رووناکی دەکەوێتە سەر. بە ئاشکراش باسی خۆشباوەڕی شـێخ مـەحموودمان بـۆ دەکـات چ بەرامبـەر ئـەو کوردانەی رەفزی هەردوولا دەکەن و چ بەرامبەر هەردوولا (ئینگلیز و تورك)، بـەڵام گشت گێرمە و کێشەکان و بـارە رامیارییەکـە لـە شـێوەی بازنەییەکـدا بـەدەوری چەقبەستنە ئایینییەکـەدا دەسـووڕێنەوە. ئـەم راوبۆچـوونانە نـاتوانن نکـۆڵی لـەو راستییە بکەن کە دڵسۆزی و گیانبازی شێخ مەحموود - بە هەر نرخێك بـووە - لـە پێناوی ئاسوودەگی میللەتەکەیـدا بـووە، گەرچـی بـۆ یەکـەمین جـاریش ئینگلیـز کردوێتییەوە بە فەرمانڕەوای ولاتی سلێمانی و دوای ماوەیەك رەفزی ئەوەی کردووە کە (بەدەستی مووەدەعییەکەی خۆی تاجی شاهانەی لەسەر بنرێت) چ جـای "بـاجی رەحمەکانیش (بێقەزابن) نەیاندەهێشت رێك هەڵپەڕن"، ئەمە لەلایـەك و لەلایـەکی دیکـەوە دەبـوایێ (جـەمیل سـائیب) بـە گیـانێکی دیکـەی پێشـکەوتنخوازییەوە تەعبیری لە کێشەکە بکردایە چونکە ئەو وەك رۆشنبیرێکی ئـەو سـەردەمە ناچـێتە عەقڵەوە کە بانگ و سەدای شۆڕشـی ئۆکتـۆبری مـەزن و بـیروڕای شۆڕشـگێڕانەی

نەبیستبێت کە تا دەهات زیاتر تەشەنەی دەکرد. هەروەك (مێجەر. ئی. بی. سۆن) لە ١١ی شوباتی ١٩٢٠دا بە بێزارییەوە باسی سلێمانی دەکات و دەڵێت: (بۆ بەدبەختی ئێستا ناوی بەلشەوی و بەشێکیش لە ماناکەی لێرەدا زانراوە..) (ماجد عبدالرضا، القضية الكردية، ل ٦٧) لە کتێبی (کردستان و الحركة العراقية الكردية، صلاح الدين محمد سعدالله)ی وەرگرتووە. کەواتە کاتێك (جەمیل سائیب) بەرەنگاری رژێم و دەستە و دایەرەکەی دەبێتەوە تەنیا لە روانگەی ئینگلیزخوازییەوەیە نەك نیشتمانپەروەری و دڵسۆزی. ئەمەش بە تەواوی بۆچوونەکەی رەتدەکاتەوە کە بۆ ((کەمتەرخەمی)) و ((بێلایەنی)) دەگێڕێتەوە. ئەم روونکردنەوەیەم مەبەست بوو بۆیێ وا کەمێك بە درێژی باسمکرد. جا بۆ ئەوەی جەمسەری باسەکەمان لێ ون نەبێت وا بە کورتی جیاوازی هەردوو چیرۆکەکە لەم خاڵانەدا کۆدەکەمەوە:

**١- رووبەڕووبوونەوەی رژێم:**

وەك روونمانکردەوە چیرۆکی (لە خەوما) یەکسەر دەست بۆ رژێم و رادەی بەربادییەکەی رادەکێشێت و روونیدەکاتەوە: ئاو لە سەرچاوەوە لێڵە، گشت سووچ و گوناهێك لەوێوە دەستپێدەکات و بەناویاندا بڵاودەبێتەوە.

بەڵام (مەسەلەی وێژدان) لە خەڵکە ساویلکەکەوە دەستپێدەکات و بە چەند مووچەخۆرێکەوە دەگیرسێتەوە و ئیدی ڤیزەی ئەوەی پێنییە بگاتە رژێم، کە بەم بارەیاندا پێش چاوخستنی هەندێك ناتەواوی و کەموکوڕی کۆمەڵایەتی و نەبەستنەوەی بەجۆری رژێمەوە و دەستنیشان نەکردنی سەری گلۆڵەکە جۆرە ساویلکەییەك لە بیروڕا و رادەی رۆشنبیری نووسەرەکەی دەردەخات. سەیر دەکەین لە ((مەسەلەی وێژدان))دا چەند جارێك مەئموور و لێپرسراوی میری بۆ تەحقیقات دێن و هاتنەکەشیان بە نهێنییە، وەك لە لاپەڕە ٣٩دا روونیدەکاتەوە نە بە پارە و نە بەدەعوەت ئیقناع ناکرێن و تەحقیقاتی زۆر بەشیددەتیان لەگەڵدا دەکەن، کەچی لە (لە خەوما)دا هیچ جۆرە داکۆکیکردنێکی لەسەر رژێم تێدا نییە.

**٢- مەوزوعییەت:**

لە چیرۆکی (لەخەوما)دا جۆرە مەوزوعییەتێك دەبینین میللەت. هەمووی پیاو خراپ نەکراوە. هەر لە پالەوانە سەرەکییەکەوە دەوری هێزی خێر دەبینن تا بەکاروانچییەکانی ئاوەڵی دەگات و تەنانەت لە دیوەخانی شێخیشدا یەکێك لەوانە ئامادەن لە سەرەتاوە بێدەنگ و بێ چرکە بووە و کە ئەو هەمووە ناهەقییە دەبینێت دێتە زمان و دەڵێت: (ئەم خەڵقانە کەوا ئێستا سەر و ماڵ و ژیانتان حەڵاڵکردن ئەمانە ئەگەر بێتو خۆیان لێرە مەوجوود بوونایە و مودافەعەیەکی شەرعی خۆیان بکردایە دیسانەوە ئێوە لەسەر ئەم قەول و فتوایە ئەمان یا نا؟ ل ٥٥).

ئەمە سەرەڕای ئەو گفتوگۆ بەجێیانەی لە سەرتاپای چیرۆکەکەدا دەکرێن، بەڵام لەوەکەی (ئەحمەد موختار)دا هەرچی مەوزوعییەت هەیە نامێنێت و هەرچی بەردەست دەکەوێت هەر پیاو خراپ و بێویژدان و دز و ساختەچین: هەر لە خزمەکانی زۆرابی پالەوانی چیرۆکەکەوە تا بە بازرگانەکان و ژنەکانیان و هەموو جووتیارەکان و نوێژکەرەکان و ئاغا و سەرکار و مووچەخۆر و تا بە زۆراب خۆشی دەگات. بڕوانە: (وەستای دوکاندار غەل و غەشێکی زۆر ئەکات، ل ١٤).

(دیقەتمکرد وەستا ژن بە دەرەجەیەك حوکمی بەسەر وەستامدا هەیە فەوقی تەسەور ناکری، ل ١٦).

(لەبەر ئەمە کە سەروەتی کەم و مەسرەفی زۆر بوو، فەقیرە مەجبوور بوو سبەینێ کە ئەچوو بۆ دوکان ساختەکاری و بێویژدانی ئەکرد، ل ١٦).

(هیچ وەختێ نوێژ و ڕۆژووی نەدەفەوتاند و هەمیشە مەشغوڵی وێرد خوێندن بوو، ئەمما ئەو گەزەی کە کوتاڵی پێ ئەفرۆشت لە گەزی خەڵکی کورتتر بوو، هتد ل ١٩).

(هەموو فەلاحەکان بە شەو دەستیانکرد بە دزینەوەی گەنم و جۆ، ل ٢١).

(تەنیا من نەبێت هەموو دراوسێکان بە قەدەر ئارەزوو لەو خەمانەیان دزی، ل ٢١)

(ئەمجا دەست لە من و قوەت لە خوا دەستمکرد بە ئەهالی ڕووتاندنەوە، ل ٣٧).

بە دەیان نموونەی دیکەی بەرتیلدان و وەرگرتن و ساختەکاری.

## ٣- باوەڕپێهێنان (قەناعەتپێکردنی خوێنەر):

هەرچەند ئەوەی (جەمیل سـائیب) بـەناوی خەونـەوە دەگێڕێتـەوە، وەلێ هـەرگیز خوێنەر هەست بەوە ناکات کە شتێکی هەڵبەستراوە. ئەم لایەنەش پێوەنـدی بـەڕادەی هونەریی و ڕۆشنبیریی نووسەرەوە هەیە، کە توانیوێتی قەناعەت بە خوێنـەران پەیـدا بکات و بەجۆرێك بکەوێتەوە کـە سـەرتاپای چـیرۆکەکە ڕووداوێکـی ڕاسـتەقینەیە و هەروەها ئەوەش بسەڵمێنێت کە لە ناونیشانەکەی زیـاتر هیچـی دیکـەی تێـدا نییـە پەیوەندی بە خەوبینینەوە بێت. هەروەك لە لاپـەڕە ٥٧دا دەڵێـت: (مـن لـە کـوێم؟! ئەمە خەوە یان نا؟! بۆیێ هەردوو چاوی خۆمم هەڵگلۆفت و وتم بـەڵکو ئەگـەر خـەوە خەبەرم بێتەوە، کەچی ڕوانیم هەموو شتێك هەر لە جێگەی خۆیەتی).

بە پێچەوانەی بۆچوونەکەی (حسێن)ەوە کە دەڵێت:

(نواندنی کارەسات و ڕووداوەکانی چیرۆکەکە لە چوارچێوەی خەوێکـدا، ئەگەرچـی جۆری باسەکە سەپاندووێتی، بەڵام لە ڕووی هونەرییەوە یاریدەیەکی باشـی نووسـەری داوە کە بەر بۆ خەیاڵی هونەرمەندانەی بەرەڵڵا بکات و هەرچی مەبەستە بە بیـانووی گوایە خەوبینینەوە بێسڵەمێنەوە دەریببڕێت، جگە لەوەی ڕێگەی پێـداوە. ئەگـەر لـە هەندێك شوێندا لە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکە زیاتر بڕوا و شـوولی لێهەڵکێشـێت لێـی نەگیرێت..هتد، ل ٢٤).

(حسێن عارف) لێـرەدا مەبەسـتی ئەوەیـە کـە بـەبێ قەناعـەت و ڕێخۆشـکردن (جەمیل سائیب) پاڵەوانەکەی گەیاندۆتە ئەو ژوورەی بەسـەر هـەموو کارەسـاتەکاندا دەڕوانێت. بەڵام ڕایەکی لەم جۆرە کاتێك دەردەبڕێت کە ئەو زرووفە مەوزووعییانە لـە چیرۆکەکەدا نەخوڵقێنرابوونایە. سەیر دەکەین شپرزەیی و بەرەڵڵایی و هەڵپـە هـەڵپی کەسانی نێو چیرۆکەکە خۆی بە ئاسـانی ئـەم جێگـە سـتراتیژییەی بـۆ ڕەخسـاندووە. سەرەڕای ئەمەش چی تێدایە ئەگەر گشت نهێنییەکانیش پێبزانێت، چـونکە ئـەنجامی هەر کوشتنە وەك ئەوانەی لەسەر جادەکان لە سێدارە دەدران و تاوانەکەشـیان هـەمان تاوانی ئەم بووە. هەروەها لە سەرجەم مەجرای ڕووداوەکاندا شتی دروستکراو و بە زۆر

پێوەلکێنراوی وا بەدیناکەین کە ئەقڵ نەیبڕێت. کەچی (حسێن عـارف) هـەروەها (د. ئیحسـان فوئـادیش، ل ٧ی مەسـەلەی ویـژدان) باسـی نامـاقوولێتی کارەسـات و گفتوگۆکانی چیرۆکی (مەسەلەی ویژدان)یان نـەکردووە. سـەیر دەکـەیت (زۆراب) بـە تۆمەتی خیانەتکردن لە خەڵکی لە وەزیفە دەرکـراوە، کەچـی بـە کفلـەکونێك لـەنێو خەڵکیدا و لای میریش دەبێتە سیاسەتمەدارێکی مەشهوور، ل ٤١.

زۆرابە فەنی لەکاتی سکالانامە نووسیدا، لە جیاتی ئەوەی داکۆکی لـە هـەژاران بکات و مەغدورییەتیان لەسەر هەڵگرێت بە هەڵە زیاتر مەغدوریان دەکـات. کەچـی ئەم بە بیانووی ئەوەی خەتی رەئیس دایـەرە ناخۆشـە و گوایـە خـەتی زۆراب خۆشـە باسەکە بەو بارەدا دەگۆڕێت، ل ٢٨ و ٢٩.

لێرەدا هەرچی مـەنتیقی هەیـە کـە لایـدەخات و چ حسـێن و چ د. ئیحسـانیش هەوڵیانداوە ئەوە بسەڵمێنن کە تاوانی (زۆراب) خەتخۆشییە و هەرچی بەسەردێت لەبەر خەتخۆشییەکەیەتی. کەچی گوایە تاوانی دەست و خەت ناخۆشیان داوەتە پـاڵی، بـەڵام لە سەرجەمی چیرۆکەکەدا تاوانی وامان بەرچاو ناکـەوێت و تـەنیا لەلایـەن سـەرۆکی دایەرەکەوە توانجێکی تـێگیراوە، سـەرەڕای ئـەوەی نـازانین ئـەم (زۆراب)ەی (ئەحمـەد موختار) لە کوێوە وا خەتی خۆشبوو؟! هەروەها جـۆرە گوفتارێـك لەلایـەن (ئەحمـەد موختار)ەوە دراوە بە بەگزادەیەك کە هەرگیزاو هەرگیز لـەژێر دارکاریکردنیشـدا بـەو جۆرە نادوێت:

(من پیاوی خۆم ئەناسم.. دزی لە من ناکەن. ئەمانە هەر ئەو پیاوانەن کە تا ئێستا دە کەسیان بەبێ قەباحەت هەر لەبەر ئارەزووی من بۆیان کوشتووم و سەد کاروانیان بـۆ رووتکردوومەوە و ئەم موڵکانەی کە من هەمـە لـە سـایەی چـوار پێـنج پیـاوی وەکـو ئەمانەوەن. ل ٢٢ مەسەلەی ویژدان) ئەمانە هەرچـەندە لـە راسـتیدا و بـە کـردەوە لـە بەگزادە و خانەدانەکان دەوەشێنەوە و پیشەیانە، وەلێ بە دەمی خۆیان ئاشکرای ناکەن و ئاوا لەبەرچاوی خەڵکی خۆیان ریسوا ناکەن. بەڵکو هـەردەم دیـوی دووەمـی قەوانەکـە لێدەدەن و باسی میهر و پیاوچاکی خۆیـان دەکـەن و ئەگـەر نووسـەر سـاویلکە نـەبێت

دایەلۆگی وا بەکار ناهێنێت و ئەم راستییانە بەشێوەی گێڕانەوە (سەرد) یان بـە کـردەوە دەخرێنە روو. ئەوە دایـەلۆگی بەگزادەیـەك بـوو. بـابزانین (ئەحمـەد موختـار) چ جـۆرە دایەلۆگێ (ئاخاوتنێ)کیشی داوە بەو دوو منداڵەی لە کۆڵانێکدا یاریدەکەن:

لە لاپەڕەکانی ٥٣ و ٥٤ و ٥٥دا سەیردەکەین ئەو دوو منداڵە باسی خودا دەکـەن یەکێکیان بە مەبەستەوە دەڵێت زۆرابـە فـەنی خودایـە، چـونکە هـەموو ئـەمرێکی رەتکردنەوەی نییە. ئەمجا باسی یاسا دەکەن و دەڵێن لەبـەر ئـەوەی یاسـا بـە زمـانی خۆمان نەنووسراوە ئەوا ناتوانین داوای مافی رەوای خۆمان بکـەین. بـەمجۆرە دەگەنـە ئەوەی بڵێن ئەمسالی زۆرابە فەنی لە وڵاتانی پێشکەوتوودا بە حەماڵیشـی رانـاگرن. بەمەشـەوە راناوەسـتن و دێنـە سـەر باسـی پاشـەڕۆژی میللـەت و باسـی ئـەو رۆژە چاوەڕوانکراوە دەکەن هەقیقەتی تێـدا دەچەسـپێت و میللـەت بێـدار دەبێتـەوە و لـە رێگەی فیکر و باوەڕەوە رێگەی رزگـاری دەدۆزنـەوە. جـا ئەگـەر منـداڵی کۆڵانـانی میللەتەکـەمان هـەر لـە سـاڵانی بیسـتەکانەوە بـەمجۆرە لایـەنی رامیـاری و بـاری کۆمەڵایـەتی و فیکـری و فەلسـەفییان شـیبکردایەتەوە و رێگـەی رزگاریشـیان بدۆزییایەتەوە باکمان چیبوو؟! ئەوەتا لێرەدا بـە تـەواوی عونسـوری قەناعـەتپێکردن نامێنیت و زیاتر بەلای زۆرکاری و دەستکرددا دەکەوێتەوە. ئـەوە باسـی وەرچـەرخانە کتوپڕییەکەی زۆراب هەر ناکەم کە چۆن بەبێ رووداني کارەساتێکی گرینگ لەوپـەڕی هەست و سۆز ناسکی و پیاوچاکی و پاکییەوە یەکسـەر بـۆ نێـو جەرگـەی زەلکـاوی ناپاکی و ساختەگەری دەخزێ. نموونەی دی بۆ لاوازی مەنتیق و بێمانـایی رووداوەکـان هێجگـار زۆرە و دەبـوایێ لەلایـەن (د. ئیحسـان) و (حسـێن عـارف)ەوە پشـتگوێ نەخرانایە.

**٤- کات (زەمەن):**

ئەوەی جێی رەزامەندی گشت لایەکە و لە چیرۆکی (لـە خـەومادا) حیسـابێکی هونەریی بەرزی بۆ دەکرێت مەسـەلەی (کـات)ە. سـەیر دەکـەین مـاوەی رووداني سەرجەم کارەساتەکان لـە دوو سـێ رۆژدا کۆدەبنـەوە و دەتوانرێـت بـە ماوەیـەکی

(زەمەنێکی) نموونەیی لە قەڵەم بدرێت. بە نیسبەت کورتە رۆمانێك یان چیرۆکێکی (درێژ)ی لەم بابەتە بە پێچەوانەی (مەسەلەی ویژدان)ەوە نزیکەی سی چل ساڵ دەخایەنێت و لە رۆژی لەدایکبوونی پاڵەوانەکەوە دەستپێدەکات.. (ویلادەتم لە قەزای-هـ- بوو.. ل ١٣).

تا دەگاتە پایەییەکی بەرز لە وەزیفەدا. لەم حاڵەتەدا زیاتر بە باری (ژیاننامە)دا دەکەوێتەوە تا چیرۆك. لە کاتێکدا هەردوو چیرۆکەکە وەك لاپەڕە بە قەدەریەکن (نزیکەی ٤٦ لاپەڕەن).

## ٥- ناونانی کەسێتییەکان (پاڵەوانان):

چیرۆکی (لە خەوما) ناوی هیچ پاڵەوانێکی تێدا نییە، بەڵام لە (مەسەلەی ویژدان)دا ناوی تاقە پاڵەوانێك براوە ئەویش (زۆراب)ە. ئەم ناونانە لە لایەنی هونەرییەوە بەکارێکی بایەخدار دادەنرێت. لەگەڵ ئەمەشدا هەروەك چۆن حیسابی هونەریی بۆ ناونانی پاڵەوان دەکەین، هەروەها ناونەنانیش هەندێك لایەنی تایبەتی هونەریی دەگرێتە خۆی و جۆرە شموولییەتێك بە بەرهەم و ناوەرۆکەکەی دەبەخشێت. هەرچەندە بێگومانیشم (جەمیل سائیب) لەناو نەهێناندا ئەمەی مەبەست نەبووە و تەنیا ویستوویەتی لەژێر پەردەوە کەسانی چیرۆکەکەی بخاتەڕوو. هەروەها بێگومانیشم ناوهێنانی (زۆراب)یش لای (ئەحمەد موختار) لە حیسابە هونەرییەکە تەوەللایە و بە مەبەستەوە دانەنراوە. ئەمجا لەگەڵ ئەوەشدا جەمیل ناوی کەسی نەهێناوە. وەلێ بە رەنگ و رووخسار و کردەوە و گوفتاری کەسانی چیرۆکەکەیدا زۆربەیان دەناسینەوە و ناوەکانیان دەزانین و لەمەشیاندا دەتوانین چیرۆکەکە بخەینە تەك شیعرێکی شاعیری نیشتمانپەروەری کورد (ئەحمەد حەمدی بەگی ساحێبقڕان) لای ئەمیش ناوی کەس نەبراوە، بەڵام بە سیفەت و رەوشتەکانیاندا باش دەناسرێنەوە ئەمەش نموونەیەکە لە شیعرەکە:

لازمە بۆ مەجلیسی لەقلەق بنێرن تاقمێ
دەم دڕاو و تێر نەخۆر و هیچ نەدیو و زەهردار

بۆ ئەمە جارێ سەقاقوش بانگ بکەن ئینجا بڵێن
ئۆتۆمبێل حازرە.. مێرووله بێتو توولەمار..

(ل ٩٣ دیوانی حەمدی)

**٦- کۆتایی:**

(حسێن عارف) دەربارەی (لە خەوما) و کۆتایی پێهێنانی دەڵێت: (دەیتوانی بە تەنها رستەیەك یان بە یەك دوو دێڕ کۆتایی پێبهێنایە وەك ئەوەی بینووسیایە بەدەم هاوار و داد و بێدادکردنەوە لە خەوە سامناکەکەم راچەنیم و حەمد و سەنای خوام کرد کە ئەوەی ئەمدی خەوبوو یان دەیتوانی بدا بە دەمییەوە..هتد، ل ٢٢و ٢٣) بەر لە حسێن، (جەمال بابان)یش رایەکی وای لەمەڕ کۆتایی چیرۆکەکە دەربڕیوە و دەڵێت: (بەداخەوە چیرۆکەکە تەواو نەبووە، واتە ئەبوایە لە خەوەکەی خەبەری ببوایەوە.. ل٧٤ی لە خەوما).

هەرچەندە وەك هونەری چیرۆکی ئەو سەردەمە ئەمجۆرە قفڵانە بەکارێکی پەسەند دادەنرا، بەڵام وەك لەمەوبەر روونمانکردەوە: چیرۆکنووس مەبەستی ئەوە نەبووە بە خەڵکی بڵێت: با بە ئەم هەموو بگرە و بەردەیە خەون بووە و حەمد و سەنای خواش بۆ ئەوە بکات کە رزگاری بووە، بەڵکو ویستوویێتی بیسەلمێنێت هەقیقەتێکی روودراو بووە، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا وەك (جەمال بابان) دەڵێت: (مەبەستی تەواوەتی داوە بەدەستەوە.. ل ٧٤ی لە خەوما).

بۆ چیرۆکەکەی (ئەحمەد موختار)یش.. حسێن دوو پێشبینی بۆ کۆتاییەکەی دەکات گەر تەوای بکردایە:

١- (زۆرابە فەنی دوای ئەو هەموو راو و رووت و دزی و پیاو خراپییەش کردوویێتی بابداتەوە و بگەڕێتەوە سەر رێگەی کردار و بیروباوەڕە نموونەییەکەی رۆژانی لاوی خۆی.. ل ٣٤).

٢- (یا بە پێچەوانەوە هەر لەسەر ئەو ناپاکییەی بەردەوامبێ.. ل ٣٤).

ئەگەر حسێن بە وردی لە هەردوو ناونیشانی چیرۆکەکەی (ئەحمەد موختار)ی بکۆڵیایەتەوە تێدەگەیشت مومکین نییە چیرۆکنووس زۆرابی بەباری پیاوچاکیدا

بخستایەتەوە، چونکە ناونیشانی (مەسـەلەی ویـژدان) ناونیشـانێکی کراوەیـە و هـیچ پێداگرتنێکی تێدا نییە دەربارەی سەرکەوتنی ویژدان بەسەر بێویژدانیدا، بەڵکو زیـاتر وادەکەوێتەوە هەردەم وێژدان پێشێل بووە. ئینجا ناونیشـانەکەی دی (چـۆن بـووم بـە خانەدان) رێگەی گشت تەوەقوع و پەلهاوێشتنێکی خەیاڵی کۆڵەرەوان بەربەست دەکات و تەنیا ئەوەندە دەهێڵێتەوە (زۆراب) دەبێـت بـە (خانـەدان) و لـەم حاڵەتەشـدا گـەر بەدەمیشییەوە بدایە بریتی دەبـوو لـە شـوول لێهەڵکێشـانی زۆراب لـە بێویـژدانی و بێمروەتیدا تا رەقەمی قیاسی لە (خانەدانیدا) پیاوخراپی و بەدکاریدا لێدەدا.

دەربارەی ئەم دوو چیرۆکە دەتوانین بڵێین: لەبـەر ئـەوەی (لـە خـەوما) گەیشـتۆتە لوتکەی کارەساتەکان و هیچ داد و بێدادێك بە فریای پاڵەوانە سەرەکییەکەی ناکەوێت دەتوانرا لەو لوتکەیەوە بە چەند رسـتەیەك گرێبـدرێت و ئـەنجامی پاڵەوانەکـەش وەك ئەوانە بێت لەسەر جاسووسی گیراون و پەتی سێدارەی لەبەرچاودا بێـت و بچـێت یـان (هەرچەندە چیرۆکەکەش بە زمانی قسەکەرەوە نووسراوە) لەژێر دارکاریدا بکوژرێت یان ئەوەتا لەبەر ئەوەی فەرمانڕەوایی شێخ ماوەیەکی زۆر کورتی خایانـد و دوو جـار لـە بـاڵی درا دەتـوانرا بـەهۆی هێرشـێکی بێگانـەوە چـیرۆکەکە کۆتـایی پێبهێنرایـە و پاڵەوانەکە رزگاری ببوایێ (چیرۆکنووس ئەمـەیانی ئـاوات بـوو) نـەك وەك حسـێن و جەمال بابان: لە خەوەکەی خەبەری ببوایەوە. دەربارەی (چـۆن بـووم بـە خانـەدان)یش لەبەر ئەوەی لە هەڵچوون و داچوون و تاسەکردنێکی ئەوتۆدایە بە هیچ جۆرێك لەم ٤٦ لاپەڕەیەدا ناگاتە لوتکە. کەواتە ناتوانرێت کۆتاییەکی بروسکە ئاسایی و چەسپاوی بۆ دابنرێت و دەبێت هەر لەسەر ئەو سەمتەی خۆی کە بـە (حیکایـەتی مـێش) دەچـێت بەردەوام بێت. ئاوەهاش بەدەمەوەدانێکی زۆری دیکـەی دەویسـت تـا بگاتـە ئـەوەی ئەنجامێکی پڕاوپڕ و بەپێی پێویستی بۆ بدۆزێتەوە.

**مایسی ١٩٧٨**

## پەراوێزەکان

١- بەڕای من (مەم و زین)ی ئەحمەدی خانی نەمرمان با بە شیعریش هۆنرابێتەوە هەر بە یەکەمین شاکاری ڕۆمانی کوردیمانی دەزانم.

٢- جێی داخە ئەو کاتەی ئەم باسەم نووسی نەمزانی (کەریم سەعید) مامۆستای پایەبەرزمان (کەریم سەعید زانستییە) و دوای بڵاوبوونەوەی باسەکەم لە ژمارە ٦٩ی ئابی ١٩٧٨ی گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێدا درکم پێکرد و داوای بەخشین لە جۆری ناوهێنانەکەی دەکەم.

==================================================

(*) ئەم نووسینە لە کتێبی: ئەندێشە جوانەکانی ڕۆح لە چیرۆکی هونەری کوردیدا، لە نووسینی: ڕەوف حەسەن (هەولێر: بەڕێوەبەرایەتی چاپخانەی ڕۆشنبیری، ٢٠٠٥) دا بڵاوکراوەتەوە.

# سەرەتای لەدایك بوونی چیرۆكی هونەریی كوردی

مستەفا سالّح كەریم

**(گەڕانەوەیەك بۆ حیكایەتی كوردی)**

لە تەك برادەرێكدا دەربارەی چیرۆك و حیكایەت مشتومڕیان بوو، ئەو سوور بوو لەسەر ئەوەی كە چیرۆكیش هەر حیكایەتە، دەشێ سەرزاری ئەمە وابێ، بەڵام لە رووی هونەرییەوە جیاوازییەكی ئاشكرایان هەیە، حیكایەت لە خۆیدا ساكار و بێ گرێ و رەوانە، چەندین پیاوی نەخوێندەوار بە توانایدا بووە لەبەری بكات و بۆ خەڵكی بگێڕێتەوە، بەڵام چیرۆك، وەك بابەتە هونەرییە شارستانییەكە لای گەلی كورد شتێكی نوێیە، لە هەمان كاتیشدا ئەبێ ئەوە بڵێین: ئەگەر كارتێكردنە ئەوروپاییەكەی لێ دوور بكەینەوە، لە شێوە ساكارەكەیدا دەیگێڕینەوە بۆ بنەما كوردییە رەسەنەكەی. ئەوەندەی ئێمە پێی بزانین حیكایەت لە كۆمەڵگای كوردەواریدا هەر لە زۆر كۆنەوە پشتاوپشت باو بووە و گوێگری تایبەتی خۆی هەبووە، چەندین كەس بە حیكایەت خوان ناویان دەركردووە و كۆڕی شەوانی زستانیان پێ گەرم و گوڕ كردووە، بەو شێوەیەی خۆیان بیستوویانە ئەو حیكایەتە نەنووسراوانەیان (لەبەر) بۆ خەڵكی گێڕاوەتەوە.

ئەمە جگە لەوەی زۆربەی خەڵكی ئەوەیان دێتە بیر لە تەمەنی منالّیاندا حیكایەتی (بزن و مەڕ) و (تیتیلە و بیبیلە) و (شەو لەبان) و تاد... دوایان لە دایك و نەنك و ئافرەتە بەساڵاچووەكان بیستووە و چێژیان لێوەرگرتووە.

لەبیرمە لە گەڕەکەکەمانا پیاوێك هەبوو ناوی حاجی نەجمەددین بوو خوالێیخۆشبێ گەنجینەیەك بوو بۆ حیکایەتی خۆماڵی، چەندان جارم دێتەوە یاد کە شەوانی هەینی دەر و دراوسێ لە ماڵی ئێمە کۆ دەبوونەوە، بەدەم چاخواردنەوە و شەوچەرەی زستان- مێوژە سوورکە و کاکڵە گوێز و باسووق و هەنجیرە وشکەوە، مام حاجی بە شێوازێکی رەوان و زمانێکی پاراوەوە دەستی بە گێڕانەوەی حیکایەتە تەڕ و بڕ و بەتامەکەی دەکرد، کەسێ ورتەی لێوە نەدەهات، بە منالّ و گەورەوە گوێمان لێدەگرت.

هەرچەندە ئەم حیکایەتانە لە شێوەی ئەفسانەدا بوون، بەڵام ئەمانە لەناو هەموو میللەتانی جیهاندا هەن، لەو وەسفانەی لە بیرم ماون کە حاجی لە زۆربەی حیکایەتەکانیدا دووبارەی دەکردنەوە: ((کچ چی؟ نەبکەی، نە بخۆی تەماشای سای گەردنی کەی!))، ((مێوژە رەشەکەی بخواردایە لە گەردەنییەوە دیاربوو))، ((هێندە ناسك بوو پەلەپیتکەت لە روومەتی بدایە یەکسەر خوێنی لێ دەهات))، ((کوڕە لاو ئەمەندە شۆخ بوو خوشکی خۆی حەیرانی دەبوو)) کە باسی دەعبا و شتە ترسناکەکانیشی دەکرد دەیگوت:

((دەڵە دێوێك لە بەردەمی ئەشکەوتەکەدا بوو مەمکێکی داخستبوو یەکێکی بە خۆیا دابوو)) دیارە ئەمەش بۆ ئەوەیە لایەنی شەڕ بە خراپ و دزێو بێتە پێش چاو. بەشی زۆری ئەم حیکایەتە سەرزارییانە ناوەرۆکەکانیان بریتی بوون لە تێکۆشان بۆ ئاواتێك، زاڵ بوون بەسەر کۆسپ و تەگەرەدا، ئازاری ئەڤین و دوو دڵ لێك کردن، کێشە لە نێوان خێر و شەڕدا، دەوری دەست و پێوەند و چڵکاوخۆر لە خراپەکاریدا، بازهەڵدان بۆ هەڵبژاردنی فەرمانڕەوا...تاد.

لەمانەدا دەردەکەوێ کە میللەتی کورد حەزی لە فیداکاری کردووە لە پێناوی ئامانجەکانیدا، لە بازهەڵدانا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە هەڵبژاردن خواست و ئارەزوویان بووە، واتە بەشی زۆری ئەم جۆرە حیکایەتانە کێشە بووە لە نێوان زۆردار و زۆرلێکراودا ((قارەمانەکانیشیان مرۆڤن و بەزۆریش لە هەژارانن، لە ئەنجاما سەری ئەژدەهاك و دێو و درنج پان دەکەنەوە))[1].

ئەم حیکایەتانە وەك وتمان لەناو کوردەواریدا رەنگێکی زۆر کۆن و پتەویان هەیـە، جا کە توێژەرەوەکانمان دێنە سەر باسی سـەرهەڵدانی چـیرۆکی کـوردی و دەڵـێن: ئـەم هونەرە شارستانییە لای کورد نوێیە و سەرەتاکەی بـۆ ناوەڕاسـتی سـاڵانی بیسـتەکان دەگەڕێتەوە، هەندێ وای بۆدەچن کە ئەمە جۆرە دابڕانێکە لە سامانی نەتـەوەییمان و پشتگوێخستنی ئەو کەلەپوورەیـە کـە کانییـەکی روونـە بـۆ هەڵێنجانـدنی چـەندین کەرەسەی بەپێز، بەڵام راستییەکەی وانییە، چونکە ئاشـکرایە کـە بنـەمای چـیرۆکی کوردی ئەو حیکایەتە میللییانـە بـووە کـە دەمـاودەم بۆمـان ماوەتـەوە، سـەرەڕای داستانی قارەمانێتی نەتەوەکەمان و حیکایەتـە ئەفسـانەییەکانمان کـە گەنجینەیـەکی بەنرخن بۆ ئەوانەی بیانەوێ سوودیان لێوەربگرن و هاوچەرخانە مامەڵـەیان لـە تەکـدا بکەن. هەر لـەم بارەیـەوە چیرۆکنووسـە عەرەبـەکان و لێکۆڵـەرەوەکانیان لـە باسـی سەرهەڵدانی چیرۆکی هونەریی عەرەبیدا پەنجە بۆ ئەو حیکایەتە میللییانە رادەکێشـن کە بەردی بناغەی چـیرۆکی عـەرەبین-پـێش کارتێکردنـە ئەوروپاییەکـە، (مـەحموود تەیموور) باسی چەند سەرچاوەیەك دەکات کە بوونەتە هەوێنی چیرۆکی عەرەبی لەوانە: (الاغانی)، (مجنون لیلی)، (عنترة)، (حی بن یقظان)، (مقامات)، (رسـالة الغفـران)[٢] تاد... بەڵام کە دێنە سەر چیرۆکی هونەریی عەەبی سەرەتاکەی لـەو چیرۆکنووسـانەوە دەستنیشان دەکەن کە توانیویانە بەرگێکی نوێ بە بەر چیرۆکا بکەن، ئەمجا بۆ ئـەوەی رێبازەکە لای ئێمە روونتر بێ، وای بەباش دەزانم-بۆ رێخۆشکردن- پێش ئـەوەی بێمـە سەر مەبەستی باسەکە، با ئاوڕێ لە سەرەتای چیرۆکی هونەریی عەرەبی لـە عێراقـدا بدەینەوە، ئەوساتە سەرهەڵدانی چیرۆکی هونەریی کوردی و جیاکردنەوەی لە حیکایەت بە شتێکی ناڕەوا دانانرێ.

## ((پێداچوونەوەیەك بە سەرەتای چیرۆکی هونەریی عەرەبی لە عێراقدا))

ئەگەر بە وردی لە بنچینە و سەرەتای سەرهەڵدانی چیرۆکی هونەریی عـەرەبی لـە عێراقدا بکۆڵینەوە، بە ئاسـانی بۆمـان دەردەکـەوێ کـە پـێش بـەرپابوونی جـەنگی

یەکەمی جیهانی کاژی حیکایەتی فڕێداوە و پێی ناوەتە قۆناغێکی واوە کە پێی بگوترێ ((چیرۆك)). لە ساڵی ١٩١٠ (رزوق عیسی) و (یوسف رزق الله غنیمە) سەر و چیرۆکی کاڵ و کرچیان لە گۆڤاری (خردلە العلوم)دا بڵاوکردۆتەوە[٣] هەرچەندە ئەمانە بەناوی چیرۆکەوە بڵاوکراونەتەوە، بەڵام لەلایەن توێژەرەکانەوە ئەو بایەخەیان پێنەدراوە، چونکە رێنمایی چیرۆکی هونەریی سەرکەوتوویان تێدا بەدی نەکراوە، بەڵکو وەك سەرەتایەك پەنجەیان بۆ راکێشراوە.

چەند مانگێك بەر لە بڵاوکردنەوەی ئەم دوو چیرۆکە گۆڤاری (تنویر الافکار) لە ١٩١٠/٩/١٩دا چیرۆکێکی لە شێوەی خەوبینیندا بەناونیشانی (خەوێکی عەرەبی) بڵاوکردۆتەوە.[٤] ئەم چیرۆکە ناوی نووسەرەکەی پێوە نییە و ناتەواویشە[٥]، بەڵام بووە سەرتایەك بۆ زنجیرەیە چیرۆکی (خەو) کە بەرەو دوا بڵاوکرانەوە، لەوانە (خەوێکی ئەدەبی)-مەحەمەد فائق گەیلانی[٦]، (گەشتێك لە خەوا)[٧]، (ماڵ خۆی فەرمانڕەوایە)[٨]، (خەوێکی راستەقینە) عطاء ئەمین- (گەشتی بیر) م. ش، (وەستانێك بە دیار دیالەوە)-عراقی ئەمین[٩]، پەیدابوونی ئەم جۆرە چیرۆکانە لە شێوەی خەوبینینا هەروا ئاسایی نەبوو، کاری ئەدیبە دراوسێکانیان لەسەر بووە، ئەگەر هاتوو زانیمان کە دەسەڵاتی عوسمانی کارێکی وایکردبوو کە پەیوەندی و تێکەڵاوی نێوان رۆشنبیرە عێراقییەکان بە رۆشنبیرەکانی تورکیاوە پتەو بێ، ئەوسا ئەوەش روون دەبێتەوە کە پردێ لە نێوانا هەبووە بۆ ئاڵوگۆڕی کەلچەر و رۆشنبیری، لە ساڵی ١٩٠٩دا شاعیری عێراقی بە بنەچە کورد (معروف الرصافی) رۆمانێکی ئەدەبی نووسەری تورکی بەناوبانگ (نامیق کەمال)ی لە تورکییەوە گۆڕییە سەر زمانی عەرەبی و لە بەغدا چاپی کرد و بڵاوبووەوە، لەبەر ئەوەی ئەو کارە ئەدەبییەش ((خەو)) بینین بوو، زۆر بەجێیە کە بڵێین ((کاری کردە سەر نووسەرە عێراقییەکان بۆ نووسینی ئەم جۆرە چیرۆکانە))[١٠].

ئەو نووسەرانەی لەو سەردەمەدا بەدەست گەلێك دەردی کۆمەڵایەتی ئازاردانی نەتەوەییەوە دەتلانەوە، پەنایان دەبردە بەر (خەو)، ئەوەی لە بیر و هۆشیانا بوو

لەگەڵ خەیاڵی ساکاری خۆیانا لـە شـێوەی چـیرۆکا وەك خـەوێك بـۆ خـەڵکیان دەگێڕایەوە، کەواتە جێی خۆیەتی لێرەدا ئێمەش بە سەلماندنەوە ئەو رایە دووبارە دەکەینەوە کە دەڵێ ((وەك راستییەك ساغ بۆتەوە کـە چـۆن چـیرۆك لـە ئـەدەبی عەرەبی عێراقدا لە شێوەی (خەو)دا دەرکـەوتووە و رەگـی داکوتـاوە و چـەندەها تاقیکردنەوەی لەسەر بنیاتنراوە تا گەیشتۆتە ئەم ئاستە پێگەیشـتووەی ئـەمڕۆ، هەر بەو جۆرەش لە ئـەدەبی کوردیـدا سـەری دەرهێنـاوە و رێچـکەی نووسـینی چیرۆکی پێ شکێنراوە))[11].

سەرەڕای ئەم زنجیرە چیرۆکانە چ ئەو ساکارانەی ناومان بردن و چ ئەوانـەی لـە شێوە خەودا لـە سـاڵی (١٩١٠)وە رێچـکەیان بەسـت و بوونـە سـەرەتایەك بـۆ سەرهەڵدانی چیرۆکی هونەری عەرەبیلە عێراقا، دەبینین توێـژەرەوەکان سـەرەتای هونەری چیرۆکی عەرەبی لە عێراقدا دەخەنـە پـاڵ چـیرۆکنووس (محمـود ئەحمـەد السید) و دەڵێن: چیرۆك لە عێراقدا لەسەر دەستی ئەودا رێبازێکی نوێی گرتەبەر و ئارایشێکی هونەریی بە خۆیەوە بینی، هەرچەندە ئەوەش دەزانـن کـە مـەحمود ئەحمەد لە سـاڵی ١٩٢١دا دەسـتی دایـە چیرۆکنووسـین، واتـە (١١) سـاڵ دوای چـیرۆکی خـەوە عەرەبییەکـەی گۆڤـاری (تنـویر الافکـار). لـەم رووەوە دوکتـۆر عەبدالالە احمد لە نامەی ماجستێرەکەیدا دەڵێ: ((محمـود احمـد یەکـەمین کەسـە چیرۆکی کۆمەڵایەتی بە شێوەیەکی ریالیزمانە نووسیوە)) هەروەها دەڵـێ: ((ئـەو سەرەتا زووەی محمود ئەحمەد لە تەك ئەو سەردەمەی نووسەرە پێشەواکانی میسـر وەك مەحمود تەیموور و هاوڕێکانی تێیـدا دەسـتیان بـە چیرۆکنووسـین کـرد یـەك دەگرنەوە)). ئەمجا د. عەبدالالە بە قەناعەتێکی تەواوەوە دەڵێ: ((لێرەوە دەتوانین محمود احمد السید بە یەکێك لەوانە دابنێین کە نەك هەر هاوبەشـە لـە بنیادنـانی چیرۆکی عێراقیدا، بەڵکو لە چیرۆکی عەرەبیشدا))[12].

ئەم سەرنجەی د. عەبدوالالە گەلێ لێکۆڵینەوەی تردا رەنگ ئەداتەوە و پێشـەوایی ئەم هونەرە بە محمود احمد السید دەدەن.

((سید لە چیرۆکەکانیدا پێشەوایەك بوو هەڵیکوتایە سەر ڕێگایـەك کـە لەوەوبـەر ڕێچکەی نەشکێنرابوو، کەسیش لە مەیانا نەبوو یاریدەی بدات و پشـتگیریی بکـات، جگە لە جۆش و ئارەزوومەندیی خۆی کە دەیەویست ئەم هونەرەی شـەیدای بـووە لـە ئەدەبی عێراقیدا جێی خۆی بکاتەوە))[١٣].

دوابەدوای ئەم نووسەرە پێشەوایە، چەندین نووسـەری تـر لـەم بـوارەدا ئەسـپی خۆیان تاودا و هەریەکەیان لە مەیانی چیرۆکی عێراقیـدا هەوڵیانـدا گـۆی هونـەری بەرنەوە، هەندێ لەوانە چالاکانە قۆڵیان لێ هەڵماڵی و دڵسۆزانە ویستیان هەریەکـە خشتێکی تر بخاتە سـەر لادیـواری ئـەم هونـەرە نوێیـە، لەوانـە ئـەنوەر شـائول و عـەبدولوەهاب ئەمین و شـالوم دەروێـش و ذوالنـون ئـەیوب و عـەبدولحـەق فازیـل و یوسف مەتی و جەعفەر خەلیلی و عـەبدولمەجید لـوتفی و تـاد...، ئـەم نووسـەرانە زۆربەیان شەیدای چیرۆك بوون، بۆ گەشەکردنی بە پەرۆش بوون، ٥٤ساڵ پێش ئێستا بۆ پێشخستنی چیرۆك و برەوپێدانی، بیریـان لـە مـزە و پاداشـتکردۆتەوە نـەك بـۆ خۆیان، بەڵکو بۆ هاندانی نووسەرانی تر، ئەوەتا ئەنوەر شائول لـە ژمـارەی (١٥)ی گۆڤاری (الحاصد) کە خۆی خاوەنی بوو، لە تشرینی یەکەمی ١٩٣١دا نووسـیویەتی و دەڵێ: ((بۆ ئەوەی چیرۆکی عێراقی هان بدەین، ئامادەین بەرامبەر هەر چیرۆکێك بڵاوی دەکەینەوە لە سێ تا دە روپیـە بـە خاوەنەکـەی بـدەین)). ئـەمجا هـەر لـەو نووسینەدا دەڵێ: ((ئاسۆیەکی فراوان لەبەردەم چیرۆکی عێراقیدا، ئەوی بیەوێ ئـەم هونەرە پـێش بکـەوێ دەتـوانێ لێـی هـەڵبهێنجێ، بـۆ ئـەم مەبەسـتەش داوا لـە روناکبیرەکانی وڵات دەکەین بە دەنگمانەوە بێن))[١٤].

محمود احمد السید ئەگەرچی وەك ئاشکرایە، یەکەم کەس نەبووە کـە لـە عێراقـدا چیرۆکی نووسیبێ، بەڵام بە سەردەستەی نووسەرانی ئەم هونەرە دەزانرێ چـونکە هـیچ نووسەرێك پێش ئەم ئەو تین و گوڕی بە چیرۆك نەداوە و بەو بیرە نوێیەوە کە ئەو پێـی دەنووسی، نەیاننووسیوە، هـەر بۆیەشـە وەك ئـەم بۆچـوونەی د. عبدالالـە احمـد کـە پێشەوایی چیرۆکی هونەریی لە عێراقا بە محمـود ئەحمـەد دەدا، هـەروەهاش د. علـی

جواد الطاهر دەڵێ: ((لە تەك محمود احمد السیدا چیرۆكنووسی وەها نەبوون بەو مانایەی پێیان بگوترێ (چیرۆكنووس)، واتە لەم حاڵەدا خۆی بە تەنیا -نەوەیەك-بوو)) ئەمجا دەڵێ: ((مەحموود احمد هاوپشتی چیرۆكنووسە میسرییەكانی وەك مەحمود تەیموور و مەحمود طاهر لاشینە))[۱۵].

بەم شێوەیە وەك بۆمان دەركەوت ئەم چیرۆكنووسە-واتە محمود احمد السید- بەتاكە سوارە هاتە مەیدانەوە و رێبازی ریالیزمی گرتە بەر و تەقەلایەكی دڵسۆزانەی بۆ پێش خستنی چیرۆك لە عێراقدا ((ئەم رێبازەشی پێوەندی بە خودی خۆیەوە هەبوو))[۱٦].

كە ئاسۆی بیری روون و كراوەبوو، دەیەویست لە رێگای چیرۆكەوە ئەوی دەیەوێ بیخاتەڕوو، تا بەرە بەرە ئەو چیرۆكە كۆمەلایەتییانەی سەر بە ریالیزمی نوێن لەسەر دەستی نووسەرانی ترا بەرەو ریالیزمی سیاسی-ئەگەرچی ساكاریش بوون-ببەن.



ئەم پێداچوونە كورتە و ئەم گەشتەی بە جیهانی سەرەتای پەیدابوونی چیرۆكی عێراقیدا كردمان، گەلێ شتمان بۆ روون دەكاتەوە سەبارەت بە سەرهەڵدانی چیرۆكی كوردی لە عێراقدا، پاش سەرنجدانێكی ورد خوێنەر بە ئاسانی بۆی دەردەكەوێ كە چیرۆكی كوردی هەروا لە چۆڵەوانیدا بەبێ مامانی لەدایك بووە، بەڵكو كاری دەر و دراوسێی پێوە بووە، بەتایبەتی كە وردبینانە سەیری بارودۆخی ئەو سەردەمە بكەین، بە بەراورد دەگەینە ئەو ئەندامەی، چۆنیەتی ژیانی گەلی عێراق-بە كورد و عەرەبییەوە- بخەینە بەرچاو، بە تایبەتی لە سایەی حوكمی عوسمانلیدا و سەفەربەر و رەش بگیر و تاعوون و رشانەوە و گرانی و لە دواییشدا لەژێر فەرمانڕەوایی ئیمپریالیزمی ئینگلیزی و جەور و ستەمكاریدا، كە بێگومان رووناكبیرانی عەرەب پێی قایل نەبوون و لە ئەنجاما تەقینەوەی شۆڕشی ۱۹۲۰ لوتكەی ئەو بێزارییە دەردەخات، هەروەك لای ئێمەی كوردیش شۆڕشی شێخ مەحموودی نەمر تەعبیری راستەقینەی لە ئاوات و ئامانج و خواستی گەلی كورد كردووە.

## ((سەرەتای چیرۆکی هونەریی کوردی))

دوای ئەوەی کاك (جەمال خەزنەدار) ئەو سێ ژمارەیەی گۆڤـاری (رۆژی کـورد)ی کۆکردەوەو لـە چـاپیدان[١٧] دەرکـەوت کـە نووسـەری کـورد (فوئـاد تـەمۆ)[١٨] لـە ژمارەیەکی ئەو گۆڤارەدا چیرۆکێکی بێ ناونیشانی ناتەواوی بڵاوکردتەوە، لە دواییـدا کاك حاجی جەعفەریش لە گۆڤاری (بەیان)دا ئەو دەقەی راگوێزایە سەر شێوە زمـانی کرمانجی خواروو[١٩]. ئەمە کارێکی وەهای کرد چەند برایـەکی نووسـەر ئـەم چـیرۆکە بکەن بە بەڵگە و بە توندی ئەو رایانە رەتبکەنەوە کـە سـەرەتای چـیرۆکی کوردییـان لەوەوبەر دەستنیشان کردووە و لەسەر ئەوە سووربن کە ئەم چیرۆکەی (فوئاد تەمۆ) بە سەرەتای چیرۆکی کوردی دابنێن.

راستییەکەی ئەو نووسەرە هێژایانەی ئەم رایەیان هەیە چەند خاڵێکی گرنگیان لەم مەسەلەیەدا پشتگوێ خستووە و هەندێ حەقیقەتی ئاشکرایان فەرامۆش کردووە، دەنا بەو جۆرە و بەو خێراییە بنچینەی چیرۆکی کوردییان هەڵنەدەتەکاند، هەروا بۆ نموونە:

١- لە کاتێکدا، ئەگەر ئەوە بسەلمێنرێ کە ئەو نووسینەی (فوئاد تـەمۆ) چـیرۆکە، ئەوا بە سەرەتای چیرۆکی کوردی لە کوردستانی تورکیا دادەنرێ[٢٠] نەك لە عێراقدا.

٢- وەك راستییەك دەبـێ ئـەوەش بڵـێین: هـەموو ئـەو نووسـەرانەی دەربـارەی مێژووی چیرۆکی کوردی باسـیان نووسـیوە، مەبەسـتیان لـە سـەرەتا و سـەرهەڵدانی چیرۆکی کوردییە لە کوردستانی عێراقدا تەنانەت لێرەدا (حسێن عارف) دەڵێ: ((تەنیا بەرهەمی چیرۆکنووسەکانی کوردستانی عێراق دەگرێتـەوە کـە لەبەردەسـتمدان و بـە ئاسانی هەم دەستگیرم دەبێ و هەم باشتر سەری لێدەردەکەم))[٢١].

٣- هەروەك لەو بەشـەدا روونمـانکردەوە کـە پەیوەنـدی بـە سـەرەتای چـیرۆکی هونەریی عەرەبی لە عێراقدا هەیە، لێکۆڵەرەوە عەرەبەکان کە باسی سەرەتای چیرۆکی عێراقی دەکەن، مەبەستیان لە چیرۆکی عەرەبییە لە عێراقدا و بە هیچ جـۆرێ ناچـنە سەر سەرەتای چیرۆکی عەرەبی بـە گشـتی، چـونکە ئەگـەر وابوایـە لـە رووی کـاری زانستییانەوە دەبوایە لە مەحموود طاهر لاشین و مەحموود تەیموورەوە دەست پێ بکـەن

کە پێشەوای چیرۆکنووسینن لە میسردا، بەڵام لـە هـەموو نووسـین و بـاس و کتێبـە چاپکراوەکانیاندا بایەخیان بە سەرهەڵدانی چیرۆکی هونەریی عەرەبی لە عێراقـدا داوە و هەر ئەوەش بووە مەبەستی سەرەکییان.

بەو پێیە نووسەرانی ئێمەش هەر ئەوەندەیان لە تواناد بووە کە سەرەتای چـیرۆکی هونەریی کوردی لە عێراقدا بدۆزنـەوە و دەستنیشـانی بکـەن، چـونکە لەوانەیـە لـە قوژبنێکی تری ئەم جیهانە پان و بەرینەدا کوردێکی کلۆڵ رازی دڵی خۆی لە دوو توێی چیرۆکێکدا نووسیبێت و هەروا بە روونووسی لەلای خۆی مابێتەوە و کەسیش نەیبینیێ، هەر بۆ نموونەش ئەوەبوو (ئەحمەد موختار جاف)ی شاعیر کـە جـەماوەری کـورد وەك شاعیرێکی هەڵکـەوتووی یـاخیبوو ناسـیبوویان و زۆربـەی شـیعرەکانی بەسـەر زاری خوێنەوارانەوە بوون، لە ساڵی ١٩٧٠دا بەهۆی تەقەڵای (د. ئیحسان فوئاد)ەوە لە تەك شیعرەکانیدا چیرۆکیشی کەوتە دەست خوێنەری کورد.

لە ساڵی ١٩٣٨دا چیرۆکی (مەسەلەی ویژدان)ی نووسیوە، بەڵام ٣٢ سـاڵی ئـەمجا خوێنەری کورد پێی ئاشنابوون[٢٢].

ئەمە بەڵگەیە بۆ ئەوەی ئەگەر لێکۆڵەرەوەکان وردتر بەدوای چـیرۆکدا بگـەڕێن و کەل و قوژبنی کتێبخانە جیهانییەکان بپشکنن و بەناو سندووقی ئەشـتەرخانی کـۆنی شاعیران و نووسەرانمانا بگەڕێن لەوانەیە بە دەستی خاڵی نەگەڕێنەوە[٢٣].

## ئەو هەوڵانەی لەم بوارەدا دراون

من بەش بە حاڵی خۆم تا ساڵی ١٩٦٠ لە هیچ رۆژنامـە و گۆڤاریکـدا لـە هـیچ کتێبێکی چاپکراودا هێمایەکی وام بەرچاو نەکەوتووە ئەوە پێشان بدات کـە چـیرۆکی کوردی چۆن لە شێوەی حیکایەت و بابەتی فۆلکلۆرییەوە لە سەردەستی کام نووسەردا قاڵبی هونەریی وەرگرت و ئەم هونەرە شارستانییە نوێیە هاتە نێو لاپەڕەکانی ئـەدەبی کوردییەوە، تا ((حسێن عارف)) لە ژمـارە (١٠)ی گۆڤـاری (بڵێسـە)دا لـە مـانگی مایسـی ١٩٦٠دا ئـەم بانگـەی بـە گـوێی چـیرۆکی کوردیـدا هەڵـدا و سـەرەتاکەی

دەستنیشان کرد. لەو سەردەمەدا بە نیازی ئەوەی وەك باسێکی ئەدەبی دەربارەی چیرۆکی کوردی لە کۆنگرەی یەکەمی ئەدەبیاتی عێراقدا پێشکەش بکرێ[٢٤] (حسێن عارف) کەوتۆتە گەڕان و پشکنینی رۆژنامە و گۆڤارە کۆنەکان، کاتێکی زۆری رۆژانەی لە کەشتی نووحدا بەدیار مامۆستا نەجمەددین مەلاوە بردۆتە سەر و تاوتووی ئەو رۆژنامانەی کردووە کە لە بیستەکانا دەرچوون، تا لە ئەنجامدا ئەو باسەی ئامادە کردووە، بەڵام دیارە بۆی نەڕەخساوە کە لە کۆنگرەی یەکەمدا پێشکەشی بکات، ئەوەبوو ئیتر بە سێ بەش لە ژمارەکانی ٩، ١٠، ١١ی گۆڤاری (بڵێسە)ی نەقابەی مامۆستایانی سلێمانیدا بە ناونیشانی (چیرۆك و چیرۆکی شانۆیی کوردی لە نیو سەدەی رابووردوودا) بڵاوی کردەوە. لە بەشی یەکەمدا باسی باری رۆشنبیری گەلی کورد لە پەنجا ساڵی رابووردوودا دەکات، لە بەشی دووەمدا دێتە سەر (چیرۆك لە ئەدەبی کوردیدا لەو ماوەیەدا)، لەم بەشەیاندا گەیشتۆتە ئەو ئەنجامەی کە بڵێ: ((کۆنترین بەرهەمی چیرۆکی ئەم ماوەیەمان کە دەسگیرمان بووبێ چیرۆکێکی درێژی (جەمیل سائیب)ە کە بە زنجیرە لە رۆژنامەی ژیان و ژیانەوەدا لە ساڵی ١٩٢٥دا بڵاو کردۆتەوە لەژێر ناوی (لە خەوما)[٢٥].

واتە یەکەم چیرۆکی هونەریی کوردی لە کوردستانی عێراقدا کە هەلومەرجی چیرۆکی تێدابێ ئەو چیرۆکەی (جەمیل سائیب) بووە، ئەگەرچی ئەو بۆ مەبەستێکی سیاسیش ئەو خەوەی بینیوە و هەرچەندە من لەلای خۆمەوە لەگەڵ ئەو ناوەرۆکەدا نیم کە لەو کاتەدا نووسراوە، بەڵام لە رووی هونەرییەوە بە چیرۆك دادەنرێ، و بەم باسەی (حسێن عارف) سەرەتای چیرۆکی هونەریی کوردی لە عێراقدا دەستنیشان کرا. (حسێن عارف) هەر لەو باسەیدا و لە بەشی سێیەمدا باسی چیرۆکی شانۆیی دەکات[٢٦] دەربارەی ئەم بەشەیان-هەرچەندە پەیوەندی بەم باسەمانەوە نییە، بەڵام بە پێویستی دەزانم بۆ روونکردنەوەی لایەنێکیتر کە راستەوخۆ ئەم باسە دەیگرێتەوە هەندێ لەسەر ئەم بەشەش بدوێین، لەم بارەیەوە (د. کەمال مەزهەر ئەحمەد) دوو تێبینی وردی خستۆتە بەرچاو خوێنەرانی کورد کە دەڵێ: ((زۆربەی ئەو سەرچاوانەی

باسی شانۆی کوردیان کردووە ساڵی ١٩٢٦ بە سەرەتای دادەنێن، واتە ئەو ساڵەی یەکێ لە فێرگەکانی سلێمانی شانۆگەری (نێرۆنی زۆردار)ی نیشاندا تاد...)) ئەمجا د. کەمال دەڵێ: ((وابزانم ئەو چیرۆکەی عەبدولڕەحیم رەحمی و هەندێ بەرهەمیتر ئەوە دێنن مامۆستا (حسێن عارف) ساڵی ١٩١٨ یان ١٩١٩ی بکردایە سەرەتای لێکۆڵینەوەکەی ئەم دواییەی دەربارەی چیرۆکی کوردی))[٢٧] دەربارەی ئەم دوو تێبینییەی د.کەمال چەند خاڵێك هەن بۆ روونکردنەوە:

١- حسێن عارف لە لێکۆڵینەوەکەیدا (چیرۆکی هونەری کوردی ١٩٢٥-١٩٦٠) باسی سەرەتای چیرۆکی کوردی دەکات نەك چیرۆکی شانۆیی واتە ئەو کە دەستنیشانی چیرۆکەکەی (جەمیل سائیب)ی کردووە مەبەستی سەرەتای چیرۆکی هونەریی کوردییە.

٢- بەڵام لە بەشی سێیەمی باسەکەیدا کە لە گۆڤاری (بلێسە)دا بڵاوی کردەوە، و لەم باسەدا باسمانکرد و لە سەری راوەستاین، حسێن عارف ئەوەی پشتگوێ نەخستووە کە هاتۆتە سەر باسی شانۆی کوردی بایەخی بەو بەرهەمەی (رەحمی)داوە و دەڵێ:

((یەکەم چیرۆکی سەر شانۆمان کە باسی بکەین لامان وایە چیرۆکی "مەمی ئالان"ە کە عەبدولڕەحیم رەحمی کە یەکێکە لە کوردەکانی تورکیا نووسیویەتی))[٢٨].

کاك حسێن هەر لەم باسەیدا لەسەری دەڕوات و دەڵێ:

((ئەوانەی دیویانە و خوێندوویانەتەوە وای باس دەکەن کە چیرۆکێکی سەر شانۆی ئێجگار سەرکەوتووە، و شێوەی تراجیدی هێندە بەرز و کاریگەرە کە نرخێکی ئەدەبی گەورەی ئەداتێ و ئەیخاتە ریزی هەر چیرۆکێکی سەر شانۆی بەناوبانگیتر))[٢٩].

٣- چونکە کاك حسێن زۆرتر بەدوای چیرۆکدا گەڕاوە، وادیارە بە قەدەر ئەوەی خۆی بۆ ئەو لایەنە ماندوو کردووە، ئەوەندەی مەبەست نەبووە بە دوای سەرەتای شانۆی کوردیدا بگەڕێ، بۆیە دەبینین لەم بەشی سێیەمەیدا دەڵێ: ((ئێمە یەکسەر لە ساڵانی ١٩٣٨-١٩٣٩ وە دەست پێدەکەین کە وەك باسی ئەکەن جوولانەوەیەکی تەمسیل کردن لە سلێمانیدا کەوتبووەوە...تاد))[٣٠].

راستییەکەی ئەم بۆچوونە هەڵەیە، چونکە وەك ساغ بۆتەوە سەرەتای شانۆی کوردی، وەك شانۆیەکی هونەری لە ساڵی ١٩٢٦ەوە دەست پێدەکات.[٣١] من لە لای خۆمەوە زۆرم هەوڵدا کە لەم لایەنە بکۆڵمەوە، لە ئەنجامدا لە ساڵی ١٩٧٦دا بە بۆنەی یۆبیلی زیوینی شانۆی کوردییەوە باسێکم ئامادەکرد، بەڵام لەبەر هەندێ هۆی ((رۆژنامەنووسی)) لەوکاتەدا بڵاونەکرایەوە، لە ساڵی ١٩٧٨دا لە پاشکۆی عێراقدا بڵاوکرایەوە.[٣٢]

❊ ❊ ❊

بەم شێوەیە ئەو باسەی (حسێن عارف) کە لە گۆڤاری بلێسەدا بڵاوکرایەوە بوو بە چرایەك رێگای لە بەردەم ئەدیبان و لێکۆڵەرەوەکاندا رووناك کردەوە، دوای ئەوەی کە دەرکەوت یەکەمین چیرۆکی هونەریی (لە خەوما)ی (جەمیل سائیب)ە لە دوای شازدە ساڵ کاك حسێن ئەو کورتە باسەی خۆی کرد بە بەردی بناغە بۆ کتێبێکی ١٦٠ لاپەڕەیی و لە ساڵی ١٩٧٧دا بە ناوی (چیرۆکی هونەریی کوردی ١٩٢٥-١٩٦٠) لە چاپیدا و بڵاوی کردەوە.

(حسێن عارف) لەم کتێبەیدا کە بەڕاستی پێوەی ماندوو بووە جارێکی کەش گەلێك گۆڤار و رۆژنامە و کتێبی چاپکراو و چیرۆکی بڵاوکراوەی خوێندۆتەوە و کەوتۆتە تاوتوێکردنیان و بەرهەمی ٣٥ ساڵی پشکنیوە و شەونخوونی بە دیاریانەوە کێشاوە تا دووبارە ئەوەی سەلماندۆتەوە کە بۆچوونی باسەکەی پێشووی وەك حەقیقەتێك دەمێنێتەوە و دەڵێ:

((دەبێ ئەو راستییەمان لەپێش چاو بێ کە هێندەی تا ئێستا پێزانرابێ، یەکەمین چیرۆکی هونەریی کوردییە-مەبەستی لە خەومای جەمیل سائیبە (م. س. ك) هێنرابێتە بەرهەم و بەوە دەبێتە یەکەمین بەردی بناغەی ئەم بابەتە ئەدەبییە نوێیە لە ئەدەبی هاوچەرخماندا. هەروەکو نووسەرەکەشی دەبێتە یەکەمین ئەدیبمان کە لەم مەیدانەدا دەستپێشخەری کردبێ و بەوە دەبێتە یەکەمین چیرۆکنووسی کورد.))[٣٣] بۆ ئەوەی جیاوازییەك دەربخات لە نێوان حیکایەت و رازی لە شێوەی پەخشان نووسراو و چیرۆکی هونەریدا، کاك حسین دووبارە دەڵێ:

((بەو کارەی بووە یەکەمین چیرۆکنووسی کورد لە کوردستانی عێراقدا و مەبەستی لە جەمیل سائیبە (م. س. ك) چیرۆکی هونەریش لە ئەدەبی تازەماندا بەو نووسینەی ئەو رەنگی رێژرا و سەریهەڵدا))[٣٤].

لەم چەند دێڕەی حسێن عارفدا کە ئێستا پەنجەمان بۆ راکێشا ئەگەر بە وردی لێی بکۆڵینەوە گەلێ راستی دەرخستووە کە وەڵامە بۆ گەلێ مشتومڕ لەوانە.

أ- یەکەمین چیرۆکنووسی کوردە لە کوردستانی عێراقدا.

ب- چیرۆکی هونەریش لە ئەدەبی تازەماندا بەو نووسینە سەریهەڵدا.



کاتێ کە د. عزالدین مستەفا بۆ خوێندنی باڵا چووە یەکێتی سۆڤیەت لە کۆتایی ساڵی ١٩٦٠ەوە تا کۆتایی ١٩٦٢ خەریکی ئامادەکردنی نامەی دوکتۆراکەی بوو کە لە حوزەیرانی ١٩٦٣دا پێشکەشی کرد، لە ماوەی ئەو دوو ساڵەدا گەلێك سەرچاوە گەڕا و کتێبخانەکانی پشکنی بۆ نووسینی نامەی دوکتۆراکەی کە لەوەودوا لە (صیدا) لە ساڵی ١٩٦٦دا بەناوی (الواقعیە فی الادب الکردی)یەوە لە چاپیدا، دەربارەی چیرۆکی کوردی (د. عزالدین) لەو کتێبەیدا دەڵێ:

((کتێبی مەولودنامەی شێخ حسینی قازی ١٧٩١-١٨٧٠ یەکێکە لە باشترین مەولودنامە لە رووی شێوەی هونەریی و دەرخستنی ئیستاتیکی زمانی کوردی لە ناوەرۆکیدا، و لە رووی شێوازە چیرۆکییەکەیەوە...تاد)).

ئینجا لەسەری دەڕوات و دەڵێ: ((بەڵام چیرۆکی کوردی تا کاتی نێوان هەردوو جەنگەکە دەرنەکەوت. دەتوانرێ ئەو بیرەوەرییە توانجاوییەی جەمیل سائیب ساڵی ١٩٢٥ نووسی دەربارەی حوکمڕانی شێخ مەحموودی حەفید بە ناونیشانی (لە خەوما) بە یەکەم کاری چیرۆکنووسی دابنرێ))[٣٥] شیاوی باسە (د. عزالدین) لە پەراوێزی ئەم بۆچوونەیدا ئیشارەتی بەو راپۆرتەی حسێن عارف داوە کە لە نیسان و مایسی ١٩٦٠دا دەربارەی چیرۆکی کوردی لە گۆڤاری (بڵێسە)دا بڵاوی کردبووەوە.

لێرەدا ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە کە د. عیزەدین سەرەتای پەخشانی کوردی بۆ مەولودنامەکەی شێخ حسینی قازی دەگێڕێتەوە، بەڵام لە تەك حسێن عارفدا رایان دەربارەی سەرەتای چیرۆکی هونەریی کوردی یەك دەگرێتەوە و ئەمیش لای خۆی (لە خەوما) بە سەرەتای ئەم هونەرە دادەنێ. بەڵام دوای ٢٢ساڵ بەسەر نووسینی نامەی دوکتۆراکەیدا، لە باسێکیترا د.عزالدین کە جارێکی کە ئەوە دووبارە دەکاتەوە کە شێخ حسێنی قازی بە دامەزرێنەری پەخشانی کوردی دادەنرێ ئەڵێ: ((بەڵام ئەوەی دەبێ لێرەدا بووترێت و هەر ئێرە جێگەی وتنێتی ئەوەیە کە ئەو مەولودنامەیە هەر سەرەتای چیرۆکی کوردیشە))(٣٦).

بەلای دوکتۆر عزالدینەوە ئەو حیکایەتە بچووکانەی شێخ حسێنی قازی دەربارەی مەولود و گێڕانەوەی باسی لەدایك بوونی پێغەمبەر (د. خ) بەو شێوە حیکایەت ئامێزانە ئەچنە خانەی چیرۆکەوە، بۆیە وەك لەمەوبەر باسمان کرد وتوویەتی: ((بەڵکو سەرەتای چیرۆکی کوردیشە))، بەڵام وادیارە د. عزالدین نایەوێ بە رەهایی بیکاتە سەرەتاو ئەو بنچینەیەی پێشوو بۆ چیرۆکی کوردی دانراوە هەڵی بتەکێنی لەبەر ئەوە هەر لەم باسەیدا دەڵێ:

((.. هەروەها گێڕانەوەی باس و باوەڕی دروست بوونی زەوی و ئاسمان و لە دایك بوونی پێغەمبەر بەو شێوە حیکایەت ئامێزە، سەرەتای ساکاری چیرۆکی کوردییە))(٣٧).

ئێمە هەر وەك لە سەرەتای ئەم باسەدا وتمان: چیرۆکی کوردی لە حیکایەتە ساکارە میللییەکانمان دانابڕێ، وەك ئەدەبی هەموو میللەتانیتر زنجیرەیەکە و پێکەوە بەستراوە، کەلەپوور و سامانی نەتەوەییمان سەرچاوەیەکی روونی باوەڕپێکراوی گەلێ لایەنی ئەدەبیاتمانە، بەڵام جیاوازییەکە ئەوەیە کە ئەو نووسینانە با لە شێوەی چیرۆکێشا نووسرابنەوە، لە خۆیانا حیکایەتێکی ساکارن دوورن لە چیرۆکی هونەرییەوە کە مەرجی تایبەتی خۆی هەیە، هەر بۆیەشە کە دێتە سەر (خەو)ەکەی سائیب جارێکیکە د. عزالدین دەڵێ: ((بەڵێ.. سەرەتای هونەری تازە بابەتی چیرۆکە))(٣٨) ئەمەش لە خۆیا شابەیتی ئەو مەسەلەیەیە کە توێژەرەکان بە دویدا دەگەڕێن و ئەوە دەسەلمێنن کە

چیرۆکی (له خهوما)ی جهمیل سائیب سهرەتای چیرۆکی هونەریی کوردییه له کوردستانی عێراقدا، که بۆ یەکەمجار نووسینێك دەبینریٚ دوور له شێوەی حیکایەت ئامێز و له قاڵبێکی هونەریدا دارێژراوه.



ئەگەرچی عومەر مارف بەرزنجی به تەمەن له دوکتۆر عیزەدین مستەفا و حسێن عارف منداڵتره، بەڵام یەکێکه لەوانەی هەر له منداڵییەوه خولیای کۆکردنەوەی رۆژنامه و گۆڤار و کتێبی کوردی له مێشکیا بووه، له قۆناغی خوێندنی ناوەندییەوه بەرهەمی له رۆژنامه و گۆڤارەکاندا بڵاوکردۆتەوه، یەکێکیشه لەوانەی که له سەردەمێکی کۆنەوه به دوای چیرۆکی کوردیدا گەڕاوه و له هەر شوێنێ ناوی رۆژنامەیەك یان گۆڤارێکی بیستبێ که چیرۆکێکی کوردی تێدا بڵاوکرابێتەوه هەوڵی داوه پەیدای بکات تا وایلێهاتووه کەرەسەیەکی باشی له کتێبخانەکەیدا بنیاد ناوه. عومەر مارف بەرزنجی ((له ئەنجامی رەنج و گەڕان و هەڵدانەوەی لاپەڕەی سەدەها رۆژنامه و گۆڤاری ماوەی ٤٥ ساڵ و لێکۆڵینەوه و له بێژنگدان و دیاریکردنی رێڕەوه جۆر به جۆرەکانی ئەو ماوەیه))[٣٩] گەیشته ئەو ئەنجامەی کتێبێك پێشکەش به کتێبخانەی کوردی بکات که بریتییه له لێکۆڵینەوەیەکی به پێزی ئەکادیمییانه دەربارەی نووسەران و قۆناغەکانی سەرەتا و پێگەیشتن و گەشەکردنی چیرۆکی کوردی، هەروەها بەشێکی تایبەتیشی تێدا تەرخان کردووه بۆ بیبلۆگرافیای چیرۆکی کوردی له ساڵی ١٩٢٥ هەتا ساڵی ١٩٦٩، بەڕاستی کتێبەکەی بەرزنجی له تەك کتێبەکەی حسێن عارف که لەمەوبەر باسمانکرد بوونەته سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراوی زانستانه دەربارەی چیرۆکی کوردی له ماوەی چل تا چل و پێنج ساڵ.

کاك عومەر له ئەنجامی ئەم گەڕان و پشکنینەیدا که به وردی بەو هەموو رۆژنامه کۆنانەدا چۆتەوه گەیشتۆته ئەو ئەنجامەی که ((دەرکەوتنی چووزەرەی یەکەم چیرۆکی نووسراوی کوردی له ناوەڕاستی بیستەکانی ئەم سەدەیەوه بەری رەنجی خاوەن چاپەمەنییەکانی ئەو رۆژگاره بووه))[٤٠]، لای ساغ بۆتەوه که یەکەم چیرۆکی نووسراوی

کوردی لە دوو توێی کتێبێکی چاپکراودا بەرچاو نەکەوتووە، بەڵکو لە ڕۆژنامەکاندا ڕووناکی دیوە، ئەمجار دوای ئەوەی بەرزنجی لە بارودۆخی کوردستان و باری ڕوناکبیری ئەو سەردەمە دەدوێ ئەگاتە ئەو ڕایەی کە لە تەك دەستنیشانکردنەوەکەی حسێن عارفدا یەکانگیر دەبن و دەڵێ: ((بۆ یەکەمجار لە ڕۆژی ١٩٢٥/٧/١ی ڕۆژنامەی ژیانەوەدا بەشی یەکەمی چیرۆکێك دەبینی بە ناونیشانی (لە خەوما) کە بەبێ ناوی خاوەنەکەی بڵاوکراوەتەوە، بەڵام لە ڕاستیدا خاوەنی چیرۆکەکە (جەمیل سائیب)ی سەرنووسەری ڕۆژنامەی ژیانەوەبوو))[٤١]. بە هەرحاڵ لە ئەنجامی تەقەڵا و ماندووبوون و شەونخوونی ئەم نووسەرانە بە شێوەیەك کە هیچ گومانی تێدا نەمێنێ ساغ بووەوە کە یەکەم چیرۆکی هونەریی کوردی لە کوردستانی عێراقدا، چیرۆکی (لە خەوما)یە لە نووسینی جەمیل سائیب.



لە کاتێکدا خەریکی نووسینی ئەم باسە بووم یان ڕاستتر وایە بڵێم تەواوم کردبوو، برای نووسەر مامۆستا حەسەن جاف دانەیەك لە بەرهەمە نوێیەکەی خۆی پێشکەش کردم، دوای خوێندنەوەی گەیشتمە ئەو ئەنجامەی کە کاك حەسەن جاف لە تەك براتوێژەرەوەکانی تردا نییە کە چیرۆکی (لە خەوما)یان بە یەکەم چیرۆکی هونەریی کوردی داناوە، نووسەر لێرەدا دەیباتەوە سەر بناغە فۆلکلۆری و حیکایەتە کوردەوارییەکان و دەڵێ: ((فۆلکلۆری کوردی گرنگترین و کۆنترین سەرچاوەی کوردییە))[٤٢].

هەروەها نووسیویە ((شەوانی دوور و درێژی زستان لە دیوەخان یان لە ماڵی یەکتردا دەیانبردە سەر بە حیکایەت گێڕانەوە))[٤٣] ئەمجا دەڵێ: ((هەندێ جار لە ڕێی خۆشخوان و لاوك بێژەوە حیکایەتەکان باس دەکران))[٤٤].

تا ئێرە مەسەلەکە لای من هیچ ئاڵۆزییەکی تێدا نییە، چونکە ئەم ڕایانە نابنە بەڵگە بۆ ئەوەی بنچینەی چیرۆکی کوردی هەڵبوەشێنی و لە جێی (لە خەوما) چیرۆکێکیتر دابنرێ، ئەم ڕایانە دەمانگێڕێتەوە سەر ئەو بۆچوونانەی من کە لە پێشەکی ئەم باسەدا دەربارەی حیکایەت-پێش دەرچوونی کتێبەکەی کاك حەسەن-نووسیومە.

چونکە شتێکی ئاشکرا و دیارە کە حیکایەت لە کوردەواریدا رەگی چەند کۆنە.

ئەمجار هەر خۆی مامۆستا حەسەن جاف کە بەرپەرچی راکان مامۆستایان د. عزالدین و حسێن عارف و عومەر بەرزنجی دەداتەوە دەڵێ: ((ئەمانەن بە بڕوای من-واتە فۆلکلۆری کوردی و حیکایەت و لاوك-م. س. ك- سەرچاوەی یەکەمی چیرۆکی کوردی))[٤٥].

لێرەدا کاك حەسەن باس لە سەرچاوە دەکات نەك لە سەرەتا کەواتە هەر لەسەر ئەو رایەی خۆی دەتوانین بڵێین: گەلێك راستە کە سامانی نەتەوەییمان بە لاوك و حەیران و شیعری دەماودەم و بەیت و داستان و ئەفسانە و حیکایەتی سەرزاری و...تاد. ئەمانە سەرچاوەیەکی لەبن نەهاتوون بۆ چیرۆکی کوردی، بەڵام پرسیارەکە ئەوەیە: ئەی چیرۆکی هونەریی کوردی بەو شێوە هونەرییەی بە چیرۆك دابنرێ کامەیە و لەسەر دەستی کام نووسەردا و کەی سەریهەڵدا؟

ئەگەر مامۆستا حەسەن ببوورێ و رێگا بدات دەڵێم: وەڵامەکەی ئەو ئەنجامەیە کە ئەو توێژەرەوانە ساغیان کردۆتەوە، بەڵام گلەییەکی کاك حەسەن لە جێی خۆیدایە کە بۆچی هەوڵ نەدراوە پەل بۆ شوێنەکانی تری کوردستان بهاوێژرێ تا بگەیشتینایەتە ئەنجامێکی بە سوودتر. دیارە ئەگەر ئەم کارە بە ئەنجام بگەیەندرایە ئەوسا دەتوانرا سەرەتایەك بۆ مێژووی چیرۆکی کوردی لە گشت کوردستاندا بنووسرێ نەك بە تەنیا لە عێراقدا.

هەر لێرەدا حەقیقەتێك هەیە نابێ فەرامۆش بکرێ ئەویش ئەوەیە، ئەو نووسەرانەی-وەك د. عزالدین مستەفا و د.جەمشید حەیدەری و حسێن عارف و عومەر بەرزنجی- کە چیرۆکی (لە خەوما)یان بە یەکەم چیرۆکی کوردی داناوە لە هەمانکاتدا رەخنەیان لە ناوەڕۆکی چیرۆکەکە گرتووە و-تەزکیە-ی ئەو هەڵوێستەی نووسەریان نەکردووە، هەندێکیان بە تیژیش بەرپەرچیان داوەتەوە و بە ئاشکرا ئەوەیان دەرخستووە کە ئەم (خەو)ە بۆ مەبەستێکی سیاسی دژی شێخی نەمر و فەرمانڕەواییەکەی نووسراوە، کە نەدەبوو وابێت، بەڵام وەك چیرۆك

ئەگەرچی کەم و کوڕیشی تێدا بووبێت چۆتە خانەی چیرۆکەوە و بە سەرەتای چیرۆکی هونەریی کوردی دانراوە.

*   *   *

## ((بەڵگەیەکی باوەڕپێکراو))

لە دوا مانگی ساڵی ١٩٧٩ لە پەیمانگەی رۆژهەڵاتناسی سەر بە ئەکادیمیەی زانستی سۆڤیاتی لەلایەن پرۆفیسۆر کوردوییێف و پرۆفیسۆر کورد ئۆغلۆ خالیق حسینوفیچ و دوکتۆر کەریمی ئەیوبی موناقەشەی نامەی دوکتۆرای کاك جەمشید حەیدەری کرا کە دەربارەی (چیرۆکی هونەریی کوردی) بوو لە ١٩٢٥ تا ١٩٦٠.

لەم رۆژانەدا خۆشبەختانە کورتەیەکی پوختی چڕی بەشی لەو نامەی دوکتۆرایەی دوکتۆر جەمشیدم دەستکەوت، بە پێویستم زانی بۆ سوودی خوێنەران و بۆ بەپێزکردنی ئەم باسە ئەوەندە پێوەندی بە سەرەتا و سەرهەڵدانی ئەم هونەرە نوێیەوە هەیە بیخەمە بەرچاو:

١- دوکتۆر جەمشید حەیدەری دەڵێ: ((دوکتۆر مارف خەزنەدار و دوکتۆر عزالدین مستەفا رەسول لە ئوتروحەکانیانا باسی چیرۆکی کوردییان کردووە، هەروەها چەند وتارێ لەم لا و لەولا دەربارەی چیرۆکی کوردی و بەرهەمی چیرۆکنووسەکان بڵاوکراونەتەوە، بەڵام کاتێك دەستم دایە نووسینی ئوتروحەکەم لە ١٩٧٦دا لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتی لەم بارەیەوە نەبوو، بەڵام لە ساڵی ١٩٧٧دا دوو کتێب بەرەو دوا چاپکران یەکەمیان لەلایەن چیرۆکنووس حسێن عارف و دووەمیان لەلایەن نووسەر عومەر مارف بەرزنجەییەوە، دوای ئەوانیش نووسەر سەباح غالب (ئافرەت لە چیرۆکی کوردیدا)ی دەکرد. من لە خۆمەوە لە پێشەکی ئوتروحەکەمدا ئەو لێکۆڵینەوانەم شی کردوونەتەوە و لە سەریانم نووسیون.

٢- دەربارەی سەرچاوەکای چیرۆکی کوردی دوکتۆر جەمشید دەڵێ: ((بریتین لە فۆلکلۆر، ئەفسانە، حیکایەت، مەتەڵ، گۆرانی میللی، مەلحەمەی شیعری، چیرۆکی

مێژوویی فۆلکلۆری- ئەم شێوانەی کە لە سامانی نەتەوەکەماندا هەن بەلای ئێمەوە یەکێ لە سەرچاوە بنەڕەتییەکانی دەرکەوتن و گەشەکردنی پەخشانی هونەری کوردین)) هەر لێرەشدا دوکتۆر جەمشید پەنجە بۆ مەولودنامەکەی حسێنی قازی رادەکێشێ کە لەوەوبەر دوکتۆر عزالدین مستەفا باسی کردووە.

٣- دەربارەی چیرۆکەکەی فوئاد تەمۆ دوکتۆر جەمشید حەیدەری لە پەراوێزێکدا نووسیویەتی:

((پاش ئەوەی مامۆستا جەمال خەزنەدار گۆڤاری (رۆژی کورد)ی لە چاپ دایەوە، مەحموود زامداری نووسەر وتارێکی بڵاوکردەوە کە گوایا ئەم چیرۆکەی (فوئاد تەمۆ) کە لە ژمارەیەکی ئەو گۆڤارەدا بڵاوکراوەتەوە یەکەم چیرۆکی کوردییە، مامۆستا رەشید فندیش بە پێشەکییەکەوە بەرێنووسی نوێ لە ژمارەی ٨٦ی مایسی ١٩٨٣ لە لاپەرە ٢٤ و ٣٧ی گۆڤاری (بەیان)دا ئەو رایەی دووپات کردەوە، بەڵام بەلای منەوە چیرۆکەکەی (جەمیل سائیب) بە پێوانەی هونەریی ئەدەب بۆ چیرۆکی کوردی لە بیستەکاندا ئەو مافەی خۆی دەپارێزێ کە (یەکەم چیرۆکی کوردییە) و نووسەرەکەی پێشەوای ئەم هونەرەیە. ئەوەی کە (فوئاد تەمۆ) نووسیویەتی هەوڵدانێکە لە شێوەی حیکایەت نووسیندا)). لەبەر ئەوەی وەك لە سەرەتای ئەم چەند دێرەوە باسمکرد مامۆستا دوکتۆر جەمشید حەیدەری بە درێژی ئەم لایەنانەی ساغکردۆتەوە، بەڵام من تەنیا کورتکراوەیەکی چەند لاپەڕەیی ئەو نامەیەم دەست کەوتووە بۆیە تەنیا ئەم چەند خاڵەمان خستە پێش چاو، هیواداریین لە دوا رۆژێکی نزیکدا تەواوی ئوتروحەکەی دوکتۆر جەمشید بە چاپکراوی بکەوێتە بەردەستی خوێنەرانی کورد.

## ((بیرخستنەوەیەکی کورت))

ئێستا ئەگەر بەخێرایی چاوێك بە سەرەتای چیرۆکی عەرەبی لە عێراقدا بگێڕینەوە، وەك بۆمان دەرکەوت دەبینین لە ساڵی ١٩١٠ەوە چیرۆکی (خەو) بینین لە عێراقدا سەریهەڵدا، سا یان بەکارتێکردنی چیرۆکەکەی (نامیق کەمال) بێ کە

ڕەصافی گۆڕیبوویە سەر زمانی عەرەبی، یان بەهۆی کارتێکردنی کەڵچەری ڕۆژئاوایی بووبێ کە لە ڕێگای زمانی تورکییەوە کەوتۆتە دەست ڕووناکبیرانی عێراق، یان لەبەر بارودۆخی ڕۆژگار بووبێ کەوای لەو نووسەرانە کردووە رازی دڵی خۆیان بە شێوەی (خەو) لە چیرۆکدا دەربڕن، جەمیل سائیبی لەمەڕ ئێمەش کاتێ ویستوویەتی ڕەخنە لە فەرمانڕەوایی شێخ مەحموودی نەمر بگرێ پەنای بردووتە بەر خەو، چی لە دەروونیا بووە لەو خەوە سەیر و سەمەرەیەدا دەریبڕیوە. لێرەدا سێ سەرنجی بچکۆڵە هەن:

١- جەمیل سائیب چیرۆکەکەی لە شێوەی خەوبینیندا نووسیوە.

٢- ناوی خۆی لەسەر نەنووسیوە.

٣- لە ١٩٢٦/٧/٢٩دا لە دامێنی زنجیرەکانی چیرۆکەکەیدا لە ڕۆژنامەی (ژیان)دا نووسیویەتی: ((ماویەتی)).

ئەگەر بگەڕێینەوە سەر یەکەم چیرۆکی (خەو) لە عێراقدا کە چیرۆکی (خەوێکی عەرەبییە) کە لە ١٩١٠/٩/١٩ لە گۆڤاری (تنویر الافکار)دا بڵاوکراوەتەوە دەبینین:

- نووسەرەکەی ناوی خۆی لەسەر نەنووسیوە.
- چیرۆکەکە لە شێوە خەوبینیندایە.
- بە تەواونەکراویش بەجێهێڵراوە.

بەڵام ناتەواوی ئەم چیرۆکە نەبۆتە گرێ کوێرە و نەکرێتەوە، هەروەها بەلای منەوە (ماویەتی) یەکەی جەمیل سائیبیش نەبۆتە گیروگرفت چونکە نووسەر ئەوی مەبەستی بووە بە دەستییەوە داوە، ئەگەر بیزانیایە شتی ئەوتۆ ماوە هەڵبەت لەوێدا وازی لێ نەدەهێنا.

کاتێك مامۆستا جەمیل بابان دوای نیو سەدە ئەو بەرهەمەی چاپ کرد و بڵاوی کردەوە ئەو تەمە ڕەوییەوە و چ گیروگرفتی نەما پەیوەندی بە کۆتاییەکەیەوە هەبێ چونکە دەرکەوت کە هەر خۆی واتە جەمیل سائیب-لەوێدا وازی لێ هێناوە[٤٦].

## ((سەرئەنجام))

لە ئەنجامی ئەو هەوڵ و تەقەلایەی کە ئەو برای نووسەرانە داویانە ئەوەمان بە روونی بۆ دەردەکەوێ:

کە یەکەم چیرۆکی هونەریی کوردی لە عێراقدا چیرۆکی (لە خەوما)ی جەمیل سائیبە، و پێش ئەو هیچ چیرۆکێك نەبینراوە کە لە قالبی هونەریدا بووبێ. بەو شێوەیە دیارە نووسەرەکەشی یەکەمین چیرۆکنووسی کوردە کە بە شێوەی هونەریی چیرۆکی نووسیبێ. چیرۆکەکەشی چاولێکەری چیرۆکنووسە عەرەبەکانی عێراق و نووسەرە تورکەکانی تێدایە کە وەك ئەوان لە شێوەی (خەو) بینیندا نووسیوویەتی.

## پەراوێزەکان

(١) الواقعية في الأدب الكردي-الدكتور عزالدين مصطفى رسول، ص ٣٢.

(٢) نشوء القصة و تطورها. محمود تيمور-٢٠ اذار ١٩٣٦.

(٣) نشاة القصة و تطورها في العراق/ د. عبدالاله احمد/ مطبعة شفيق- بغداد ١٩٦٩.

(٤) سەرچاوەی ژمارە (٣)، لاپەڕە ٣٢٧.

(٥) وەك لەمەودوا بۆمان دەردەکەوێ دەبینین چیرۆکی (لە خەوما)ی جەمیل سائیب، چیرۆکی خەوبینینە، ناوی نووسەریشی لەسەر نەبووە و، لە دامێنیشیەوە نووسراوە (ماوەیەتی) م. س. ك.

(٦) لە تشرینی یەکەمی ١٩١٣دا لە گۆڤاری (لغة العرب)دا بڵاوکراوەتەوە.

(٧) لە تشرینی دووەمی ١٩١٣دا لە هەمان گۆڤاردا بڵاوکراوەتەوە. ناوی نووسەری پێوە نییە، بەڵام د. عبدالاله احمد بە نووسینی ئەنستاس کرملی دەزانێ.

(٨) لە شوباتی ١٩١٤دا هەر لەو گۆڤارەدا بڵاوکراوەتەوە، بە بۆچوونی د. عبدالاله احمد ئەمیشیان نووسینی ئەنستاس کرملییە کە خاوەنی گۆڤارەکە بووە.

(٩) ئەم چیرۆکە لە مایسی ١٩٢١دا بڵاوکراوەتەوە د. عبدالاله احمد بە نووسینی (عطا أمینی) دەزانێ.

(١٠) سەرچاوەی ژمارە (٣)، ل ٣٩-٤٠.

(١١) لێکۆڵینەوە و بیبلۆگرافیای چیرۆکی کوردی ١٩٢٥-١٩٦٩ عومەر مارف بەرزنجی چاپکراوی کۆڕی زانیاری کورد-بەغدا ١٩٧٨، ل ٢١.

(١٢) سەرچاوەی ژمارە (٣)، ل ٢٣٧.

(١٣) المجموعة الكاملة لقصص محمود احمد السيد/ اعداد و تقديم الدكتور علي جواد الطاهر و الدكتور عبدالاله احمد، بغداد ١٩٧٨، ص ٥.

(١٤) سەرچاوەی ژمارە (٣)، ل ٢٣٧.

(١٥) محمود احمد السيد رائد القصة الحديثة في العراق- د.علي جواد الطاهر، ص١٩٣.

(١٦) الأدب القصصي في العراق-د.عبدالاله احمد- بغداد ١٩٧٧، ج ١، ص١٩٣.

(١٧) رۆژی کــورد ١٩١٣، بڵاوکردنــەوە و پێشــەکی لەســەر نووســینی جــەمال خەزنەدار، بەغدا ١٩٨١.

(١٨) ئەگەر بە هەڵەدا نەچووبم، پێم وابێ دوکتــۆر کــەمال مەزهــەر ئەحمــەد لــە نووسینێکیدا ئەو ناوەی باس کردووە، بەڵام ئێستا نایەتە یادم لە کام وتاریدا یــان لــە کام بەرهەمی چاپکراویدا بەرچاوم کەوتووە (م. س. ك).

(١٩) گۆڤاری (بەیان) ژمارە ٩٦، مایسی ١٩٨٤، دەقی چـیرۆکەکەی فوئــاد تمۆ ١٩١٣.

(٢٠) بەداخەوە ئەو چیرۆکەی فوئاد تمۆ نە ناونیشانی هەیــە و نــە تــەواویش بــووە تــا سەرجەم خوێنەران رایەکی تەواوی بەرامبەر پەیدا بکەن، جگــە لــەوەی وەك (چـیرۆك) لــە رووی هونەرییەوە لاواز و ساکارە و هەر دەچێتە خانەی حیکایەتەوە، لێــرەدا توێــژەرەوەکان هەر وەك ئەو چیرۆکە سەرەتایانەی رزوق عیسی و غنیمــەی ســاڵی ١٩١٠تێــی دەڕوانــن و حیسابی سەرەتای چیرۆکی هونەریی کوردی بۆ ناکرێ (م. س. ك).

(٢١) چیرۆکی هونەریی کوردی ١٩٢٥-١٩٦٠، حسێن عارف، بەغدا ١٩٧٧، ل٥.

(٢٢) مەسەلەی وێژدان، ئەحمەد موختار جاف بڵاوکردنەوە و پێشەکی د. ئیحسان فوئاد بەغدا ١٩٧٠، چاپخانەی ئیرشاد.

(٢٣) کاك مەحموود زێوەر چیرۆکێکی دەستنووسی پیشاندام کە (زێوەر)ی شــاعیر کاتی خۆی نووسیویەتی و بڵاوی نەکردۆتەوە بەداخەوە مێژووی لەسەر نییە، بــەڵام بــە وتەی کاك مەحموود بۆ بیستەکانی دەگێڕێتەوە (م. س. ك).

(٢٤) لەو کۆنگرەیەدا کە دەبوو ئەم باســەی حســێن عارفیشــی تێــدا پێشــکەش بکرێ. د. صلاح خالص سکرتێری یەکێتی ئەدیبانی عێراق بوو راپۆرتێکی ئەدەبی بە پێزی پێشکەش کرد، چەندین ئەدیبی ناسراو بەشداری گفتوگۆیان لەسەر ناوەڕۆکی ئەو راپۆرتە کرد بەتایبەت دەربارەی هۆی کزی ئەدەب دوای شۆڕشــی چــواردەی تــەمووزی ١٩٥٨، راپۆرتەکــە لــە ژمــارە (٩)ی گۆڤــاری (الثقافــة الجدیــدة)ی ســاڵی ١٩٥٩دا بڵاوکرایەوە، ئەو گفتوگۆیانەش لە گۆڤــاری (الثقافــة الوطنیــة) لوبنانیــدا لــە ژمــارە حەوتی تەمووز و ئابی ١٩٥٩دا بڵاوکرانەوە (م. س. ك).

(٢٥) گۆڤاری (بڵێسه) ژماره ١٠، مایسی ١٩٦٠، سلێمانی، چاپخانەی ژین. چیرۆك له ئەدەبی کوردیدا لەو ماوەیەدا، حسێن عارف، ل ٥.

(٢٦) وا زەن دەکەم ئەم بەشەیان کەم کەس بەرچاوی کەوتبێ، چونکە ئەو ژمارەیەی گۆڤاری (بڵێسه) بەهۆی داخستنی لقی نەقابەی مامۆستانی سلێمانییەوە، هەر لە چاپخانەدا دەستی بەسەرداگیرا، جا نازانم لەوەو دوا بڵاوکرایەوە یان فەوتێنرا (م. س. ك)

(٢٧) تێگەیشتنی راستی و شوێنی له رۆژنامەنووسی کوردیدا، دوکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد، بەغدا ١٩٧٨، پەراوێزی ژماره ٨.

(٢٨) گۆڤاری (بڵێسه)، ژماره ١١، حوزەیرانی ١٩٦٠ ساڵی یەکەم چیرۆکی شانۆ له ئەدەبی کوردیدا،حسێن عارف، ل ٨.

(٢٩) سەرچاوەی ژماره (٢٨).

(٣٠) سەرچاوه ژماره (٢٨)، ل ٩.

(٣١) له ٢٨/١٠/ ١٩٧٧ (ص. ك) كه لام وایه جەمال بابان بوو. وتارێکی لەم بارەیەوه بڵاوکردەوه له رۆژنامەی (العراق)دا بە ناونیشانی (المسرح الکردی و الفرق المسرحیه) و منیش (تەعقیبێکم) له هەمان رۆژنامەدا بەدوای وتارەکەی مامۆستا جەمال باباندا بڵاوکردەوه. چەند سەرنج و تێبینییەکی تازەم لەو بارەیەوه بەرچاو خستبوو.

(٣٢) * بڕوانه ژماره حەڤدەی (پاشکۆی عێراق)، تەمووزی ١٩٧٨.

* هەروەها له رۆژنامەی (العراق)دا باسێکم به عەرەبی له سەر شانۆی کوردی به سێ ژماره بڵاوکردەوه.

(٣٣) چیرۆکی هونەریی کوردی ١٩٢٥-١٩٦٠، حسێن عارف، ل ١٥.

(٣٤) سەرچاوەی ژماره ٣٣، ل ٢١.

(٣٥) الواقعیة في الأدب الکردی، دکتور عزالدین مصطفی رسول، ص٢٠٥ و ص٢٠٦.

(٣٦) گۆڤاری (کاروان)، ژماره (١٩) نیسانی ١٩٨٤ (ناوەرۆکی سیاسی و کۆمەڵایەتی چیرۆکی کوردی)، دکتۆر عیزەدین مستەفا رەسول، ل ٧.

(٣٧) سەرچاوەی ژمارە (٣٦)، ل ٧، ستوونی دووەم.

(٣٨) هەمان سەرچاوە، ل ٨.

(٣٩) لێکۆڵینەوە و بیبلۆگرافیای چیرۆکی کوردی ١٩٢٥-١٩٦٩، عومەر مارف بەرزنجی، چاپکراوی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا ١٩٧٨، ل ٤.

(٤٠) سەرچاوەی ژمارە (٣٩)، ل ٩.

(٤١) سەرچاوەی ژمارە (٣٩)، ل ١٦.

(٤٢) چیرۆکی نوێی کوردی، حەسەن جاف، ١٩٨٥، ل ١٩.

(٤٣) هەمان سەرچاوە، ل ٢٠.

(٤٤) هەمان سەرچاوە، ل ٢٠.

(٤٥) هەمان سەرچاوە، ل ٢٠.

(٤٦) جەمال بابان لە پێشەکییەکەی خۆیدا کە بۆ چیرۆکی (لە خەوما)ی نووسیوە دەڵێ، نووسینەکەی (لە خەوما)م لە بەردەست خەتی کاکینە (جەمیل سائیب) خۆی نووسیوەتەوە.

==================================================

(*) ئەم نووسینە لە گۆڤاری "کاروان" ژمارە (٣٧) ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٨٤دا بڵاوکراوەتەوە.

# "له خەوما"ی جەمیل سائیب

جەمال بابان

## بنەماڵەی سائیب

### کاکینە کێیە؟

کاکینە جەمیل سائیب کوڕی مـەلا ئەحمـەدی (سـائیب)[*] کـوڕی مـەلا قـادری قەرەداغی کوڕی مەلا حەسەنە[□]. لە ڕۆژی ١٦ی مـانگی ئـابی سـاڵی ١٨٨٧دا لـە شاری سلێمانی هاتووەتە دونیاوە. بە منداڵی لە حوجرەی مـەلا ئامینـە[□] قورئـان و فارسی خوێندووە. دوای ئەوە لە هەڵەبجە کـە بـاوکی بـە قازییـەتی لـەوێ بـووە، لـە حوجرەی مەلا ئەحمەدی تەکیەیی (سمایلنامە، ئەیشودەی شێخ مارفی نۆدێ، یوسف و زولیخا و گوڵستانی شێخی سەعدی)ی خوێندووە. دوای ئەوە کە هاتوونەتە سلێمانی، دیسان لە حوجرەی مەلا عـەزیزی زلزڵەیی کتێبی فارسـی خوێنـدووە، ئینجـا دەسـتی کردووە بە مەشقی خەتی درشتە، چونکە لەو کات و سەردەمەدا، منـداڵ لـە حـوجرە

---

(*) (صائب) لەقەبێکە مەلا ئەحمەدی باوکی لە زەمانی عوسمانییەکاندا بۆ خۆی هەڵبژاردووە.

(□) ئەم مەلا حەسەنە، هەندێك دەڵێن لە بنچینەدا خەڵکی دێی سەوسێنانی سەر بە ناحیەی قەرەداغە.

(□) مەلا ئامینە کوێرێکی خوێندەواری بەزەبر و توانای ئەوسا بووە، حوجرەی هەبووە، هیچ کاتێك لە (٣٠) منداڵ کەمتری لا نەبووە.

قورئان و کتێبی فارسی بە (متن)ەوە خوێندووە، کە نەختێك گەورە بوو ئەو کتێبانـەی بە مەعناوە خوێندووە و لە دواییدا دەستی کردووە بە خـەتی ڕێحـانی، دوای ئـەوەش مەشقی خەتی وردە.

جەمیل سائیب دوای حوجرە چووەتە قوتابخانەی سەرەتایی کە ئەوسا هەر یـەکێك هەبوو لە سلێمانی و هەمووی سێ پۆل بوو. دوای ئەوە باوکی بوو بە قازیی (قەڵادزە) ئەمیش لەگەڵیدا چوو، بەڵام لەبەر ئەوەی هیچ جـۆرە حـوجرە و قوتابخانەیـەك لـەوێ نەبوو، ساڵ و نیوێك دانیشت تا گەڕانەوە سلێمانی، ئەوسا لە مزگەوتەکەی هەمزاغای باپیری پیرەمێرد[*] دەستی کردەوە بە خوێندن، لەم کاتەدا تووشی نەخۆشییەکی قورس بوو، ئەوەندە کاری لێکرد، تا دوا ڕۆژی ژیانی شەقڵەکەی پێوە دیاربوو[], بـەڵام ئـەم پیاوە هەر کۆڵی نەدا، دیسان دەستی کردەوە بە خوێندنەوەی کتێبی فارسی و تورکی، تا باوکی کۆچی دوایی کرد، ئەوسا بەناچاری چووە ژێر باری فەرمانی میرییەوە و بـوو بـە کـاتبی (وێرگـو-بـاج) لـە سـلێمانی، تـا عوسمانییـەکان وڵاتیـان بەجێهێشـت و ئینگلیزەکان دەستیان بەسەر کاروباری عێراقدا گرت. ئەوسا ئـەمیش چـووە دائـیرەی (خەزێنە) کە حیساباتی ئێستایە و بوو بە کاتب.

لە ساڵەکانی ١٩١٩ و ١٩٢٠دا کە ڕۆژنامەی پێشـکەوتن لـە سـلێمانی دەردەچـوو و نووسینی کوردیی بڵاودەکردەوە، ئەمیش لە نووسینەکانیدا بەشـدار دەبـوو وەك لەمـەودوا باسی دەکەین. لە ساڵی ١٩٢٤دا دوای ئاوابوونی حوکمی شێخ مـەحموودی (حەفیـد) کـە دەزگای میری لە سلێمانی دانرایەوە، ڕۆژنامەی (ژیانەوە) دەرچـوو کـە ئـەم سەرنووسـەری بوو، بەڵام لە دواییدا لەبەر کاروباری میری وازی لە ڕۆژنامەکە هێنا، ئیتر لـە (خەزێنـە)دا مایەوەو ئەو کارگێڕی بوو، تا لە سـاڵی ١٩٤٩دا خانەنشـین کـرا، دوای ئـەوەش بـەینێك بووەوە بە سەرنووسەری ڕۆژنامەی (ژین) کە هی پیرەمێردی خاڵی بوو، تا لە پاییزی سـاڵی

---

(*) شاعیری بەناوبانگ حاجی تۆفیق، کە ئەبێت بە خاڵی جەمیل صائب.

() ئەوەبوو، تۆزێك بۆی ئەلەنگی.

١٩٥١دا تووشی نەخۆشییەکی قورس بوو، هێنایانە بەغدا، لە پاش رۆژێك واتا لە ١٣ی مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٥١دا فەرمانی یەزدانی بەجێهێنا و تەرمەکەیان بردەوە سلێمانی، لەسەر تەوقەسەری گردەکەی (مامەیارە) لە تەنیشت پیرەمێردەوە نێژرا.

کاکینە دوای خۆی شەش کوڕ و دوو کچی بەجێهێشت.

١- حەمە عەلی: کە سێ ساڵ لەمەوبەر* لە شاری بۆمبای لە هیندستان بەدەستێکی چەپەڵ کوژرا دوای ئەوەی گەیشتە پلەی (باڵیۆز - سەفیر).

٢- فەوزی: ئەفسەر بوو لە دواییدا چووە (ئیدارە)وە و گەیشتە پلەی (متصرف) ئێستا (متقاعدە).

٣- نەوزاد: لە حقوق دەرچووە و ئێستا فەرمانبەرە.

٤- ئازاد: لە کشتوکاڵدا لە دەرەوە خوێندوویەتی و ئێستا فەرمانبەرە.

٥- بەهزاد: فڕۆکەوانە لە سوپادا.

٦- شەهزاد: (پشتیوان - محامی)یە.

٧- نەسرین: کچی گەورەیەتی و شووی کردووە.

٨- ڕووناك: مامۆستای قوتابخانەیە و شووی کردووە.

ئەم منداڵانەش بەری سێ ژنن، حەمە عەلی و فەوزی دایکیان یەکە، نەسرینیش دایکی جیایە، منداڵەکانیتریش دایکیان یەکە کە حەپسەخانە و لە بنەماڵەی عیرفانە لە سلێمانی.

نازناوی جەمیل سائیب (کاکینە)یە، کە ئەمەش حاجی تۆفیقی خاڵی لە ئەنجامی خۆشەویستیدا بەسەریا بڕیبوو کە بە واتای کاکی ئێمە دێت.

## کەی دەست کرا بە کوردی نووسین؟

لە ساڵی ١٩٢٠دا و لە زمانی میجەرسۆندا، لە ڕێگای رۆژنامەی پێشکەوتنەوە کە ئەوسا لە سلێمانی دەردەچوو، داوا لەو کەسانە کرا کە حەز لە

(*) ئەم نووسینە لە ساڵی ١٩٧٥دا نووسراوە.

نووسین دەکەن، بە کوردی لە بابەت سیاسەت و فەلسەفە و ئامۆژگاری و باسی کشتوکاڵ و سەفەرنامە و حیکایەت و سەرگوزەشتیترەوە بنووسن و بۆیان بنێرن. سێ پاداشت دانرا، بۆ یەکەم (٥٠) روپیە و بۆ دووەم (٣٥) روپیە بۆ سێیەم (٢٥) روپیە. ماوەی دوازدە رۆژ دانرا بۆ پێشکەشکردنی نووسینەکان. لە دواییدا لە ناو یازدە نووسراودا ئەم سیانە هەڵبژێردران و خاوەنەکانیان پاداشتیان وەرگرت.

یەکەم: جوت و گا شتێکی چاکە، نووسینی م. نوری واتا **محەممەد** نوری یاخود شاعیری بەناوبانگ شێخ نوری شێخ ساڵح.

دووەم: بۆچرووك، نووسینی زەکی سائیب کە مستەفا سائیبە و لە شوێنی خۆیدا باسی کراوە.

سێیەم: رۆژەوەبوونێك، نووسینی **محەممەد** جەمیل کە جەمیل سائیبە.

هەرچەندە ئەم رۆژەوەبوونە نووسینێکی سادەیە و لە کۆتاییەکەیدا هەندێك (تناقضات) و شتی ساویلکە دەخاتە پێش چاو، بەڵام لەگەڵ ئەمانەشدا وەك یەکەم نووسینی کوردی و لەو زەمانەدا شتێکی بە نرخە بۆ ئەمرۆ، لەبەر ئەوە ئەمیشمان لە کۆتایی ئەم کتێبەدا بڵاوکردەوە.

## بنەماڵەی سائیب(*)

ئەم خانەوادەیە جگە لە (کاکینە) و کوڕەکانی کە باسمان کردن گەلێك پیاوی لێهاتووی کەیان تیاهەڵکەوتووە، کە هەموو لە مەیدانی نووسین و شیعر و هونەردا دەستی باڵایان هەبووە وەك:

---

(*) سەیری گۆڤاری (رۆژی کوردستان) ژمارە ٢٨-٢٩ی تەمووزی ١٩٧٥ بکە، کە نووسینێکی بە عەرەبی بە قەڵەمی جەمال بابان لەسەر عارف صائب و بنەماڵەی صائب تێدایە.

## مەلا ئەحمەدی سائیب(*)

باوکی جەمیل سائیبە لە سلێمانی ساڵی ١٢٧٠ی کوردی هاتووەتە دونیـاوە. لـە زانستدا پایەبەرز، جگە لەوەی دەستێکی باڵای لە ئەدەبی فارسی و تورکیدا هەبووە و دیوانی شیعری بە هەردوو زمانەکە هەیە.

## مەلا رەئووف سائیب

لە ساڵی ١٨٧٥دا لە سلێمانی هاتووەتە دونیاوە و لە ساڵی ١٩٢٠دا لە تەمـەنی (٤٥) ساڵیدا فەرمانی خوای بەجێهێناوە. کوڕە گەورەی مەلا ئەحمەدی سائیب و برای جەمیل سائیب بوو. بوو بە قازیی چوارتا. ئەمیش شاعیر بوو.

## عارف سائیب

برای جەمیل سائیبە. سـاڵی ١٨٩٢ لـە سـلێمانی هاتووەتـە دنیـاوە. قورئـان و ئەدەبی فارسی و خۆشنووسی لە حوجرەدا لە سـلێمانی خوێنـدووە. لـە (موصـل)یش داخلی دەورەی ئایینی بووە. لە دواییدا لەگەڵ سوپای عوسمـانی بـە روتبـەی (بلـووك ئەمینی-ئەمین سـریە) نێـردراوە بـۆ (ورمـێ و مەراغـە و خـۆی و سـەڵماس)، لـەو غەریبایەتییەوە شـیعری لەسـەر دووری و کەساسـی و ژیـانی پـڕ مەینـەتی سـوپای عوسمانی و شەڕ رێك دەخست و دەینارد بۆ سلێمانی، تاکو شەڕ کۆتایی هـات ئەوسـا خۆشی گەڕایەوە. لە کاتی فەرمانڕەوایی شێخ مەحموودا عارف سائیب یەکێك بوو لە گەنجە تێگەیشتووە پێشکەوتنخوازەکان، بۆیە شێخ کردی بە سکرتێری تایبەتی خۆی. هەر لەم کاتەشدا بوو نووسین و شیعر و قسەی خۆشی لە رۆژنامەشـدا بڵاودەکـردەوە، بەڵام بەداخەوە زۆربـەی شـیعرەکانی فـەوتاون چـونکە کـەمێکیان نـەبێت ئـەوانیتری

(*) سەیری بەرگی یەکەمی (مشاهیر الکرد)ی ئەمین زەکی بەگ بکە.

نەنووسیبووەوە. ئـەمیش هـەر بـە دەسـتێکی چـەپەڵ لـەکاتی دەسترۆیشـتنی شـێخ مەحموودی (حەفید)دا، لە دێی (قەرەچەتان) شەوی ١٦ی مانگی مایسی ساڵی ١٩٢٣ کوژرا و هەر لەوێش شاردرایەوە.

نموونەی شیعری لە بابەت (معارف)ەوە:

موحیطی عالەمی ئیمکان ئەڵێی گوڵزاری عیرفانە
لە ساحەی فەن و صەنعەتدا بە تەنها کوردە حەیرانە
هەموو شارێ ترقیی کرد و ڕەونەق پەخشی ئافاقە
سلێمانی غوبار ئالوودە، تا بێ روو لە نوقسانە
لە ئەخلاق و لە ئەفکاردا دەرسی حیرەت بووین
نموونەی نەگبەتین ئەمڕۆ وەتەنمان بۆیە وێرانە
لە علیم و فەن و صەنعەتدا بەجێ ماوین و داماوین
وەتەن وێران و من گریان، خودایە وەختی ئیحسانە
دڵم نایە دوعای مەحوی بکەم چونکە سلێمانی
بە نیسبەت یادگاری خالصی ئەولادی بابانە
٢٢ی نیسان ١٣٣٢

بەڵام ئەو پارچە شـیعرەی کـە لـە (جەبهـە)وە ناردوویـەتی لـە ئێـران کـە بـە عەسکەری عوسمانی چووە و باسی مەینەتی و کوێرەوەریی خـۆی ئـەکات بەدەسـت ناهەمواریی شەڕەوە، بەجۆرێکە شان دەدا لە شانی شیعرەکەی مـەلا حەمـدون کـە باسی سەفەر بەلك دەکات.

عارف سائیب ئەڵێت:

ئاوارەیی خاکی وەتەن سەیر و سەفا خۆم
پامالّی غەم و غوربەت و سەد دەرد و بەلا خۆم
بێ یار و دیار، وەحشی و مەجنوونی بیابان
مەهجووری سەفای مەجلیسی ئەربابی وەفا خۆم

سەرگەشتەیی سەحرایی خۆی و ساحەی سەڵماس
ریسوایی عەجەم، مەسخەرەی شاه و گەدا خۆم
ئەم تالعە نەحسە منی خستۆتە فەلاکەت
ئاشوفتەیی دەستی ستەمی بەختی سیا خۆم
کەوتوومەتە ناو تاقمێ جەندرمە، خوا مەرگ
دوچاری هەزار دەردی سەری و قەهر و سزا خۆم
سووڕدانە، عەرەق خواردنە، کۆڕێکە، مەپرسە
سەرسامی هەزار هەڵهەلە و رەقس و سەما خۆم
رۆژێك خەبەری حەرب و دەمێك مژدەیی سوڵحە
ئوفتادە لەناو دەغدەغەیی خەوف و رەجا خۆم
بێ مەسکەن و بێ چادر و یاغمورلغ و یاتاغ
عوریان و پەرێشان بە مەسەل گورگی چیا خۆم
باران و قوڕ و وەحشەت و سەرمایە بەهەرجا
پامالّی دەستی شیدەتی بەفر و رەشەبا خۆم
دوو مانگ دەبێ نەمدیوە سەفای بەزمی پلاّولغ
دەرناچێ لە دڵ هەر بە ئومێد و بە تەما خۆم
برسی و رەش و رووت، چڵکن و بێ پارە و و تووتن
حەسرەتکەشی دوو قوم جگەرە و پیالّەیە چا خۆم
وا دام دووریوە پینە لەسەر چاکەت و شەڵوار
گۆڕاوە سەر و سوورەتی من وەك جلەگا خۆم
نابینی تەراوەت لە رەگی عومر و حەیاتم
ئەلحەق وەکو تووی قۆجە بەبێ بەرگ و نەوا خۆم
کافر بەزەیی دێتەوە بەم حالّە پەشێوە
وا دەربەدەر و قوڕبەسەر و تووشی سزا خۆم
تووکی سەر و ریشم لە غەما بۆز و درێژ بوو

بەم وەزعیەتی ریشەوە وەك خواجە حەنا خۆم
بۆ شاری سلێمانییە فەریاد و فوغانم
دایم لە خەیاڵ و غەم و تەبدیلی هەوا هۆم
بێ شوبهە لەبەر دەرد غەم و قەهر و مەرارەت
مەحرومی سەوابی شەرەف و خێر و دوعا خۆم
بێ تاقەت و بێ ویسعەت و حەیران و پەرێشان
هەر مونتەزیری لوتفی نەبی و فەیزی خودا خۆم
شیعرم وەکو تەبعم کە پەرێشان و خراپە
مەحجووب و سەر ئەفگەندەیی جەمعی شوهەدا خۆم
(عارف) ئەسەری مەرحەمەت و لوتفی خودایە
بۆ مەنفەعەتی دین و وەتەن جان بە فیدا خۆم

## مستەفا سائیب

برای جەمیل سائیبە، لە ٢٥ی مانگی ئابی ساڵی ١٩٠٤دا لە شاری کفری هاتووەتە دنیاوە، چونکە ئەوساکە باوکی لە کفری قازی بووە. کە هاتووەتە سلێمانی چووەتە قوتابخانەی ئەوساکە کە بە تورکی بووە، لە زەمانی ئینگلیزەکانیشدا هەر خوێندوویەتی، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەوسا تاکو پۆلی شەش زیاتر لە سلێمانیدا نەبووە، ناچار دەستی لە خوێندن هەڵگرتووە. لە ساڵی ١٩١٢دا لەگەڵ هادی سائیبی برای کە مدیری ماڵ بووە لە هەڵەبجە، چووەتە ئەوێ و لەوێ بووە بە هاوڕێی عەبدوڵڵا بەگی گۆران و هەندێك لاوی خوێن گەرمیتر، بە دڵ هەوڵیانداوە بۆ پێشکەوتنی میللەت و وڵات، دوای ئەوە بۆ تەواوکردنی خوێندن لەگەڵ گۆران و عەبدولواحید نوری لە کاروان چوون بۆ کەرکووك. لەوێ لەگەڵ قوتابییانیتری کورد کە لە هەولێر و کۆیە و کفرییەوە هاتبوونە ئەوێ کۆششی تەواویان کردووە لە خوێندن و نیشتمانپەروەریدا لە ساڵی ١٩٢٣دا چووەتە بەغدا بۆ قوتابخانەی هەندەسە، لەو ماوەیەدا لەگەڵ چەند گەنجێکی

کەدا لەوانەی بەغدا (کۆمـەڵی لاوان)یـان[*] پێکهێنـا واتـە (لاوانـی کـورد) کـە ئـەم سکرتێری کۆمەڵەکە بوو. ئەم کۆمەڵەیە گەلێك ئیشـی دڵسـۆزانەی کـرد. لـە پشـووی هاوینیشدا کە دەچووەوە بۆ سلێمانی لە قوتابخانەکەدا دەرسی داوەتەوە، بەتایبـەتی کـە (زانستی) کرایەوە، مامۆستا سائیب مەردانە چووە پێشەوە بۆ یارمەتی و کۆشش لەگەڵ قوتابخانەکاندا. لـە سـاڵی ١٩٢٦دا کـە قوتابخانـەی تـەواکرد گەڕایـەوە وڵات بـوو بـە ئەندازیار لە دائیرەی ئەشغال، هەر لەم کاتەدا بوو لەگـەڵ چـەند هاوڕێیەکـدا کۆمەڵـەی (زەردەشت)یان[] پێکەوەنا کە هەر ئەم (معتمد)ی بوو. لە ئەندامـەکانی ئـەم کۆمەڵـە شێخ مەحموودی حەفید و شـێخ سـەلامی شـاعیر و عەبدولواحیـد نـووری و شـەوکەتی عەزمی بابان و هەندێکیتر بوون. لە سـاڵی ١٩٢٨دا کـە ئینگلیزەکـان ویسـتیان شـێخ مەحموود لە دژی حکوومەت راستکەنەوە، کۆمەڵە شێخ مەحموودی تێگەیاند کە ئەمـە هیچ سوودێکی تیا نییە، تەنیا بۆ ئینگلیزەکان نەبێت، ئەویش لە شوێنی خۆی نـەجولا. دوای ئەوە لەسەر ئیشکردن و سیاسەت مستەفا سائیب گوێزرایـەوە بـۆ رەوانـدز، دوای ئەویّ بۆ موسڵ، لە دواییدا بۆ بەسرە و لە ساڵی ١٩٣٠دا بۆ حیللە و لەوێوە بۆ بەغدا.

لەم کاتـەدا بـوو لەگـەڵ تـاهیر بەهجـەت مەریوانیـدا لـە بەغـدا دەسـتیان کـرد بـە زیندووکردنەوە و لە چاپدانی دیوانی شیعری شاعیرەکان و گەلێك نووسینی بەنرختر کـە بـە زنجیرەیەك دەرچوو بەناوی (کوردی و مەریوانی)یەوە[]، کـە یەکـەمیان مامۆسـتا سـائیب بوو. دوای ئەوەش هەرگیز لە خزمەتی گەل و وڵات درێغیی نەکردووە و هەمیشـە پێشـڕەو

---

(*) سەیری (رۆشنبیری نوێ)ی ژمارەی ٣٩ نەورۆزی ساڵی ١٩٧٥ لاپەڕە (١) بکە، (مێژوویەکی لەبیرچووەوە-کۆمەڵەی لاوان) بە قەڵەمی جەمال بابان.

() سەیری گۆڤاری (بەیان) ژمارە ١٩ی تشرینی دووەمی ١٩٧٤ لاپەڕە (٨) بکە (لە بابەت کۆمەڵەی زەردەشتەوە) بە قەڵەمی ئارام.

() سەیری نووسینێك بکە لەسەر (تاهیر بەهجەت مەریوانی) لە رۆژنامەی هاوکاری ژمارە (٢٣٨ی رۆژی ١٩٧٤/١٠/١١) بە قەڵەمی جەماڵ بابان.

بووە، ئێستا خانەنشینە لە بەغدا و بەو مووچەی تەقاعودییەی کە هەیەتی گوزەران دەکات و ژنیشی نەهێناوە.

مامۆستا (کوردی) یاخود (زەکی) یاخود مستەفا سائیب نووسەرێکی قەڵەم رەنگین و (باحث)ێکی وردکار و پیاوێکی قایمکارە، نووسراو و وێنە و کتێبی بەنرخی گەلێك لە خزمەتدا هەیە(*).

مستەفا سائیب یەکێك بوو لەوانەی لە گرەوەکەی رۆژنامەی (پێشکەوتن)ی ساڵی ١٩٢٠دا بەشدار بوون، بە نووسینێکی بەنرخ لەژێر ناوی (بۆ چرووکێك)دا(□) پاداشتی دووەمی وەرگرت و هەر لەو رۆژنامەیەی ئەو ساڵەدا بڵاوکرایەوە. زۆری هەست و خواستەکانی لەم بۆچرووکەدا (رەمزی)ن و زیاتر مەبەستی نەتەوە و وڵاتەکەیەتی. بەکورتی مام مستەفا گەنجینەیەکی بەنرخ و ماڵە و ماڵە، بەڵام لە هەمانکاتدا سەربازێکی نەناسراوە و هەرگیز خۆی دەرنەخستووە، لە هیچ شوێنێکدا ناوی خۆی نەبردووە.

جلال سائیب، هادی سائیب، ئەنوەر سائیب هەرسێکیان برای خوالێخۆشبوو جەمیل سائیبن، هەموو بەرهەمی ئەدەبی و مێژوویيان هەیە، ئێستاش دەستخەتێکم لایە کاتی خۆی خوالێخۆشبوو جەلال ئەفەندی دایمێ، کە لە مێژووی کورد دەدوێ و ئەویش لەکاتێکدا دەستی کەوتبوو کە لە ناوچەی بادیناندا قائیمقام بوو، ئەو دەستخەتە گەلێك بە کەڵکم هاتووە، لە وردکردنەوە و (مراجعات)مدا.

## شەماڵ سائیب

---

(*) (متن)ە ئەسڵییەکەی (لە خەوما) بە قەڵەمی جەمیل صائب لای ئەم بەڕێزە بوو.

(□) بە پێویستی نازانم ئەم بۆ چرووکە لێرەدا بڵاوبکەمەوە چونکە شوێنی ئەو نییە. جگە لەوە کە لە (رۆشنبیری نوێ)ی ژمارە (٢٤ی رۆژی ١٩٧٤/١٠/٢١)دا، بە قەڵەمی جەماڵ بابان بڵاوکراوەتەوە.

ئەمیش گەنجێکی هەڵکەوتووی بەنرخە بەتایبەتی لە گۆرانی و مۆسیقادا و ماستەری لە ئەمەریکا وەرگرتووە، کوڕی جەلال سائیبە.

## ریالیزمی رەخنە لە کوردەواریدا

هەندێك بەروبوومی ئەدەبی هەن نرخیان هەر لەوەدا نییە کە ئایا لە رووی رۆشنبیری و هونەرەوە بایی چەندن و چەند نین و تا چ رادەیەك لە دنیای خەیاڵ و هونەری ئەدەب و پەروەردەی زەوقدا دەوری کاریگەر دەگێڕن، بەڵکو نرخی راستیان لەوەدایە کە بەڵگەی زەمان و چەرخی خۆیان و بەوردی چرای رەخنە ئاڕاستەی کەلێن و قوژبنی تاریکی کۆمەڵەکەیان و ئەو قۆناغە دەکەن کە پێیدا رۆیشتوون، وەك ئاوێنە رووداو دەخەنە روو.

## ئەی ئەدەب ئاوێنەی ژیان نییە؟

بۆ نموونە نووسینەکانی ئەلکسەندەر دۆماس و شارلز دیکنز و مەکسیم گۆرکی، ئەمانە هەموو پەردە لە رووی دەورێك هەڵدەماڵن کە خاوەنەکانیان تیایدا ژیاون. ئەگینا نووسەر مادەکەی لە کوێوە دەهێنێت لە رووداوی دەوروپشتییەوە نەبێت کە بە چاوی خۆی دەیبینێت یا بە گوێی خۆی دەیبیستێت بەجۆرێك کار دەکاتە سەر دەروون و ئەودیو دەروونیشەوە.

بەداخەوە تا ئەم دواییە لە کوردەواریدا کارێکی ئەدەبی ئەوتۆ سەری هەڵنەداوە کە گرێی رووداوی رۆژێك لە رۆژەکانی مێژوومان بۆ بکاتەوە و چمکێکمان بۆ دەرخات، بەو شێوەیەی کە لەناو میللەتانی دەوروپشتماندا هەیە. بۆیە ئەوەی هەبێت بە دانسقە دادەنرێت، بەتایبەتی ئەگەر ئەو بەرهەمەش لە خۆیدا، شتێك بێت.

لای خۆمان ریالیزمی رەخنە Critical Realism بە شیعر لە زەمانی ئەحمەدی خانییەوە (١٦٥٠ – ١٧٠٦) دەستی پێکرد(*) و بەرە بەرە پەرەی سەند لە

(*) ئەگەر زیاتر وردی بکەینەوە لە زەمانی بابا تاهیری عوریاندا بە شیعر هەبووە (٩٣٥ – ١٠١٠) جگە لەوەی رەخنە لە فۆلکلۆردا زۆرە کە مێژووەکەی نازانرێت.

زەمانی حاجی قادری کۆییدا (١٨١٦ – ١٨٩٧). ئینجا شاعیرەکانمان (پیرەمێرد، زێوەر، بێکەس، سەلام، جگەرخوێن...) پەیڕەویان کرد، بەڵام بە چیرۆك (ڕۆمان) یاخود سەرگوزشتە، ڕەخنە ئەوەندە برەوی نەبووە، چونکە هونەری چیرۆك نووسین وەك شیعر سەری هەڵنەدابوو یاخود شان بە شانی ئەو نەڕۆیشتووە.

لەم بابەتەوە لە ساڵەکانی بیستدا ئەم (لە خەوما)یەی لەمەڕ خۆمان و (مەسەلەی ویژدان)ەکەی ئەحمەد موختار جافە جگە لە چیرۆکی زۆر و زەبەند لە فۆلکلۆردا کە نەنووسراوەتەوە.

لە ساڵەکانی دواییتریشدا مامۆستایان حوزنی موکریانی و شاکیر فەتاح و ئیبراهیم ئەحمەد، لە چیرۆکدا پێشڕەو بوون.

لە خەوما یەکێکە لەو کارە ئەدەبیانە و بەشێوەیەکی ساکار و نەرم و لەسەرخۆ (دەوری حوکمی شێخ مەحموودی حەفیدی لە سلێمانی) خستووەتە بەر ڕۆشنایی و بەرچاوی خەڵك. هەرچەندە زۆر کەس دەڵێن کەوا (تەنها لایەکی ئەو دەورەی گرتووە نەك هەموو لایەنەکانی، واتا تەنیا لایەنە سلبییەکەی یاخود تاریك و کاڵ و کرچەکەی گرتووە نەك هەموو سەرێکی) کە ئەمەش ڕاستە و بێگومان هۆی تایبەتی خۆی هەیە، وەك لە دواییدا ڕوونی دەکەینەوە، بەڵام ئەگەر ئێمەش ئاوڕێك لەو ڕۆژانە بدەینەوە و بە ئینساف و وەك خاوەنی ویژدان سەیری لایەنە (باشەکان یاخود ئیجابییەکان یاخود ڕوونە پێشکەوتووەکان) بکەین، ئایا چی دەبینین، بەداخەوە شتێکی ئەوتۆ نابینین کە بتوانین بەرگری لەو دامودەزگایە بکەین. بەڵێ من ئەو دەورەم بە چاوی خۆم نەدیوە و تیایدا نەژیاوم، کە ئەمە کارێکی زۆر دەکاتە سەر بیر و هۆشی نووسەر، بەڵام ئەو دەمەش ئەوەندە دوور نییە لێمانەوە و بە سەدان پیاوانی دونیادیدە و ئاغر و ڕاستگۆی ئەوسا، هەموو شوکر تا ئێستا ماون تاڵی و ناخۆشی ئەو سەردەمەیان هەموو چێژتووە. ئەوی خەتا و ئەنجامی ئەو بارە شێواوە ناهەموارەش بخاتە سەر شانی تەنیا شێخ مەحموود خۆی، زوڵمێکە لەو پیاوە دەکات.

کەوابوو نرخ و هونەری ئەم کارە ئەدەبییە، تەنیا لـە دەرخسـتنی کـەل و قـوژبنی تاریك و هەرد و نشێو، و گۆمە بۆگەنەکان و زەلکاوەکانی زەمانی شێخ مەحموود دایە و بەس، بەڵام زیاتر بەشێوەیەکی رۆژنامەچییانە و ریپۆرتاج (چونکە کاکینە خۆی بـە رۆژنامەچییەتی دەستی پێکرد و هاتە کـۆڕەوە) نـەك وەك چـیرۆك نـاوی پاڵەوانـەکان بهێنێت یاخود ناویان لێ بنێت و لایەنی لێکدانەوە و (تحليل) بگرێت. بۆیە لەم رووەوە من (مەسەلەی ویژدان) بە باڵاتر و سەرکەوتووتر دادەنێم، بەڵام لە هەندێك روویـترەوە ئەم لە پێشترە وەك لەمەودوا بۆمان روون دەبێتەوە.

## دەوری شێخ مەحموود

شێخ مەحموود دوو جار حوکمی سلێمانی کرد، یەکەمجار لـە مـانگی تشـرینی دووەمی ساڵی ۱۹۱۸وە تاکو مـانگی حـوزەیرانی ۱۹۱۹ (شـەڕەکەی دەربەنـدی بازیان) و گیرانی شێخ بە دیل. دووەمجار لە ئاخر و ئـۆخری سـاڵی ۱۹۲۲وەوە تـا مانگی تەمووزی ۱۹۲٤ کە هێزی ئینگلیز سلێمانیی داگیرکـرد. گومـانی تێـدا نییە کەوا کۆمەڵە زروفێکی ناو شار و ناو کـورد خـۆی و دەوروپشـت و هـەموو جیهان دەوری حوکمی شێخیان دابوو کە لێرەدا ماوەی درێژەپێدانیان نییە. دیسان گومانیشی تیا نییە، کەوا شێخ مەحموود خۆی پیاوێکی بە ئایین و راست و ئازا و نیشتمانپەروەر و دڵسـاف و داوێنپـاك بـوو، بـەڵام لـە هـەمان کاتـدا پیـاوێکی خۆشباوەڕ و عەشایەری و نیمچە خوێنـدەوار و کـەم تەجروبـە بـوو لـە مەیـدانی سیاسەت و درۆ و دەلەسەی ناو دەوڵەتاندا. جگە لـەوەی هـەموو جـۆرە کەسـێك دەوریان دابـوو، لـە کـوردی پـاکی نیشـتمانپەروەر و ئینگلیزخـواز و جلخـواز و تەماعکار و خۆپەرست. هەریەکە بەلایەکدا رایدەکێشا و هەر کەسە لە ئاشـێکی دەکرد. شێخی دڵپاك و بەدین و دوو دڵ بەدەستیانەوە گیری خواردبوو، هـەر رۆژە لەسەر رایەك و هەردەمە بەجۆرێك دەجولایەوە. پیاوی خراپ و خۆپەرست و چـاو لە دوو سەرکەوتووتر بوون. پەرژینێکی سفتیان لە دەوری تـەنیبوو. ئـەمیش لـە

ئەنجامی فڕوفێڵ و تەڵەکە و دەستبڕیندا بڕوای بە ئینگلیز نەمابوو. ئەوەندە تێگەیشتبوو لێیان کە هەموو کردەوەیەکیان و گشت جولانەوەیەکیان بەرژەوەندی پیرە ئیمپڕیالیزمی تێدایە.

ئەمانە هەموو تێکەڵاو بووبوون و بەرەنگاری شێخ دەبوون، بەڵام لە هەمان کاتدا پیاوی راست و پاك و دڵسۆزیشی هەبوو، هەرچەندە دەفیان دەنگی نەدەدا، جگە لەوان خەڵکی سلێمانی بەتایبەتی و کورد بەگشتی، گەلێك قوربانیاندا و فیداکارییان زۆربوو، خۆیان بەرامبەر بە گرانی و قاتوقڕی، راو و رووتی عوسمانییەکان و زوڵم و زۆریان، بۆمبا بۆردوومان و ئاگربارانی ئینگلیز و زۆر کارەساتی سەختیتر راگرت.

بەڵگە بۆ ئەوانەی باسکردن یاداشتەکەی خوالێخۆشبوو رەفیق حیلمییە کە ئاوێنەیەکی روونە بۆ تاودانەوەی باری ئەوسای حوکمڕانی شێخ مەحموود، کاروبار چۆن دەڕۆیشت و کی ئاشوەستابوو؟

مامۆستا رەفیق حیلمی دەڵێت: ((شێخ مەحموود دوای ئەوەی بوو بە حوکمداری کوردستان کەوتە وەستاوێکی گرنگەوە، لە کاروباری حکوومەتدا کەم تەجروبە و لە مەیدانی سیاسەتدا بێکەس بوو..))(*) دوابەدوای ئەوە دەڵێن: ((ئازایی و بێ ترسی و کەمتەرخەمی خۆشی لەو هۆیانە بوون کە بە هەڵەی بەرن. لەبەر ئەمە بەختی زوو رووی کردە کزی، چونکە رێوشوێنێك کە لە هەڵسووڕاندنی کاروباری عەشایەریدا لەسەری رۆیشتبوو، بۆ تەکبیر و رای ئیشی حکوومەت بە کەڵك نەئەهات، ئەوانەی کە لە حوکمدا نزیك ئەبوونەوە، لەم بابەتە بوون. دەستوپێوەندی نەفام و نەخوێندەوار، دەوروپشتی چاوبرسی و دوای تالانکەوتوو، نۆکەری خەنجەر لە پشت و عەشایەری تفەنگ لە شان...))(□)

---

(*) یادداشت، بەرگی یەك، بەشی یەك، لاپەڕە ٦٧.

(□) هەر ئەو بەرگ و بەش و لاپەڕەیە.

لێرەدا پیاو ئەو مەسەلە عەرەبییەی بیر دەکەوێتەوە کە دەڵێت (ما أشبه الليلة بالبارحة).

یەك دوو پەڕە دوای ئەوە دەفەرمووێت: ((...هەرچەندە لە بەغدا و تورکیاوە هەندێك لە زابتە کوردەکان هاتبوونەوە سلێمانی و لەو سەردەمەدا هەندێ خوێندەواری باش و نیشتمانپەروەر لەوێ بوون و دەیانویست کە تێبکۆشن و یارمەتی جوکمدار بدەن، بەڵام رێکەوتنی تاقمی دەوروپشتی حوکمدار و ئەمانەیتر نەئەگونجا و تاقمی یەکەم لە بەینی حوکمدار و تاقمی دووەمدا، لە خەنجەر و دەمانچە دیوارێکی دروستکردبوو، ئەگەر حوکمدار بیویستایە ئەم دیوارەی دەڕووخاند، بەڵام نەترسان لە دواڕۆژ و ئازایی و کەمتەرخەمی و گرێی نەفسی کە بەرامبەر بە زابت و منەوەرەکان پەیدا کردبوو، بەرهەڵست بوو... عیزەتی فاتە و فایقی تاپۆ کە توانیبوویان لە شێخ مەحموود نزیك بکەونەوە، تا بەینێك (کاتم أسرار)ی بوون، زوو لێی جیابوونەوە. زۆریتریش بە تەمابوون کە تا سەر لەگەڵ شێخ مەحموود بن و بەبێ درۆ یارمەتی بدەن، بەڵام داخەکەم ئاواتەکانیان نەچووە سەر)) تاکو دەڵێت: ((..لەمەش جێی داختر ئەوە بوو کە هەندێك ناڕەسەن و پەسمایە لە ئەهلی شارەکەش بووبوون بە پۆلیس و نۆکەری ئینگلیزەکان و شانازییان بە جاسووسییەوە ئەکرد... نۆکەر بە خەنجەر و دەمانچەوە، دایەن و کەنیزەکان بە هاڕەی خشڵ و هەیاسە و لاگیرەی زێڕینەوە کەوتنە کەشوفش، شەرواڵ و مرادخانی و چەفتە و مشکی سوورمە و ئاوڕیشمی دەستەی شێخان و دەسوپێوەند، دیمەنێکیتری دابوو بە سلێمانی))(*).

جا بۆ ئەوەی خوێنەری ئازیز زیاتر لەزەت لە سەفەرەکەی مامۆستا سائیب وەربگرێت پێویستە چاوێك بخشێنێت بە ژمارەکانی یاداشتدا و بەو کتێبانەیتر کە باسی ئەو دەورە دەکەن.

---

(*) یادداشت، جزمی یەك، بەرگی یەك، لاپەڕە ٦٤.

بۆ نموونە ئەمەش پارچە هەڵبەستێکی شێخ محەمەد خالسی[*] کوڕی شێخ ڕەزای تاڵەبانییە کە لە ساڵی ١٩٢٤دا بۆ مەحموودی ناردووە و چۆنیەتی باری ئەو دەمە دەخاتەڕوو.

لەپاش دامان و پا ماچکردن و عەرزی دوعا خوانی
وەڕین دەست پێدەکا بەچکەی گەماڵی پیری گەیلانی
دەڵێ بۆچی دەرتکردم ئەگەر پاست نەکەم بەخوا
هەموو چەڵتووکەکەت دەخوا بەرازی قوتبی ڕەببانی
یەکانە و پەڵخ و مالۆسی قەوی قوڵی گەلێ زۆرە
بەری ملیان لە کوێ دەگرێ پشیلەی کانی ئاسکانی
لەپاش تالآن و عەزل و لانەواز و خانەوێرانی
حەواڵەی خۆت دەکەم قوربان چلۆن بێم بۆ سلێمانی
لەبەرچاوت وەکو یەك وایە بێ فەرقن لە خزمەت تۆ
شەهێن و حاجی لەقلەق، شێر و ڕێوی، مرشید و جانی
کەر و گا خەرجی بار و جووتە ئێستر ماڵی کاروانە
ئەمانە نابنە کوێخا و رئیس و میری دیوانی
بەیار کێڵان و گای لەڕ، پیر و کچ خوستن، ژن و تەدبیر
سەگ و جۆ، ئەسپ و ئێسك، بۆق و سەردار، جرجی ناوکانی
عەبا و کەر، فێست و ڕێوی، ورچ و شەپقە، مێزەر و مەیموون
حەیا و کوێر، شەرم و دۆم و وەفا و نامووس و سۆزانی
لە کوێت دۆزینەوە ئەم کوێر و عوورانەی لە خوا عاسی
چلۆنت کەوتە خاتر مشکەکوێرەی ورچی کوێستانی
هەموو شێر و پڵنگن وەختی نانخواردن لە ئەترافت

---

(*) کە لە ساڵی ١٩٢٨دا فەرمانی یەزدانی بەجێهێناوە.

سمێڵبابڕ، کفندز، کەللەخڕ، پەرچەم مەریوانی
دوعات با بۆ بکەن ئەمجا، بە تەدبیریان نەکەی زینهار
مەلا و دەروێش و سۆفی و شێخەکانی لوقمە باتمانی
لە رۆژی وا پیاوێك چاترە بۆ تۆ لە دوو سەد کەس
هەزاری لیرەیەك ناکا، دە پارە و پوول و تارانی
لەسەر ئەم میصرەعە لادەم بچم بۆ میصرەعی سانی
بڵێم ئەی پاسەوانی میللەت و رێگەی موسڵمانی
وجوودت فەخرە بۆ من چونکە لای من فەخری کوردانی
نەوەی کاك ئەحمەد و نوتفەی حسێن و شێری یەزدانی
..........................................
(*)..........................................
هەتیو چیت وت زمانت هەڵوەرێ غەڵەتێکی گەورەت کرد
لەلای خۆت شاعیری هێشتا قسەی پیاوانە نازانی
خراپەی چاکەیە، زامی شیفایە، حیدەتی حیلمە
جنێوی فەخرە، تاڵانی عەتایە، عەفوە عنوانی
کەرەمکار و وەفادار وەلی خلووق و عەلی کردار
تەبیعەت چاك، تەبیعەت پاك و پڕ نوور و نوورانی
فەلەك مل شۆڕ نەکا ئەمڕۆ لەژێری پێی کەسێ شێخ مەحموود
مەلەك مەجبوور ئەبوو ئەمڕۆ لە تاعە و حوکم و فەرمانی
ئەوەندەی باری تەعنە کەوت بە ملدا (خالسی) ئەمڕۆ
ئەهاتە خزمەتت قوربان وەلێ زامدارە سەرشانی

(*) دوو بەیتی فارسین بە پێویستمان نەزانی بڵاویان بکەینەوە.

هەر بۆ ئاگاداری و بەڵگەی قسەکانی پێشوومان ئەم پارچە شیعرەی ئەحمەد بەگی ساحیبقڕان (حەمدی)یش دەخەینە پێش چاو کە لـە بابـەت (..ئیـدارەی کوردسـتانی جنووبی ساڵی ١٩٢٣)وە نووسیویەتی(*).

باسی تەشکیلاتی سانی هەر ئەکەم بۆ پێکەنین
کەمترین بوو گەورەتر، هەم گەورەتر بوو کەمترین
ناعیلاجم ئیسم و شوهرەت باس ئەکەم عاجز مەبن
تا ببینن شکلی وەزعییەت بەجارێ قارییئین
(کویلی مولازم) وەزیری خاسەیی قۆڵی یەسار
ئیبنی سەر مزگەوت وەزیری موشفیقی قۆڵی یەمین
کاتبی مابەین بوو (تاهیر) تەرجەمەی حاڵی بکەم
پیس ئەبی دیوان لە پاشا موستەحەقە بۆ دڕین
حەیفە تەعریفی رەشە و عمێ و... دایە نەکەم
ناکرێ، ئەعزان ئەمانە چونکە عزووێکی بەرین
خەزنە کیشەی باخەڵ و مەسرەف، حاجی فەتاح
حاملی سینی حەماڵ و زەرفی پڕ ماشێنی شین
تابعین ئەلوات و هەرزە قاتیل و دز بوو هەموو
ئەهلی ویجدان و شەریف و تێگەیشتوو مونکرین
زابتانی عەسکەری زۆرە و زرە و ئەولا درێژ
هەردوو جلخوار و قلێش و یۆنسی باجی هەمین
ئەمری یومییە هەموو هەر حەپس و زنجیر و جەزا
فیکری لەیلییە هەموو هەر کوشتن و یەغما و دزین

(*) وەك لە دیوانی ئەحمەد حەمدی بەگ ساحێبقرانەوە وەرگێڕاوە، لە بڵاوکراوەکانی نامەخانەی گەلاوێژ چاپخانەی ئەسعەد، بەغدا ١٩٥٧ لاپەڕە ٨٦.

حاکمی شەرع و عەدل و مەحکوومی عالەم مارفەشەل
موخبری سادق بوو کازب سووئی زەن عیلمویەقین
قاوەچی و پێش خزمەتی دیوانی عالی دووسمە
ئەم بوو مەشهووری قولی بوو بەو بوو مەعرووفی شەلین
موحتەرەم مەئمووری تەشریفاتی دەوڵەت بوو
نازری فەرشە رەحە، بۆ خەڵوەتی ئامە ئەمین
جائیزە بۆ میللەت و کوردایەتی بێ رەشبەڵەك
باجی رەحمە بێ قەزابێ نایەڵێ رێك هەڵپەڕین
گەرچی ئێستا مردووە موقعیە باسی هەر ئەکەم
نانەوا گوێڕەپ بۆ شەخسی ئەوەل و مەجلیس نشین
جەردە شێخ... کە مورشید بوو لەگەڵ دەروێشەکان
من کە وامزانی لە کوورەی حەڵقەیی زیکرا فڕین
سەیری سیرەت کەن کە سورەت رووکەشێکی سەفییە
گورگ ئەچێتە پێستی مەڕ زاڵم ئەبێتە پۆست نشین
ناوی جەمعییەت موجاهید بۆ وەزیفە جیا جیا
دەستە دەستە قاتیل و دز بۆ عیبادی موسلیمین
باسی نەفسی خۆی بەفزلە من ئەزانم موختەسەر
ئاشکارە قیمەتی گەورە بە تەعریفی قەرین
ناوی ئەو وەختە بە قانوونی تەبیعەت دانرا
چەرخی چەفیە و زلف و کاکۆڵ دەوری سەرسنگ و سەرین
هاتەدەر بۆ ساڵی تاریخی (کەوا اخر شری) ١٣٤٣ هـ
کەوتە بانەوبان بەیادی (بانە) بوونە قەلفڕین
وا بەحیدەت چاوی هەڵهێنا وەتەن دیسان ئەڵێ
من هیلاکم بۆ خەلەف تۆ چارەجۆی و دووربین

وازحی نالّیی دەوای دەردم بە تەوریەی بلّیٚ
شینە یاسینە دەخیلە جاریٚ یاسین جاریٚ شین
جا دوعاکەم بۆ بکە ئەمما وەکو ویردی زمان
تا سەرا پەردەی فەلەك ماوە هەتا فەرشی زەمین
(رەببی مووی لیٚ بیٚ زمانی پەنجەکانی هەلّوەریٚ
هەر کەسیٚ گولّشەن بەدەردی کولّخەنی دۆزەخ بەریٚ)

## تاقمە سیاسییەکانی ئەودەمە

وەك بە قسەکانی لەمەوپیٚشدا بۆمان دەرکەوت ئەوسا چەند تاقمیٚك هەبوون لە سلیٚمانیدا، کە هەر لایە لەسەر رایەك بوون. هەبون تورکچی و بەناوی سولّتان و ئایینی ئیسلامەوە دابوویانە بەری، ئەو زەمانە (ئۆزدەمیر)یش(*) هیٚشتا بە شاخەکانی رەواندزەوە مابوو هانی دەدان، ئەمانە جلخواریان پیٚدەوتن، هەبوون سەر بە ئینگلیز بەو بڕوایەی (وەك خۆیان بلاویان کردبووەوە) رزگارکەری قەومە بچووکە بیٚ دەسەلاتەکانن لەژیٚر چنگی دەولّەتە گەورەکان، بەلاّم لە دواییدا کە هەموو شتیٚکیان بۆ روون بووەوە، ئەوانیش بایان دایەوە. هەشبوون کوردپەروەر و نیشتمانپەروەر، بۆ پیٚگەیشتن و پیٚشکەوتنی میللەتەکەیان هەولّیاندەدا. کاکینە یەکیٚ بوو لەوانە، هەرچەندە هەندیٚك هەن بە ئینگلیزخوایان دەدایە قەلّەم. ئەگەر واش بوو بیٚت و لە هەوەلّەوە پڕوپاگەندەی ئینگلیزەکان کاریان تیٚکردبیٚت، بەلاّم لە دواییدا ئەویش هەموو شتیٚکی بۆ روون بووەوە و ئینگلیزی ناسی، ئەی لە تاو بۆمباردمانی ئینگلیز ئەویش لە شارەکەی خۆی ئاوارە و دەربەدەر نەبوو؟

---

(*) ئۆزدەمیر یاخود (علی شەفیق) ئەفسەریٚکی تورك بوو لە کەمالییەکان لەناوچەی رەواندز ئیشی پیٚ سپیٚردرا بوو، قسە و پڕوپاگەندەی تاڕادەیەك کاری کردبوو. ئەمە لەکاتیٚکدا بوو کە ئینگلیزەکان هاتبوونە کوردستانەوە، واتە لە سالّەکانی بیستدا.

## بۆمبابارانی سلێمانی

ساڵی ١٩٢٣ ئینگلیز دەستی کرد بە بۆمبارانی شاری سلێمانی، بۆ ئەوە شێخ مەحموودی تیا دەرپەڕێنێت، لە کاتێکدا کە شێخ و دەستە و دایەرەی بەینێك بوو شارەکەیان چۆڵ کردبوو. دانیشتوانی شارەکەش لەتاو بۆمباردمان و لە ترسی راو و رووتی عەشایەر و بەتایبەتی هەمەوەند، ئەوی لە توانایدا بوو سلێمانیی چۆڵ کرد و هەریەکە بەلایەکدا بۆی دەرچوو. شێخیش لە ناوچەی سورداش و لە ئەشکەوتەکانی جاسەنە، بەینێك مایەوە تاکو رۆژنامەی (بانگ حق)یان لەوێ دەردەکرد، ئەوەبوو لەوێشەوە چوون بۆ ناوچەی پێنجوێن، بەڵام شاری سلێمانی بەردەوام یاخود پچڕ پچڕ هەر بەدەست دەستە و دایەرەی شێخ و عەشایەرەوە بوو.

جەمیل سائیبیش یەکێك بوو لەوانەی بەخۆی و ماڵ و منداڵییەوە سلێمانیی بەجێهێشت، چوو بۆ کەرکووك، دوو ساڵێك لەوێ مایەوە تا ساڵی ١٩٢٤ کە حکوومەتی عێراق دامەزرا، ئەوسا ئەویش گەڕایەوە سلێمانی.

## کوشتنی عارف سائیب و جەمال عیرفان

وەك لەمەوپێش وتمان عارف سائیبی برای کاکینە لە دێی قەرەچەتان لە مانگی مایسی ١٩٢٣دا بەدەستی خزمێکی شێخ کوژرا، لە کاتێکدا کە ئەویش هاتبووە دەرەوە لە شار و دابوویە پاڵ لەشکری شێخ، بەڵام بە ناحەق دڵیان لێ پیس کرد کەوا گوایە دەیەوێ بگەڕێتەوە و وازبهێنێت. شێخ وەك دەڵێن ئاگای لە کوشتنی نەبووە و کە خەبەرەکەشی بیستووە پێی ناخۆش بووە. ئەوەتا مامۆستا هاوار دەڵێت(*) ((..وەنەبێ شێخ مەحموود بە کوشتنی عارف سائیب رازی بوویێت، بەڵکو بەپێچەوانەوە کە هەواڵی کوشتنی ئەبیستێ زۆر دڵتەنگ ئەبێ و ئەمری کوشتنەوەی ئەو کەسە ئەدا کە عارف سائیبی کوشتووە و ئەفەرمووێ: رەزا بەگ مەلا عارف

(*)لە (پیرەمێردی نەمر)دا چاپخانەی (العانی) ساڵی ١٩٧٠ لاپەڕە ٧٢.

خۆشەویستم بوو، لە هەموو راز و نهێنیم ئاگادارم ئەکرد، زیرەك و بە جەوهەر بوو، خوا حەمە[*] بگرێت، ئەبێ بکوژرێتەوە)). کەوابوو شێخ ئاگای لێ نەبووە، بەڵام هەرکەس بۆخۆی بوو، خزم و کەسوکار و خۆبەرەوپێش (انتهازی) و چاو لە دووەکان، کاروباریان گرتبووە دەست. جا ئەگەر یەکێك برای ئاوا بەخۆڕایی بکوژرێت چۆن ئەوەی لەبیر دەچێتەوە، بەتایبەتی کە لەوەپێش عارف سائیب سکرتێری شێخ و نزیکترین کەس بووبێت لێوەی، با ئاگاشی لێ نەبووبێت کە ئەمە ئەوسا ساغ نەبووەوە، ئەمە لە لایەك.

لەلایەکیترەوە جەمال عیرفان کە یەکێك بوو لە منەوەرەکان (رۆشنبیرەکان)ی ئەوسا و برای حەبیبە خانی ژنی و دوای ئەویش برای حەپسە خانی ژنی، دیسان لە مانگی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٢٣دا کوژرا، کوشتنەکەی ئەویش هەر درایە پاڵ شێخ و ئیتر ئاگای لێبوو بێت یان نا، هەر ئەو لێپرسراوە چونکە لەکاتی دەسترۆیشتنی ئەودا بووە. ئەمە لە ماوەی ساڵێکدا کە ١٩٢٣ بوو. دوو عەزیز و خۆشەویستی کاکینە کوژران، لە کاتێکدا کە خۆشی ئاوارە و لەگەڵ ماڵ و منداڵیا لە غەریبایەتی دەژیان. بۆیە من گومانم لەوە نییە کە کوشتنی ئەم دوانە کارێکی زۆری کردووەتە سەر دڵ و دەروونی کاکینە و سەرنووسینەکەشی. ئێجگار لەبەر ئەوەی کە بەبێ سوچ و گوناح هەردووکیان کوژران، تەنها ئەوە نەبێت کە تێگەیشتوو (منور) بوون. ئەمە جگە لەوەی کە باری ئەوسای سلێمانی وەك لە چیرۆکەکەدا هاتووە و وەك لە خەڵکی دەبیستین زیاتر لەوە نەبووبێت کەمتر نەبووە کە ئەمانەش هەموو (واقیع)ێکی تاڵ و تفتمان دێنێتە بەرچاو، هەر ئەو (واقیع)ە پڕ ناسۆرەش بوو کە جارێکیتر و بە جۆرێکیتر هاتەوەکایە و دووپات بووەوە.

---

(*) مەبەستی شێخ محەمەدی سەیدە بچکۆڵەیە.

بەڵام لە سەرێکیتریشەوە نابێ هەرگیز ئەوەمان لەبیر بچێت کە شـێخی گـەورە و مەزن هەڵگری مەشخەڵی ئازادی و ئاڵای نەتەوایەتی بوو، دژی ئیمپریالیزمی ئینگلیز بوو کە هەتا ئیشیان بە کورد هەبوو لاواندیان و کـە ئیشـیان نـەما پشـتیان تێکـرد، شێخی گەورە زوو لەم فرۆفێڵە گەیشت، بۆیە رۆژێك لە رۆژان سەری بـۆ دانەنوانـدن و هەمیشە لە خەباتدا بوو لە دژیان و میللەتی کوردیش بە دوایەوە. کـە ئەمـەش بـوو بەهۆی بڵاوکردنەوەی (وعی سیاسی) لەناو کورددا دژی ئیمپریالیزم.

## ڕوونکردنەوەیەکی خەوەکە

پێش ئەوەی لەگەڵ خەوەکەدا بڕۆین حەزم کرد چەند شتێك بۆ خوێنەری بەڕێز روون کەمەوە:

- نووسینەکەی (لە خەوما)م لەبەر دەستخەتی کاکینە خۆی نووسیوەتەوە تەنیا دەستکارییەکی کەمی ڕێنووسەکەیم کردووە و لە هەندێ شوێندا لەسەر ڕێوشوێنی ڕێنووسی کۆڕی زانیاری کورد ڕۆیشتووم تیایا* .

- لە دەستپێکردندا کاکینە دەڵێ: ((...لە دونیادا گیرم خواردووە، ساحێب کولفەت و منداڵ، بێ پول و پارە و دەست سپی و بێ مایە...)) مەبەستی ئەو کاتەیە بە ئاوارەیی لە کەرکوك بوو بێ ئیش و کار لەگەڵ ماڵ و منداڵدا.

- کە ئەڵێ: (...وەختیش ئاخر و ئۆخری پاییزە، سارد و سەرمایە..) وا تێدەگەم مەبەستی پاییزی ساڵی ١٩٢٤ بێت. چونکە ئەو ساڵی ١٩٢٣ چووە کەرکووك، دەبێ شتێکی پێ بووبێت لە سلێمانییەوە لەگەڵ خۆیدا بردبێتی، ئەوەی خەرج کردووە، لە ساڵی دواییدا کەوتووەتە دەستکورتی.

- دەڵێ: (...هەڵسام رووم کرد بۆ بەرەوژوور وتم وڵاتی ئیسلامە) مەبەستی لە کەرکووکەوە بەرەو سلێمانی چوونە.

- دەڵێ: (... ئەو شەو و ڕۆژە بەرەحەتی و بێ قۆرت و ئەمبەر و ئەوبەر هاتین بەڕێوە هیچ سەغڵەتیمان نەدی..) کاروانی ئەوسا بە شەو و ڕۆژێك ئینجا لە کەرکووکەوە دەگەیشتە ناوچەی هەمەوەند. لێرەدا هێشتا نەگەیشتووە، بەڵام کە دەڵێ: (...یاخوا دوژمنی ئیمانت بێ. ئەو ڕۆژە لە سێ چوار لاوە جەردە و ئەشقیا هاتنە سەر ڕێگەکەمان بوو بە تەق و هۆڕی تفەنگ و شەڕ و هەرا...) مەبەستی گەیشتنە ناوچەی هەمەوەند و چەتەکانی ئەو ناوەیە.

---

* ئەم چاپی دووەمە بەگوێرەی ئەو ڕێنووسەیە کە دەزگای ئاراس لەسەری دەڕوات و لە ساڵی ٢٠٠١دا کۆڕی زانیاری کوردستان لە هەولێر پەسندیکردووە.

- بە قسەکانی کابرای خانچیدا، راو و رووتی کاربەدەستان و ئەو کەسانەمان پیشاندەدا کە خۆیان دابووە پاڵ شێخ.

- ئەوسا کە بیانویستایە یەکێك تێوەبگلێنن، بە جاسووسییەت گوناهباریان دەکرد، سەردەمێك دوای ئەوە بە کوردایەتی، ئینجا بە نازییەت دوای ئەوە بە شیوعییەت...

- ئەوانەی کە (وەسف)یان دەکات، هەموو کاربەدەستی ئەودەمە بوون، ئەوانەی لەو کاتەدا ژیابن بە ئاسانی هەموویان دەناسنەوە کە کێ بوون هەروەها ژنەکانیش.

- ئەو خانووەی کە باسی دەکات و ئەمیان تیا بەند کردووە، خانووەکەی ماڵی نەقیبە کە بەرامبەری مزگەوتی گەورەیە.

- چەند هەڵەیەك لە چیرۆکەکەدا هەیە (وەك باسی سەرما و بەستنی ئاو دەکات کە لە دەمەدەمی زستاندا شتی وا روونادات). ئەوانەش شتێکی ئەوتۆ نین لە نرخی کەم بکەنەوە.

- کۆتایی بە خەوەکە نەهاتووە، واتا چیرۆکەکە تەواو نەبووە، بەڵام مەبەستی هەموو داوە بەدەستەوە.

==============================================

(*) ئەم نووسینە لە پێشەکی جەمال بابان وەرگیراوە کە لە کتێبی :جەمیل سائیب، لە خەوما (هەولێر: دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، ٢٠١٠) دا بڵاوکراوەتەوە.

# پێگەی جەمیل صائب لە چیرۆکی هونەریی کوردیدا

پ.ی. د.هیمداد حوسێن بەکر

**پێشـــــەکی:**

ئەم باسە تایبەتە بۆ مێژوو و ســەرهەلّدان و چــەکەرەکردنی فــۆرمی هونــەری چیرۆك ، وەکو یەکێك لە هونەرەکانی پەخشانی کوردی و هونــەرەکانی گێڕانــەوە، کــە ئــەمڕۆ لــە لێکۆلّینــەوە رەخنەییەکانــدا گرنگییــەگی زۆری پێــدەدرێت. بەشێوەیەك ، کە چیرۆك جیا لە هەقایەت و ئەفسانەو چیرۆکی بــەرئاگردان وەکــو ژانرێکی ئەدەبی و هونەریی لێی کۆلّراوەتەوە . هەر لە زووەوە بیرۆکەی نووســینی ئەم باسە لە مێشکمدا دەخولایەوە، ئەوەبوو لەکاتی خوێنــدنی بالاّیشــدا چــیرۆك بووە لایەنێکی هەولّەکانم بەپێویستم زانی زیاتر تیایدا قوولّ ببمەوە، لە ئەنجامدا ئەم باسە هاتە کایەوە .

**رێبازی لێکۆلّینەوەکە:** رێبازێکی وەسفیی- شیکارییە، کە زیاتر بەناخی مێژوودا رۆدەچێت بۆ دەست نیشان کردنی فۆرمی هونەری چیرۆك وەکو ژانرێکــی ســەربەخۆ و بەشێوەیەکی وەسفیش لە چیرۆکەکانی قۆناغی یەکەم و بــە تایبــەتی هەلّوەســتەیەکی خێرامان لەسەر چیرۆکی (لە خەوما)ی جەمیل صائب کردووە .

**سنووری لێکۆلّینەوەکە :** بەشێوەیەکی گشتی لەچوارچێوەی کوردستانی باشووردایە مەگەر پێویستیی باسەکە ئاماژەی ئەو سنوورەی بەزاندبێت، کە ئەویش بــۆ خزمــەتی مەبەست و ئەنجامی باسەکە بووە .

**بنیادی لێکۆڵینەوەکە:** چەند سەرەباسێکی بەخۆوە گرتووە و بەدەوری ئەو تەوەرانەدا دەسوڕێتەوە وەکو فۆرمی هونەریی چیرۆك و پێوەندی بە بەرەو پێشەوەچوونی هەقایەت و چەند بیروڕایەکی جیاواز دەخاتەڕوو، پاشان ئەو هونەرە لە ڕووی مێژووییەوە لای میللەتانی دراوسێی کورد (تورك و فارس و عەرەب) کەی هاتۆتە کایە و گەشەی کردووە و خاڵی هاوبەش و ڕەنگدانەوەی ناوەڕۆکی چیرۆکەکانی ئەوان لە چیرۆکی کوردیدا ئەنجا کێشەی یەکەم چیرۆکی بڵاوکراوە دەخاتە ڕوو بەخێرایی و بەشێوەیەکی وەسفی هەندێ خاڵی درشت دەربارەی چیرۆکەکانی قۆناغی یەکەم و بە تایبەتی چیرۆکی (لەخەوما) دەخاتە بەرباس و لێکۆڵینەوە. لە کۆتاییدا ئەنجامە گشتییەکان بەچەند خاڵێك دەست نیشان دەکات و سەرچاوەکانی بەشێوەیەکی زانستی ڕێزکردووە .

## فۆرمی هونەریی چیرۆك لە ئەدەبی کوردیدا :

هەموو فۆرمێکی تازەی ئەدەبی، کە سەرهەڵدەدات لە ئەنجامی پێویستیەکی ژیاندا دێتەکایەوە، کە ڕەنگە فۆرمەکانی پێش خۆی بەتەواوی نەیانتوانی بێ ئەو بیرە بەرجەستە بکەن. فۆرمی هونەریی لە ڕەخنەگر و لێکۆڵەرەوان لە ڕووی شێوازە هونەرییەکەیەوە بە هونەرێکی ئەوروپی لەقەلەم دەدەن . **د. مارف خەزنەدار** دەڵێ: "چیرۆك هونەرێکی ئەوروپاییە ، پێوستیی ژیان وای کردووە وەکو روخسارێکی هونەری لەناو هەموو نەتەوەکانی جیهاندا بڵاوببێتەوە لە پاش جەنگی جیهانی یەکەم کەوتە ناو ئێمەشەوە"*

(**عومەر مەعروف بەرزنجی**) یش سەبارەت بە فۆرمی هونەری چیرۆك دەڵێ : "دوای جەنگی جیهانیی و هەرەس هێنانی دەستگای عوسمانییەکان نووسەرانی

---

* - د. مارف خەزنەدار، هەندێ لە شیرازەکانی دەفتەری ڕەخنەم، گۆڤاری دەفتەری کوردەواری،بەرگی سێیەم، ل ٥٢ .

کورد ئاشنایەتییەکی سادەیان دەستگیر بوو لەگەڵ نووسینی چیرۆکدا، ئەوەی زیاتریش زەمینەیێکی رەخساری ئامادەکرد و تارادەیێکی سنوور کورتیش پەلی پێهاوێشت جگە لە چاپەمەنی هەستی بەسۆزی رۆشنبیرانی ئەو سەردەمە بوو کە زۆربەیان لە دەرەوەی ولاتەوە گەڕابوونەوە بەدڵێش دەیانویست کە خوێنەرەواران بناسێنن بەم هونەرە بەرزەی رۆژئاوا ....."*

(**حوسێن عارف**) پێی وایە "چیرۆکی هونەری وەك بابەتێکی ئەدەبی تازەی بێگانە هاتە ناو ئەدەبی کوردییەوە" دەستەی دووەمی ئەو توێژەرانە حەکایەتی دەوڵەمەندی فۆڵکلۆری و پەندی پێشینان و لاوك و حەیرانی کوردی دەکەنە بنەمایەك بەڵێ ، ئەمە راستە لە ڕووی ناوەرۆکەوە ، دەکرێ بە بنەمایەکی بەهێز لەقەڵەم بدرێ، بەڵام هەمووشیان لەوەدا یەك دەگرنەوە، کەبەرەو پێشەوەچوونی حەکایەتی فۆڵکلۆری کوردی و تەکنیکی تازەی ئەو هونەرە ئەوروپیە لەرێگەی ئەدەبی میللەتانی دراوسێوە دوای هەرەس هێنانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لەسەرەتای ئەم سەدەیەدا بەناو میللەتانی کورد و عەرەب و فارس و تورکدا بڵاوبۆوە .

**د. عیزەدین مستەفا رەسول** دەڵێ: "ئێستا چیرۆکنووسەکان دوو بنەما لەبەرچاو دەگرن ئەوانیش کەلەپووری جیهانی و حەکایەتی کوردی، هەندێکیان بە وردی و بەدەست رەنگینی ئەم دوو بنەمایەی تێکەڵ کردووە لە چیرۆکنووسیندا هەندێکیشیان پشتیان بەیەك بنەما بەستووە ، بۆیە چیرۆکەکانیان بێ بایەخن" ، هەروەها بەردەوام دەبێ: "کتێبی مەولوودنامەی شێخ حوسەینی قازی ١٧٩١- ١٨٧٠ یەکێکە لە

---

* - عومەر مەعرووف بەرزنجی، لێکۆڵینەوە و بیبلۆگرافیای چیرۆکی کوردی ١٩٢٥- ١٩٦٩ ، ل١٢.

- حسین عارف، چیرۆکی هونەری کوردی ١٩٢٥- ١٩٦٠، بەغدا، ١٩٧٧، ل.١١

٣ - د. عزالدين مصطفى رسول، الواقعية فى الادب الكردى، ص ٢٠٦.

هەروەها: د. عزالدين مستەفا رسول اراء فى القصة الكردية ، عشرون قصة كردية ، منشورات مجلة كاروان (١) ،بغداد، ١٩٨٥ ، ص ١٦٢ .

چاکترین مەولوودنامەکان لە ڕووی شێوەی هونەری و دەرخستنی جوانکاری زمانی کوردی لەناوەڕۆك و شێوازە چیرۆك ئامێزەکەیەوە "*

"**مستەفا سالح کەریم**" یش لەگەڵ ئەوەیە :" بنەمای چیرۆکی کوردی ئەو حیکایەتە میللییانە بووە کە دەماودەم بۆمان ماوەتەوە ..."[] ، ئینجا چیرۆکی عەرەبی بە بەراورد دێنێتەوە و دەڵێ : ئەو حیکایەتە میللیانە بەردی بناغەی چیرۆکی عەرەبیین – پێش کارتێکردنە ئەوروپاییەکە ..."[] .

لە ئەنجامدا دەتوانین جەخت لەسەر هەقیقەتێکی حاشاهەڵنەگر بکەینەوە، ئەویش ئەوەیە، کە فۆرمی هونەریی چیرۆکی کوردی ئاکامی لاساییکردنەوەی فۆرمی هونەریی چیرۆکی ئەوروپییە بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ، واتا راستەوخۆ لە ئەوروپاوە بە ئێمە نەگەیشتووە، چونکە رادەی هۆشیاری و پلەی خوێندەواری لە کۆمەڵی ئێمەدا دواکەوتوو بووە، تەنانەت تا کۆتایی جەنگی یەکەمی جیهانیش ژمارەی خوێندەوار لە باشووری کوردستاندا زۆر کەم بووە و ژمارەی رۆژنامە و گۆڤار و بنیادی رۆشنبیری لاواز و دەگمەن بووە. دیارە کزی و لاوازی رۆژنامەنووسیی و چاپەمەنی، کە زەمینەیەکی بەرفراوانە بۆ بڵاوکردنەوە و بەرەو پێشەوەچوونی ئەم هونەرە ژیارییە و سەردەمیە بۆتە هۆی ئەوەی ، کە میللەتی کوردیش وەکو میللەتانی دراوسێ درەنگ سوود لە فۆرمی هونەری ئەوروپی چیرۆك وەربگرێت. لە زمانی رۆژانە و بابەتی (Theme) ی هەقایەتی فۆلکلۆری و قەدەری پاڵەوان و رێکەوت رزگاری بێت . ئەگەرچی نکۆڵی

---

* - د. عزالدين مصطفى رسول . الواقعية في الادب الكردى، ص.٢٠٦ .

د.شوکریە رەسول، ئەدەبی کوردی و هونەرەکانی ئەدەب ، هەولێر،١٩٨٩ ، ل١٨٥- ١٨٩.

پەرێز صابر محەمەد ، بینای هونەری چیرۆکی کوردی لەسەرەتاوە تا کۆتایی جەنگی دووەمی جیهانی، (نامەی ماجستێر)، ١٩٩٢،ل ٢٠- ٢٤ .

[] - مستەفا سالح کەریم ، سەرەتای لەدایك بوونی چیرۆکی هونەریی کوردی، گ کاروان ژ٣٧، ل١٤ .

[] - سەرچاوەی پێشوو، ل ١٤.

لەوەش ناکرێت، کە چیرۆکنووسی کوردیش پـەروەردەی کۆمەلاّیـەتی کۆمەڵکەیـەتی و کەلەپوور و فۆلکلۆری نەتەوەکەی لە رەگ و ریشەی قووڵی لە بیرکردنەوە و عەقڵی ئەودا جێگیرکردووە و پەنـدی هـیچ وپـووچ و ئەفسـانەی ئـەزەلی مرۆڤـی یەکەمـدا بـەهۆی گرنگیدان بە هەستی نەتەوەیی و لاسایی ئەدیب و چیرۆکنووسانی ناسیونالیستی دراوسێ چیرۆك و ئەدەبیشی کردۆتە هۆیەك بـۆ زیندووکردنـەوە و شـانازی کـردن بـە رابـردوو و مێــژووی نەتــەوەیی خـۆی و چـیرۆکە مێــژوویی و رەخنــەیی و کۆمەلاّیـەتی و بـەها رەوشتییەکان و زمانی رۆژنامەنووسیی لە سیما دیارەکانی ئەو قۆناغەن.

## ئاماژەیەك بۆ چیرۆکی میللەتانی دراوسێ و کوردی:

شتێکی سەیر و رێکەوت نییە، لێکۆڵەرەوە عەرەب وفارس و تورکـەکانیش ئـەوە دووپات دەکەنەوە کە هونەری چیرۆك لە ئەدەبی ئەوانیشدا لە دوو کۆڵەکـەی سـامانی نەتەوایەتی و تەکنیکی هونەریی ئەوروپییەوە دروست بووە. رەخنـەگرێکی وەکـو" د. محمد غنیمی هلال" دەڵێ "سەرهەڵدانی چیرۆك تازەیە ، و لە ئەدەبیاتی ئەوروپاییـە و وەرمانگرتووە"* بەنسبەت چیرۆکی هونەریی عەرەبیش لە عێراقـدا لەسـەرەتای ئـەم سەدەیەدا لەشێوەی خەودا چەند چیرۆکێك بە کاریگەری ئەدەبی تورکییەوە بلاّوکرایەوە و تەرجەمە کرا□. پاشان لەسەر دەستی (محمود احمد السيد) و (عبدلملك نوری) و (فؤاد التکـرلی) زیـاتر گەشـەی سـەند و قـالبێکی هونـەری بـەخۆوە گـرت.□ هەوڵـە سـەرەتاییەکانی چـیرۆکی عـەرەبیش بەچـیرۆکی خـەون ئـامێز دەسـتی پێکـردووە، چیرۆکنووسانی ناوەڕاسـتی بیسـتەکان لەخاڵێکـدا کۆدەبوونـەوە ئـەویش رەخنەیـەکی سیاسی کۆمەلاّیەتیان رووبەڕووی کۆمەڵی ئەو سەردەمە دەکردەوە. ئەوندەی خەریکی

*- الدكتور محمد غنيمي هلال، النقد الادبي الحديث ،ص ٤٦٣.

□- بۆ زیاتر شارەزایی بڕوانە: د. عبدالاله احمد، نشاة القصة وتطورها في العراق ، بغداد، ١٩٦٩ .

□- بڕوانە: علي جواد الطاهر ، محمود احمد السيد رائد القصة الحديثة في العراق ، بيروت، ١٩٦٩ .

گەیاندنی بیر و مەبەست یان ناوەرۆك بوون خەریكی تەكنیكی هونەریی چیرۆكنوسین نەبوون وەكو هونەرێكی ئەدەبیی تازە . سەرەتاكانی چیرۆكی عەرەبی بە چیرۆكی درێژ یان رۆمان دەستی پێكردووە بەتایبەتی وەكو لاسایی كردنەوەی رۆمان و چیرۆكە درێژ و بە زنجیرەكانی توركی، لەم رووەوە چیرۆك و رۆمانەكانی (**سلیمان فیض الموصلی وعطاء امین و محمود احمد السید** ) لەساڵی ١٩٢٠ دا دیار و بەرچاون. ئەم جۆرە چیرۆك و رۆمانانەش بە زمانێكی سادەو دارِشتینێكی ساكار نووسراون و زیاتر ئامۆژگاری و رێ نیشاندانی چاكەو فێركردنن، بەڵام لەرِووی شێوەوە سەرەتای كورتە چیرۆك لە عێراقدا بۆ چیرۆكی (شەهیدی نیشتمان و شەهیدی خۆشەویستی ) چیرۆكنووس (مراد میخائیل) و كۆمەڵە چیرۆكی (نەهامەتییەكان)ی (محمود احمد السید) دەگەرِێتەوە. لەگەڵ بوونی ئەو نموونانەشدا هێشتا لێكۆڵەر و رەخنەگرە عەرەبەكان نموونەی چیرۆكی هونەری راستەقینەی عەرەبی لە عێراقدا بۆ هونەری راستەقینەی عەرەبی لە عێراقدا بۆ سالانی ئەم سەدەیە دەگەرِێننەوە.* سەبارەت بە چیرۆكی توركیش هەروەكو ئەدەبیاتی میللەتانی دی "بەو ئەفسانانە دەستی پێكردووە، كە لەسەر بنەچەی دین و سواچاكی بنیات نراون□، بەڵام هەروا بەو شێوازە رۆژهەلاتییەی خۆی مایەوە" هەتا وەكو چەمكی چیرۆكی نوێ بەشێوە ئەوروپییەكەی دەركەوت و لە بەرەبەیانێكدا كەوتە نێو مێژووی عوسمانییەوە لە ئەدەبی توركیدا بە (سەردەمی رێكخستنەكان) ناسراوە□ ئەمەش لە رێگەی وەرگێرِانەوە بە زنجیرە لە رۆژنامەی (الحوادث) بلاوكرایەوە. بێگومان دیارە وەرگێرِان لەو بارودۆخەدا دەورێكی گرنگی دی لە ناساندنی زمان و شێواز و تەكنیكی چیرۆكی هونەری نوێی ئەوروپی بە ئەدەبیاتی رۆژهەلات لە رێگەی ئەدەبی عوسمانییەوە و لە سەرووی هەمووشیانەوە

---

*- بۆ ئەم زانیارییانە برِوانە : د. عبدالله احمد نشاة القصة و وتطورها فی العراق.

□- اكمل الدین احسان نشاة القصة و وتطورها فی الادب الترکی، مجلة القصة ، العدد العشرون، ص٩٠.

□- سەرچاوەی پێشوو ، ل٩٠.

ئەدەبیاتی فرەنسی و چیرۆکنووسانی فرەنسی کاریگـەری راسـتەوخۆیان هـەبوو. بۆیـە سەیر نییە وەرگێڕانی بەرهەمەکانی ڤیکتۆر هیگۆ و بلـزاك و چـەندین چـیرۆکنووس و رۆماننووسی دی لەو سەردەمەدا لەسەر رووپەڕی رۆژنامەکانی تورکی ئەو سەردەمەدا بڵاودەکرانەوە، هەروەها نابێ لێرەدا ئەوەیشمان لەبیر بچێت ، کـە لـە نێـوان سـاڵانی (١٨٦٠- ١٨٨٠) دا پێشکەوتنی چاپەمەنی و بڵاوبوونەوەی رۆژنامەوانییش رۆڵی لە دروسـتبوونی جـەماوەرێکی زۆری خوێنـەری لـە دروسـتبوونی جـەماوەرێکی زۆری خوێنەری چیرۆکی وەرگێڕدراودا بینی*.

چیرۆکی تورکی لەسەر دەستی (**ئەحمـەد مەدحـەت نەفەنـدی ١٨٤٤ - ١٩١٣ز**) دەستی پێکرد، کە ناوەرۆکی چیرۆکەکانی لە فۆلکلۆری نەتەوەییەوە وەرگرتبوو . ئـەم چیرۆکنووسە بەرهەمەکانی رەنگدانـەوەی کەلـەپوور و فۆلکلـۆری تورکییـە لـە ڕووی ناوەرۆکەوە، لە ڕووی تەکنیکی چیرۆکیشەوە خاوەنی خەیاڵ و فانتازیایەکی بەرفراوانەو زۆرجار درێژدادڕی زۆری پێوە دیـارە و چـیرۆکنووس بـە سـەپاندنی بـیروڕا فەلسـەفی کۆمەڵایەتییەکانی خۆیەوە، لە فەزای چیرۆکەکەی دەچێتە دەرەوە. پاش ئـەم قۆناغـە کۆمەڵەی (ثـروت فنـون) و لەسـەرووی هەموویانـەوە ئـەکرەم مـەحمود رەجـانی زادە (١٨٤٧- ١٩١٤) و تۆفیق فیکرەت و (خالـد ضـیاء) و مەحمـەد رەئـوف و حوسـێن جاهد و ئەحمەد حیکمەت و (صفوت ضیاء) و چەندانی دی بەشێوەیەکی هونەریی نوێ دەیانڕوانیە ئەم هونەرە و لەهەقایەت جیایان کردەوە .

چیرۆك لە ئەدەبی فارسیشیدا بەهەمان شێوەی ئەو میللەتانە لە دوای جەنگی جیهـانی یەکەم توانی لەسەردەستی ( محمد علی جەمالزادە و صادق هدایت و صادق چـوبك و جـلال ال احمد و محمد حجازی..) شێوەیەکی هونەری بەرز بە کارتێکەری ئەدەبی تورکی و ئەویش لە رۆژئاواوە وەربگرێت، کە پێشتر وەکو مۆرکی سەرەکی ئەفسانە و هەقایـەتی خورافـاتی میللی لە مێژووی ئەدەبیاتی فارسـیدا خـۆی دەنوانـد، چـەندین شـاکاری وەکـو شـیرین و خوسرەو و شانامەی فیردەوسی لەناو ئەدەبی فارسیدا و پاشـان بەرهەمـەکانی حـاجی زیـن

*- اکمل الدین احسان، مختارات من القصص القصیره،تقدیم الدکتور پروت عکاشه.

العابدینی مەراغەیی و سیاحەتنامەی ئیبراهیم بەگ و شاکاری نووسەرانی دی بە رەگ و ریشەی قوولی ریالیزمی خۆیان و بە زمانێکی تۆکمە و پتەویان بوونە بەردی بناغە بۆ سەرهەڵدانی فۆرمی هونەریی چیرۆك لە ئەدەبیاتی فارسیدا. لەساڵی ١٩٢٥ دا چیرۆکەکانی محمد علی جەمالزادە "هەبوو نەبوو" و "حاجی ئاغا" ی صادق هدایت بوونە بەردی بناغە بۆ چیرۆکی هونەریی فارسی* . بە بڵاوبوونەوەی کۆمەڵە چیرۆکی "یەکێ بوو ... یەکێ نەبوو" گۆڕانێکی بنچینەیی لە زمان و فۆرمی هونەری چیرۆکی فارسیدا هەستی پێدەکرێ بەتایبەتی کە لە هەندەران لە رۆژنامەی (کاوە) لە بەرلین ئاشنایی چیرۆکی رۆژئاوایی ببوو و کەڵکی لە زمانی گفتوگۆی رۆژانەی خەڵك وەرگرتووەو پاڵەوانەکانی سادە و بێگرێ و گۆڵ دەدوێن. ئەو داهێنانەی جمالزادە کۆمەڵێ نووسەری بە دوای خۆیدا **کێش کرد** (صادق هدایت) یش وەکو پێشەنگی دەستەی یەکەمی چیرۆکی فارسی بەرهەمەکانی خۆی بۆ دژایەتی دەستەڵاتی سیاسی بەکاردەهێنا و زمان و پاڵەوان و بابەتی چیرۆك و نۆڤلێتەکانی رەنگدانەوەی ئازار و ژان و مەینەتیەکانی چینی هەژاری میللەتەکەی بوو، لە هەمان کاتدا بەشێك لە بەرهەمەکانیش بۆ زیندووکردنەوە و شانازی بە مێژووی نەتەوەیی خۆیەوە تەرخان کردووە و بە قولایی مێژوودا رۆدەچێت و دەیکاتە بەرهەمێکی هونەریی سەردەم .

## یەکەم چیرۆکی هونەریی بڵاوکراوەی کوردی:

سەبارەت بە دەست نیشانکردنی یەکەم چیرۆکی بڵاوکراوەی کوردییش بەپێی بیروڕای جیاوازی لێکۆڵەرەوەکان لەمەڕ بنیاتە بابەتییەکانی چیرۆکی هونەری کورد دەگۆڕێت .

---

*- دکتر محمد استعلامی بررسی ادبیات امروز، چ٣ ص ١١٣- ١١٨. هەروەها حسن نکوروح ، نقش واقیعیتهای سیاسی در رمان فارسی، مجله نقد، دفتر دوم ،تهران، ابانماه ١٣٥٧ ، ص٢٥- ٣٧ هەروەها: صادق هیدایەت پێشەنگی ریالیزمە لە ئەدەبی ئێرانی نوێدا، گ رزگاری، ژ٦، س١، ١٩٦٩، ل ٢٣- ٢٥ .

د.عیزەدین مستەفا رەسول مەولوودنامەکەی شێخ حوسەینی قازی (١٧٩٠-١٨٧٠ز) بە سەرەتایەکی ساکار دادەنێت*. ئەم وردە چیرۆکانەی ناو مەولوودنامەکەی لە ڕووی ناوەڕۆکەوە هەموویان ئایینین " لەرووی شێوەی هونەرییەوە هەموو حیکایەتەکان بە دەربڕینی (حیکایەت کراوە) دەست پێدەکەن و یەکسەر بێ پێچ و پەنا دەچنە ناو بابەتەکە و ڕووداوەکان دەخەنەڕوو و ئەنجامەکەش دەدەنە دەست"□ دەرکەوتنی رۆژنامە و گۆڤار و چاپەمەنی لە کوردیدا دەورێکی گرنگی گێڕاوە لە چەسپاندن و گەشەسەندنی زۆریی هونەری پەخشان کە چیرۆکیش یەکێکە لەو هونەرانە. بۆیەکەمجار لە گۆڤاری (رۆژی کورد) دا چیرۆکێك لەلایەن (فوئادی تەمۆ)وە بە ناوی (شویش) لەساڵی ١٩١٣ دا بڵاوکراوەتەوە.□ بۆ چیرۆکی کوردیش لە کوردستانی باشووردا دەتوانین ئەو گرەوەی کورتە چیرۆکانەی لە رۆژنامەی "پێشکەوتن ١٩٢٠- ١٩٢٢" دا بڵاوکراونەتەوە بە سەرەتایەك دانێین بۆ دەرکەوتنی چیرۆکی کوردی.□ ساڵی ١٩٢٥ ئەو ساڵەیە کە زۆربەی لێکۆڵینەوەکان بەسەرەتای چیرۆکی هونەریی دادەنێن،بەڵام کام چیرۆك؟ رەوف حەسەن چیرۆکی (بۆچی جلخوارم) بەیەکەمین چیرۆکی کوردیی بڵاوکراوە لە کوردستانی باشوور دادەنێ. ** ،بەڵام زۆربەی ئەوانی

---

*- بڕوانە د.عیزەدین مستەفا رەسوول، ناوەرۆکی سیاسی و کۆمەڵایەتیی چیرۆکی کوردی، گ کاروان، ژ ١٩، ل ٧ .

□- پەرێز صابر محەمەد ، بینای چیرۆکی کوردی ل٢١.

□- فواد تمو،گ رۆژی کورد ، ژ١ ، ١٩١٣، ل ٢٥- ٢٧،ژ ٢ ١٩١٣ ،ل٢٤-٢٥.

□- بۆیەکەم جار لە رۆژنامەی "پێشکەوتن" دا گرەوێك بۆ نووسینی کوردی پەتی لەلایەن (مێجەرسۆن)ەوە بۆ نووسەرانی کورد سازکرا، لە ئەنجامدا شێخ نوری شێخ صالح بە نووسینی (جووت و گا شتێکی چاکە) پاداشتی یەکەمی وەرگرت و مستەفا صائب پاداشتی دووەم و جمیل صائب پاداشتی سێیەمی وەرگرت، بڕوانە، رۆژنامەی "پێشکەوتن" ژ ٣٠، س١، سلێمانی ، ١٩٢٠،ل٢٤.

**- رەوف حسن، سەرەتای چیرۆکی کوردی و جیاوازی نێوان یەکەم چیرۆکی و دووەمیان گ نوێ ژ ٦٩ ، ل ١٥.

بێ چەند و چۆنی چیرۆکی (لە خەوما)ی جەمیل سائب بە سەرەتای چـیرۆکی هونـەری کوردی دادەنێن ،* ئەگەرچی ئەوانەی لە رۆمانی کوردیش دەکۆڵنەوە لە کوردسـتانی باشوور لەگەڵ چیرۆکی (مەسەلەی ویژدان) ی ئەحمەد موختار جـاف بـە سـەرەتایەکی کاری رۆماننووسـی دادەنـێن. بۆیـە بـەهۆی تێکـەڵاوی ژانـرە ئەدەبییـەکان لەلایـەن لێکۆڵەرەوە کوردەکانەوە بواری لێکۆڵینەوەکانیان تێکەڵاو کردووە ، کە لێکۆڵینەوە لە سەرەتا و سەرهەڵدانی چیرۆك هونەریی کـوردی بۆتـە کـارێکی قـورس" د. فـەرهاد پیربالْ سەرەتایەکی دیکەی بۆ چیرۆکی کوردی دەست نیشان کردووە و دەڵێ: (چـیرۆکی مەم و زین نوسراوی مەلا مەحمودی بایەزیدی ، کە لە هاوینی ١٨٥٦ بـە دیـالیکتی کرمانجی چیرۆکی کوردییە لە مێژووی ئەدەبیاتی کوردیدا ) . نووسەر لەو رایـەدا ورد نییە، چونکە هیچ جیاوازییەکی لە نێوان چیرۆکی هونـەری و هەقایـەتی فۆلکلـۆری و میللیدا نەکردووە، ئەگەر بۆ ئەو سەرەتا هەقایەت ئامێز و ئەفسـانەییە بگەڕێینـەوە، ئەوا مێژووی چیرۆکی نەوەکو هەر کوردی هی هەموو گەلان بەقەد مێژووی مرۆڤ خۆی کۆنە. لەلایەکی دیکەوە ئەم چیرۆکە نووسەرەکەی خۆی ئاماژەی بۆئەوەی کـردووە کـە کورت کراوەی چیرۆکی (مەم و زین) ی (خانی)یە و لەسـەر داخـوازی (ئەلیکسـەندەر ژابا) وە نووسیویەتییەوە .

نووسەری چیرۆکەکەیش لە ڕووی ڕۆشنبیرییەوە شارەزا نەبووە و تەنانـەت مێـژووی کورد دەگەڕێنێتەوە سەر عارەب و ئەجندە. جا دەبێ چەند شارەزای دونیای بەرفراوان و ئالۆزی چیرۆکی هونەری بووبێت .

---

*- د. عزالدين مصطفى رسول،الواقعية فى الادب الكردى، ص٢٠٦ .

الدكتور معروف خزندار، القصة الكردية، مجلة الثقافة الجديدة ، العدد ٢، ايار ١٩٦٩ ، ص٩٤.

- فاضل ئەحمەد ، سەرەتای پەیدابوونی چیرۆکی کوردی گ بـەیان ژ٢٩ ، بەغـدا ١٩٧٥ ، ل١٥ .

حسين عارف ، چیرۆکی هونەری کوردی ١٩٢٥-١٩٦٠، بەغدا، ١٩٧٧، ل١٥.

- د. فەرهاد پیربالْ ، مەم و زینی مەلا مـەحمود بایەزیـدی یەکـەم چـیرۆك لـە مێـژووی ئـەدەبی کوردیدا،گ ،کاروانی ئەکادیمی ، ژ١ ،ب١، ل٥٢ .

## دەربارەی ناوەرۆك و تەکنیکی چیرۆکەکانی قۆناغی یەکەم :

چیرۆکی (لە خەوما)* بەشێوەی ریالیزمی رەخنەگرانە (الواقعیە الانتقادیە) ناوەرۆکەکەی دەخاتەڕوو. کابرای (خەوبینەر) شارەکەی بەجێ دەهێڵێ و روو لە شارێکی دی دەکات بۆ کاسبی و کارکردن. بەڵام لە رێگا یان لە سنووری شارەکەی دی تووشی چەرمەسەری و گیروگرفتی خۆی دەبێ ، هەروەها لایەنێکی دیکەشمان بۆ دەخاتە ڕوو ئەویش بلاوبوونەوەی دزی و جەردەیی و بەرتیل وەرگرتنە ، کە لە سایەی حوکمی شێخ مەحموودەوە بەناو کۆمەڵدا بلاوبوونەتەوە . ناوەرۆکی چیرۆکەکە مەسەلەیەکی سیاسییە و مەبەستی نووسەرەکەی تاوانبارکردنی حوکمی شێخ مەحموودی نەمرە ، لەڕووی بنیات و تەکنیکی هونەریشەوە چیرۆکەکە (ئەگەرچی تەواویش نەکراوە) هەست بەیەك لەدوای یەکی رووداوەکان و زمانی هونەری چیرۆکنووسین و گێڕانەوەی ئاسایی دەکرێت ، دوو پاڵەوانی سەرەکی لە چیرۆکەکەدا بەدی دەکرێت ، کابرای خەوبین و دەستەڵاتدار ، کە خۆی لە کەسایەتی نووسەر خۆی و شێخ مەحموودا دەبینێتەوە نووسەر چەندین دیمەنی عاجباتی دێنێتەوە (بۆ خەلەتاندن و چەواشەکردنی خەڵك هەڵی بەستووە ، ئەوەش هەر بۆ ئەوەی ئەوە بسەلمێنێ ، کە دەستەلاداریێتی شێخ مەحموود نارەوابووەو دەبوایە بڕووخێ.)[] تەکنیکی چیرۆکەکە لە چەند روانگەیەکەوە تیشکی دەخەینە سەر ، دیالۆگ ، وەکو تەکنیکێکی کۆنی چیرۆك بەدی دەکری ، ئەگەرچی **نیشانەی تایبەتی** وەکو (-) ی بۆ دانەنراوە ، بەڵام خوێنەر دەزانێ وەکو (لە خانچیەکەم پرسی وتم ئەم شیوەن و گریانە چیە ؟ وتی ئەوە هیچێکی وانییە . ل ٣٥) . مەنەلۆگ ، بەهەمان شێوەی دیالۆگ بەدی دەکرێ وەکو : (منیش لە دڵی خۆما وتم ئیشی ئێرە وادیارە

---

*- جەمیل صائب ، لەخەوما ، پێشەکی جەمال بابان، بەغدا، ١٩٧٥.

[]- د. جمشید الحیدری ، تاریخ تطور النثر الفنی الکردی العراق (موجز رسالة دکتوراة)، مجلة دراسات کردیة،ع ١ ، س١، باریس، ١٩٨٤، ص٨٦.

هەمووی عبارەتە لە خەڵك روتاندنەوە و شتی باش و بەقیمەتی ئەم و ئەو زەوت کردن و بەبەرتیل هەتیو و مەتیوە و لەسەر ئیشی زل و گەورە دانان ... ل ٤٧) وەسفی سروشت ، سیمایەکی دیکەی چیرۆکەکەیە لە پێناو زیاتر قووڵ بوونەوە بە رووداو و کاریگەری لەسەر دەروونی پاڵەواندا ، وەکو : (دنیا لە پاش نیوەڕۆ بە هەور و هەڵاڵ ، کزە بایەکی زۆر ساردی ئەهات ، جار جار برووسکە و چەخماخەی ئەدا پاش عەسر تنۆکە تنۆکە دایکردە باران. (ل٣١) یان لە وەسفی خانەکەدا بۆ یەکەمجار گەیشتنیٚ بە وشە و رستەی کورت کە یەکێ لە سیما دیارەکانی زمانی پەخشان ئامێزی چیرۆکنووسەکەیە دەڵێیت : "بەهەرحاڵێك گەیشتنە خانەکە و دەرگاکایان لێ کردینەوە و چووینەژوورەوە سەرما، قوڕ، دلۆپە، بێ ئاگری (ل ٣٥) . دابەش بوونی پاڵەوانەکانی لەسەر تۆپۆگرافیای نەخشەی رووداوەکانی چیرۆکەکە یەکسانە. تەنها کابرای خەوبینەر (گێڕەرەوە) ی لێدەردەچێ دەنا ئەوانی دی بێ ناون و کەم دەردەکەون یان هەر بۆ جارێ دەردەکەون، کە ئەوەش لە زەین و بیری حۆێنەردا بۆ ماوەیەکی زۆر نامێننەوە. شوێن ، جێگیرە و زیاتر ژووری بەندکردنی کابرای خەوبینەرە و بەشێوەیەکی عەفەوی جێگەکان دەگۆڕێن و مامەڵەیەکی سادە و پێداویستی رووداو و کەسەکان فەرزی ناکات و وەکو رەهەندێکی جوانی نیشان نەدراوە.

زەمەن لە چیرۆکەکەدا ، دەکرێ لە سێ زەمەنی جیاوازەوە بڕوانین زەمەنی دەق ئەو زەمەنەی کە چیرۆکنووس چیرۆکەکەی تێدا نووسیووە ، زەمەنی خەونەکە کە زەمەنێکی دیاریکراو و کورتە کە رەنگە لەچەند سەعاتێك تێنەپەڕێ هەروا زەمەنی فیزیکی یان زەمەنی واقیع یان مێژوو کە پێی رووداوە مێژووییەکان دەبێ ماوەی حوکمی شێخ مەحمود بگرێتەوە ١٩١٨-١٩٢٤ بەهەردوو جارەکەوە .

دەتوانین بیری سەرەکی لەم خالاٌنەدا دیاری بکەین :

- **رەخنە لە حکومەتی شێخ مەحمود و داروودەستەکەی .**
- **ریاکاری مەلا و پیاوانی ئایینی .**
- **سادەیی و بێ ئاگایی خەڵك و جیاوازی بیروبۆچوونی بێ بنەمای سیاسیان .**

ناونیشانی چیرۆکەکە (لەخەوما) ناونیشانێکی سادە و یەکسەر زەینی خوێنــەر بــۆ جیهانی خەون و فانتازیا و دوور لە واقیع و حەقیقەت دەبات، کە دەکرا ناونیشــانێکی قوولتری بۆ هەڵبژاردبا. ئەگەرچی خوێنەر لە ناوەڕاستی چیرۆکەکەدا تووشــی جۆرێــك لەسەر سووڕمان دەکات و لەگەڵ ناونیشانەکەی دژیــەك دەکەوێتــەوە کاتــێ دەڵێــت : (ئەمە چی بوو من دیم، من لە کوێم ئەمە خەونە یان نا ؟ بۆیە هــەردوو چــاوی خــۆم گلۆفت وتم بەڵکو ئەگەر خەوە خەبەرم بێتەوە کەچی روانــیم هــەموو شــتێك هــەر لــە جێگەی خۆیەتی و ئەم جانەوەرانە هەر لەبەر چــاومن ،ل٧٥) لایــەنێکی دیکــەش لــە بنیادی چیرۆکەکە (غەفلەت)ە کە ئــەو حاڵەتەیــە چــیرۆکنووس بەهەڵــە دوولایــەنی دژیەك یان باسی شتێك دەکات کە لەگەڵ بابەتی پێشوو راست ناکەوێتەوە و جۆرێکــە لە بێ ئاگایی و نەست داو تان و پۆی چیرۆکەکە لاواز دەکات . لە ئاخروئۆخری پاییزی دا باری سروشت بەم شێوەیە نابێــت هــەروەکو پاڵــەوان (کــابرای خەوبینــەر) دەڵێــت: (شەویش کردبووی بە سایقە کزەبایەکی ساردی دەهات عەرزەکە بەستبووی، تەقەتەقی سەهۆڵەکە سەرمایەکی وایە تف هەڵدەی دەیبەستێ!.ل٧٣) .

## ئەنجـــام

لە کۆتایی ئەم باسەدا ئەنجامە گشتییەکان بەچەند خاڵێك دەست نیشان دەکەین :

١- لە دایك بوونی چـیرۆکی هونـەری کـوردی وەکـو فـۆرمێکی تـازەی ئـەدەبی پێویستی هێناویەتییە کایەوە، دوای ئەوەی لە توانا و بڕستی شیعردا نـەماوە کێشـە ئالۆزەکانی ژیانی مرۆڤی سەردەم بەتەواوی دەربڕێت .

٢- چیرۆکی هونەری کوردی هەروەکو میللەتانی دراوسێ لە دایك بـووی سـامانی دەوڵەمەندی کەلـەپوور و فۆلکلـۆری نەتەوەییـە لـە رووی ناوەرۆکـەوە و بـە فـۆرمی هونەریی ئەورووپی خۆی نواندووە .

٣- لە ڕووی زەمەن و مێژووەوە ، چیرۆکی کـوردی لەگـەڵ میللـەتانی دراوسـێدا هاوکات بووە، کە ئەمەش هۆشیاری فەرهەنگی و رۆشنبیری و ئاستی بـەرزی ئـەدەبی کوردی نیشان دەدات .

٤- یەکەم چیرۆکی هونەرییـە تـەکنیکی هاوکـاتی عـەرەبی و تـورکی، دەتـوانین جەمیل سائب بەتایبەتی بە لەبەرگرتنی شێوازی (خەوبینین) و رەخنە لـە دەسـتەڵاتی سیاسی رۆژگار بکەینە سەردەستەی چیرۆکنووسان لە کوردستانی باشووردا .

٥- ناوەرۆکی چیرۆکەکانی قۆناغی یەکەم بە (جەمیل سائیب)یشـەوە بـە شـێوەی ریـالیزمی رەخنەگرانـە کێشـە کۆمەڵایـەتی و سیاسـییەکان دەخاتـەڕوو و لـە ڕووی ناوەرۆکەوە زۆربەی چیرۆکەکان لە کەلەپوورو مێژووەوە وەرگیراون

٦- لە ڕووی تەکنیکیشەوە زنجیرەی رووداوەکـان و دانـانی نـاو بـۆ پاڵەوانـەکان و دیالۆگ و رەگەزی هاندان و سـەرەتا و لوتکـە و کۆتـایی (موپاسـان)ی هەسـتی پـێ دەکرێت ئەگەرچی بەشێوەیەکی سادەش بێت.

## سەرچاوەکان :

١- کتێب

أ- بە زمانی کوردی :


- عومەر مەعروف بەرزنجی ، لێکۆڵینەوە و بیبلۆگرافیای چیرۆکی کوردی ١٩٦٩ -١٩٧٥ ، بەغدا، ١٩٧٨ .

- جەمیل صائب ، لە خەوما ، پێشەکی جەمال بابان ، بەغدا، ١٩٧٥.

- حسین عارف ، چیرۆکی هونەری کوردی ١٩٢٥- ١٩٦٠، بەغدا ، ١٩٧٧.


**ب- بە زمانی عەرەبی :**


- د. علی جواد الطاهر ، محمود احمد السید رائد القصة الحدیثة فی العراق ، بیروت ١٩٦٩

- د. عبدالاله احمد ، نشاة القصة وتطورها فی العراق، بغداد ١٩٦٩ .

- د . عزالدین مصطفی رسول، الواقعیة فی الادب الکردی ، صیدا- بیروت ، ١٩٦٦ .

- د. محمد غنیمی هلال، النقد الادبی الحدیث، دار نهضة مصر للطبع والنشر ، القاهرة ، ١٩٧٧ .


**ج — بە زمانی فارسی :**


- د. محمد استعلامی، بررسی ادبیات امروز ، چاپ سوم ، تهران ١٣٥١.

- محمد علی جمالزاده،یکی بود.. یکی نبود، تهران ١٣٢٣ .

- صادق هدایت، حاجی اقا، چاپ ششم ، تهران ، ١٣٤٣ .


**٢- رۆژنامە و گۆڤار :**

**أ- بە زمانی کوردی**


- د. مارف خەزنەدار، هەندێ لە شیرازەکانی دەفتەری رەخنەم، گ دەفتەری کوردەواری ، ب٣ ، بەغدا، مایسی١٩٧٠ .

- جەمشید حەیدەری، چەند سەرنجێکی رەخنەیی دەربارەی چیرۆکی لەخەومای جەمیل صائب، پاشکۆی عێراق ، ژ ١٠ ی کانونی یەکەم ١٩٧٧.
- رووف حسن، سەرەتای چیرۆکی کوردی و جیاوازی نێوان یەکەم چیرۆك و دووەمیان، گ رۆشنبیری نویٚ ژ٦٩، ١٩٧٨ .
- رۆژنامەی پێشکەوتن، ژ٣،س١، سلێمانی ١٨/ ١١/١٩٢٠ .
- د .فەرهاد پیربالٚ، مەم و زینی مەلا مەحمودی بایەزیدی یەکەم چیرۆك لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا ، گ کاروانی ئەکادیمی ،ژ١ ،ب١ هەولێر ١٩٩٧.
- فاضل ئەحمەد، سەرەتای پەیدابوونی چیرۆکی کوردی،گ بەیان ،ژ ٢٩، ١٩٧٥ .
- فوئاد تەمو، شویش، گ رۆژی کورد، ژ(١- ٢) ، ١٩١٣ .
- مستەفا صالح کریم،سەرەتای لە دایك بوونی چیرۆکی هونەری کوردی ، گ. کاروان ژ٣٧ تشرینی یەکەم، س٤ ،١٩٨٤ .
- ؟ ،صادق هیدایەت پێشەنگی ریالیزمە لە ئەدەبی ئێرانی نوێدا، گ رزگاری ، ژ ٦، س١ ، ١٩٦٩ .

**ب – بەزمانی عەرەبی :**

- اكمل الدين احسان، نشاة القصة فى الادب التركى، مجلة القصة ع ٢٠، س٢، مصر، ١٩٦٥ .
- د . معروف خزندار، القصة الكردية، مجلة الثقافة الجديدة ، ع ٢، ١٩٦٩.
- د. جمشيد الحيدرى،تاريخ النثر الفنى الكردى فى العراق (موجز رسالة دكتوراه)، مجلة دراسات كردية، ع ١، س١، باريس، ١٩٨٤ .

**ج - بە زمانی فارسی :**

حسن نكوروح ، نقش واقيعتيهاى سياسى در رمان فارسى، مجله نقد، دفتر دوم ، تهران ١٣٥٧

==========================================

(*) ئەم نووسینە لە کتێبی: دەروازەیەك بۆ رەخنەی ئەدەبی کوردی، نووسینی: د.هیمداد حوسێن بەکر ( هەولێر: چاپخانەی باز، ٢٠١٠) بلاْوکراوەتەوە.

# قۆناخی سەرهەڵدان و دەرکەوتنی چیرۆکی کوردی

# ١٩٢٥ – ١٩٣٩

**عومەر مەعروف بەرزنجی**

دوای بڵاوبوونەوەی چەند پەخشان و کورتە نووسینێك لەسەر رووی چاپەمەنییەکانی ئەو سەردەمە، بۆ یەکەمجار لە رۆژی ١٩٢٥/٧/١ی رۆژنامەی ژیانەوەدا بەشی یەکەمی چیرۆکێك دەبینین بە ناونیشانی (لە خەوما)(*) کە بەبێ ناوی خاوەنەکەی بڵاوکراوەتەوە، بەڵام لە راستیدا خاوەنی چیرۆکەکە (جەمیل سائیب)ی() سەرنووسەری رۆژنامەی

---

(*) بەشی یەکەمی ئەم چیرۆکە بۆ یەکەمجار لە ژمارە (٢٩)ی رۆژی ١/٧/ ١٩٢٥ (ژیانەوە)دا بڵاوکراوەتەوە و تا (١٨) زنجیرە بەردەوام بووە، دوایی لە ژمارە (١)ی رۆژی ٢١/١/ ١٩٢٦ی (ژیان)دا دەستی پێکردووەتەوە تاکو ژمارە (٢٦)ی رۆژی ١٩٢٦/٧/٢٩ لەم ماوەیەشدا (٥) بەشیتری لێ بڵاوکردووەتەوە. ساڵی (١٩٧٥)یش بۆ جاری دووەم جەمال بابان لە شێوەی کتێبێکدا سەرلەنوێ بە چاپی گەیاندەوە، بەڵام جیاوازییەکی ئاشکرا هەیە لەگەڵ ئەو تێکستەی کە ساڵی ١٩٢٥ بڵاوکراوەتەوە و تەنیا بە بەراوردێکی ساکار ئەم راستییە دەردەکەوێ.

() جەمیل صائب کوڕی مەلا قادری مەلا حەسەنە، لە ١٨٨٧/٨/١٦ی زاییینیدا لە سلێمانی لەدایك بووە، لە ساڵانی ١٩١٩-١٩٢٠ کە رۆژنامەی پێشکەوتن لە سلێمانی دەردەچوو نووسینی بڵاوکردووەتەوە، ساڵی ١٩٢٤ بووە بە سەرنووسەری رۆژنامەی ژیانەوە، لە ١٩٥١/١٠/١٣دا کۆچی دوایی کردووە.

ژیانەوە بووە و بە (٢٣) زنجیرە لەسەر لاپەڕەکانی (ژیانەوە و ژیان) بڵاو کراوەتـەوە و بـە ناتەواوی وازی لێهێنراوە.(*) ئەم هەوڵەش لە رووی بڵاوکردنەوەیەوە بە یەکـەم چـیرۆکی هونەری دادەنرێت چونکە گەر رۆژنامەکانی پێش ئەو کاتە بپشکنین هیچ بابەتێك نابینین کە سیمای چیرۆکی پێوە بێت، بۆیە ئەم کارە بـە کلیلـی دەرگـای چـیرۆك دەزانرێـت لـە مێژووی ئەدەبی کوردیدا. بابەتی چیرۆکەکە (خەو بینینێکە و لەسەر تـەرزی ئـەدەبێکی رەمزییـە، مەسـەلەیەکی سیاسـی رووت دەردەخـات کـە موعانـات و دەردەدڵـی نووسەرەکەیەتی دەربارەی ئەو رۆژگارەی کە (شێخ مـەحموود)ی نـەمر فـەرمانڕەوا بـوو. سەرتاپا ئەو تاقیکردنەوە مێژووییە بە خەوێکی بێ تام و بزرکاو لە قەڵـەم دەدات و داخ و بێزاری خۆیشی لەگەڵدا هەڵدەرێژێ، بنەڕەتی چیرۆکەکەش لە مرۆڤێك دەدوێ کە لەبەر بێدەرامەتی و بۆ دۆزینەوەی کارێك شارەکەی بەجێدەهێڵێ و بەرەو شـارێکیتر دەکەوێتـە رێ تا بتوانێ ماڵ و خێزانی بەرێوە ببـات، لـە رێگـادا چـەند کاروانچـییەك دەبـن بـە هاوڕێی، چەند جارێکیش دز و رێگر سەر رێگایان پێدەگرن، دوایـی بـە هـەر ناسـۆرێك دەبێ دەگەنە سنووری شار، لەوێش هەندێ پیاوی ئەو حوکمدارە کۆسپیان دەهێننە رێگـا و داوای بـەرتیلیان لێدەکـەن، بـەڵام کـابرا هیچـی لێهـەڵناکرێنن ناونیشـان و شـوێنی دابەزینی لێوەردەگرن، بۆ بەیانی چەند کەسێك دەیگرن و لە ژوورێکدا بەندی دەکەن، بـە رێکەوت لەو ژوورەدا پەنجەرەیەکی بچووکی تیا دەبێ کە دەڕوانێتە ژووری حوکمدار، ئەم کابرایە لەکاتی گرتنەکەیدا بە هەموو هەستێکیان دەزانێ، لەو ماوە کەمەیشدا کە ئـەم ئاگادارە لە هەزار ئاش لێدەکەن و لە هیچی نامالنەوە، چەندەها پەیمان دەبەسترێت و لـە ساتێکدا سەرجەم هەڵدەوەشێنرێتەوە، کابرای بەندکراویش پاش بینینی ئەم پەردە جۆر بە جۆرانە خۆی پێناگیرێ و دەست دەکات بە پێکەنین، لـەم کاتـەدا پێیـدەزانن و دووچـاری سزایەکی قورسی دەکەن، پێش ئەوەی مەبەستیش بێتـەدی ئاگـای دەبێتـەوە و خەوەکـە کۆتایی دێت).

---

(*) لە ژمارە (٢٦)ی رۆژی ١٩٢٦/٧/٢٩ی رۆژنامەی (ژیان)دا نووسراوە ماوێتی، بەڵام ئیتر هیچ بەشێکیتری بە دوادا نەهاتووە.

ئەم چیرۆکەی نووسەر کردنەوەی گرێی مەسەلەیەکی سیاسییە بە مەبەستی دەرخستنی رووی ئالۆز و شێواوی ئەو رۆژگارەی کە بۆ ماوەیەکی کورت جڵەوی ئەم نەتەوەیە بەدەست شێخی نەمرەوە بووە، لێرەشدا بۆ تێگەیشتن و حوکمدان بەسەر بابەتەکەدا و ئاڕاستەکردنی تیشکێکی رەخنەگرانە بۆ ناوەرۆکەکەی بە کارێکی لەباری دەزانم کە چاوێکی سەرنج بگێڕین بەو سەردەمە تایبەتییەی نەتەوەکەماندا لە کاتی ئەو تاقیکردنەوە مێژووییەدا. شێخی نەمر دووجار فەرمانڕەوایی ناوچەی سلێمانی گرتە دەست، یەکەم لە مانگی تشرینی دووەمی ١٩١٨ەوە تا مانگی حوزەیرانی ١٩١٩ کە لەم ماوەیەدا جەنگە مێژووییەکەی دەربەندی بازیان روویدا و بە گرتنی کۆتایی هات. دووەم لە کۆتایی ١٩٢٢ەوە تا تەمووزی ١٩٢٤، لەم ماوە کەمەدا شێخ مەحموود بەپێی لێکدانەوەی تایبەتی خۆی و تێگەیشتنی لە مەیانی سیاسەتدا کاروباری بەڕێوەبردووە، ئەو زانا و رۆشنبیرانەش کە لە دەوری کۆبوونەوە هەر یەکەیان بیرکردنەوە و بۆچوونیان لە رووی سیاسەتی گشتی وڵاتەوە جیاواز بووە و ویستوویانە کە حوکمدار بە لای بیروڕایەکانی خۆیاندا، رابکێشن و ئەوانیتر پشتگوێ بخرێ، راستە ئەمانە زۆربەیان خزمەتگوزاربوون و پاشەڕۆژێکی پرشنگداریان ویستووە بۆ نەتەوەکەیان، بەڵام بەبێ رەچاوکردنی کات و سیاسەتی ئەو سەردەمە هەر کۆمەڵ و دەستەیەك لە ئاوازێکیان داوە، لایەکیان ئاوازی تورك چییەتی گەشەی پێدەدات، دەستەیەکیتریان جێگیربوونی حوکمی ئینگلیز خواستیان بووە و تەنانەت بە رزگارکەری گەلانیان داناوە، کۆمەڵێکی کەمیش دەوری شێخیان دابوو بە مەبەستی دوژمنایەتی کردنی ئینگلیز، راستیشە لە زەمانی ئەم فەرمانڕەوایەدا هەندێ کارەساتی دڵتەزێن روویداوە و کەسانی بێتاوانیش سەریان ناوەتەوە و مرۆڤی هەڵپەرست و چاوچنۆکی خاوەن بەرژەوەندی تایبەتی لەسەر شانۆی سیاسەت دەوری سەرەکی بووە کە تا رادەیەك نە بەکامی هەستی نەتەوەیی و کزبوونی وەعی و کەم تاقیکردنەوەی شێخ لە مەیانی سیاسەتدا لە هۆیە گرنگەکانی بووە، لە لایەکیترەوە کرداری نائاسایی و رەفتاری ناپەسەند وەك

شتێکی سروشتی لە زۆر جووڵانەوەی رزگاریخوازیدا سێبەری دیارە نەخوازەڵا ئـەو کاتە کە سەرجەم میللەت لەژێر باری گرانی نەهاتی و دواکەوتندا تلاوەتەوە، گەر ئێمەش لەبەر تیشکی ئەم راستییانە و لە روانگەی راژەی گشـتییەوە بـەو بـیر و رایانەدا بچینەوە کە نووسەر دەری بڕیوە و ئەو تاوانانەی کـە لکاندوویـەتی بـەو حوکمەوە تا چ رادەیەك راستە؟ و ئایا هەڵپچڕقاندنی ئـەو گوڵـە ئاڵـە لـە بـاخی رازاوەی ئومێدی کورددا و سەیرکردنی ئەو تاقیکردنەوە تاقانەیە بە چاوێکی کەم بایەخ سەرکەوتن و خۆشی نەتەوەکەی تیا بووە؟ لەگەڵ هەموو کەموکوڕییەکیشدا ئایا هەر ئەو قارەمانە بزورگە نەبووە کە زیاتر لە نیـو سـەدە لەمەوبـەر مرۆڤـی کوردی بە گەلان ناسی؟ رەنگە خوێندەوارانیش نـاوەرۆك و مەبەسـتی چـیرۆکەکە ببەستنەوە بەو بار و موعاناتە تایبەتییەی کە نووسەرەکەی تیا ژیاوە و کوشـتنی کەسانی وەك (عارف سائیب)ی برای و (جـەمال عیرفـان)ی ژن بـرای بکرێـت بـە بەڵگەی ئـەو نائومێدییـە و هۆیـەکی سـەرەکی بـێ کـە نووسـەر تـەنها لایەنـە تاریکەکانی بینیوە و بە ئاستەمیش بە لای گرنگی و بەهایدا گوزەر نەکات و بـە چەشنی داخ لە دڵێك بیر لە مەسەلەکە بکاتەوە، کە دیارە ئەم بۆچوونە تاڕادەیەك راستی تیادایە و چەند لکێکی هەر بەو جۆرە دێتە پـێش چـاوی. بـەڵام گـەر لـە بۆچوون و بەرژەوەندی گشتییەوە بۆی بڕوانین و جیاوازی بیروڕا و زیانی تاکەکەسی لێ دەرهاوێژین ئەو مافەی نادرێتێ و چەشتنی ناسۆریش ناکرێتە دێوجامەیـەك و قینی لە پەنادا حەشار بدرێت و بە وشك بوونی ئەو گوڵە و سەرکەوتنی ئینگلیـز شادومانی بگەڕێتەوە سەر لێوی نووسەر. کاری ناڕەوا و روودانی تاوانی جۆر بـە جۆر هەرگیز مەیان بۆ نووسەرێك فراوان ناکات کە سەرتاپا مێژووی نیو سـەدەی خەبات بخاتە لیتەی رەشبینییەوە، ئەمە جگە لەوەی کە نووسەر لـە زۆر شـوێنی چیرۆکەکەیدا نیگاری ئەو سەردەمەمان بە جۆرێك نیشان دەدا کە بەلای راسـتیدا گوزەر ناکات و بە ئاشکرا دروست کردنی تاوانە و لە عەقڵی زۆر کەسەوە دوورە و دەڵێ: (نەختێکیتر رۆیشتین گەیشتینە مەیدانێك لـەوێ سـەیرم کـرد سـێدارەیەك هەڵخراوە، لە ژوور ئەوێشەوە سێ چوار داریتر پێکەوە داچەقاون پیاوێکیان پێـوە

بەستۆتەوە)(*) کە دیارە ئەمەش هەر بۆ ئەو مەبەستە بووە کە ویستوویەتی جەماوەر وا تێبگەیێنێ کە کۆمەڵەکەی ئەو رژێمە بریتی بووە لە زەبر و زەنگ و خێر و خۆشی نەتەوەکەی نەویستووە، کە ئێمەش لێرەدا ئەم رایانە دەخەینە بەرچاو بە هیچ جۆرێك مەبەستمان بەرگری کردنێکی بێ بەڵگە و سۆزێکی رووت نییە چونکە لە چیرۆکەکەی نووسەردا جاروبار تاڵە دەزووی چەند راستییەك دەدۆزینەوە و لە چەند سەرێکەوە سیمای هەندێ لایەنی دەرخستووە، بەڵام کێشانی هێڵێکی راست و چەپ بەسەر ئەو رۆژگارەدا و نیشاندانی بە خەوێکی تاڵ و بزرکاو ئاوەژووکردنەوەی مێژووی نەتەوایەتیمانە و کاڵکردنەی واقیعی بەرهەمەکەیشە.(□) لەلایەکیترەوە لەو سەردەمەدا هەرکەس و بەرەیەك لە دژی مەحموودی بنووسیایە مایەی خۆشحاڵی و رەزامەندی ئینگلیزی داگیرکەر بووە و تەنانەت هاندانی ئەویشی تیابووە.

چیرۆکی لە خەوما لە رووی ناوەڕۆکەوە دەچێتە خانەی (ریالیزمی رەخنەگرانەوە) Critical Realism کە سیمایەکی مێژوویی پێوە لکاوە لە کات و سەردەمێکی دیاری کراودا... لەمەشەوە بەو راستییە دەگەین کە چیرۆکی کوردی لە سەرەتاوە بەم رێبازە هاتووەتە کایەوە کە پەردە هەڵماڵینە لە رووی ناکۆکی و دژوارییەکانی کۆمەڵ و درووژاندنی کرۆکی مەسەلە جۆر بە جۆرەکانی ژیان و پێشچاوخستنیان. لێرەدا بە کارێکی پێویستی دەزانم کە دەرگای باسی چیرۆکی خەوبینین بکەمەوە وەك سەرەتایەك بۆ نووسنی چیرۆکی هونەری:

---

(*) لە خەوما، بەغدا ١٩٧٥، ل ٣٩-٤٠.

(□) شاعیری بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورد (حەمدی) ئەحمەد بەگی ساحێب قڕان ١٨٧٨-١٩٣٦ لە شیعرەکانیدا بە توندی رەخنەی لە شێخ مەحموود گرتووە، بەڵام لە نیشاندانی راستی و دەوری پاڵەوانانەی لە رازاندنەوەی مێژووی کورددا کەمتەرخەمی نەکردووە، چەپکە شیعرێکی رەنگینی خستووەتە گوڵدانی ئەدەبەوە کە بەمەش رەنگێکی واقیعی بۆ شیعرەکانی رشتووە (بڕوانە دیوانی حەمدی، بەغدا ١٩٥٧).

وەك راستییەك ساغ بووەتەوە كە چۆن چیرۆك لە ئەدەبی عەرەبی عێراقدا لە شێوەی (خەو)دا دەركەوتووە و رەگی داكوتاوە و چەندەها تاقیكردنەوەی لەسەر بنیاتنراوە تا گەیشتووەتە ئەم ئاستە پێگەیشتووەی ئەمڕۆ.(*) هەر بەو جۆرەش لە ئەدەبی كوردیدا سەری دەرهێناوە و رێچكەی نووسینی چیرۆكی پێ شكێنراوە، بەڵام لەگەڵ هەندێ جیاوازی ساكار لە شێوە و ناوەڕۆكدا، چیرۆكی خەو لە عەرەبیدا بناغەیەكی قوڵ و بەربڵاوی هەیە و سەرەتا لە (الف ليلة و ليلة) و مەقاماتەوە بناغەی دارشتووە و ئاو و هەوایەكی رۆمانسییانەی هەڵمژیوە و زیاتر لە مەسەلەكانی رەوشت و دڵداری و بابەتە كۆمەڵایەتییەكانەوە نزیكە و هەوڵدانە بۆ خستنەڕووی (كەموكوڕییە كۆمەڵایەتییەكان و چارەسەركردنیان)()، بەڵام خەوی كوردی رەپاوڕەپ بە ناخی بار و زروفی سیاسیدا رۆچووە و لەم لایەنەوە كنەی كردووە كە تا رادەیەكیش لە وتارێكی سیاسی جیرەوە نزیكە و راستەقینەتر خۆی دەنوێنێ، (جەمیل سائیب)یش كە گرێی چیرۆكی كوردی كردووەتەوە و بە سەر لەوحەی ئەم هونەرە دادەنرێت بە چەشنی زۆربەی نووسەرانی ئەو كاتە كەوتووەتە ژێر كاری ئەدەبی توركی و فارسی و گەلانیترەوە، لەو سەرچاوە روونانەشەوە چێژی ئەدەبی و هەوێنی رۆشنبیرێتی لێ هەڵگۆزیوە، بۆیە شتێكی ئاساییە كە لە گرتنی ئەم رێچكەیەدا و پەنابردنە بەر بابەتی خەو بۆ دركاندن و هەڵڕشتنی رازی دەروونی سوودی لە ئەدەبی بێگانە وەرگرتبێ و بەكاریشی هێنابێ بۆ مەبینی كارە ئەدەبییەكەی، لەم بارەیەوە (نووسەری تورك نامیق كەمال چیرۆكێكی درێژی بە ناونیشانی خەوبینین نووسیوە-مەعروف رەسافی-ش دوای

---

(*) یەكەم چیرۆكی (خەو)ی عەرەبی لە گۆڤاری (تنوير الافكار)دا ساڵی ١٩٠٩ بڵاوكراوەتەوە بە ناونیشانی (رؤيا العربية) لەم بارەیەوە بڕوانە (نشاة القصة و تطويرها في العراق) عبدالاله احمد، بغداد ١٩٦٩، ل ٤١.

() هەمان سەرچاوە، ل ٤٠.

بڵاوکردنـەوەی دەسـتووری عوسمـانی وەریگێڕاوەتـە سـەر زمـانی عـەرەبی و لـە (١٩٠٩)دا لە بەغدا چاپکراوە)(*). یان نووسەری گەورەی تورك جەلال نوری لـە (١٩٠٣)دا باسێکی خستووەتە پێش چاو بە ناونیشانی (لە خەوما یان گەشـتێك لە بەهەشـتا)(□) کـە نووسـەرەکەی لـە گەشـتێك دەدوێ لـەکاتی بێـی ئاگاییـدا کردوویەتی و چەند بیروڕایەکی تایبەتی دەربڕیوە، لەمانەوە دەتوانین بـە لای ئـەو رایەدا گوزەر بکەین کە ئەم کارانە سەرچاوەیەکی نووسـەر بـوون و بـەو هۆیـەوە رەوتـی بابەتەکـەی بـەو رێبـازەدا بـەرێکردووە و لەسـەر ئـەو پێودانـە رەنگـی چیرۆکەکەی رشتووە.

لایەنە هونەرییەکانی ئەم چیرۆکە وەك جوانی وشـە و رازاوەیـی تـەعبیر و رەوانـی نووسین و پارێزگاری زنجیرەی بیری نووسەر و سـەلیقەیی لـە دارشـتندا تارادەیـەك بـە بەرهەمەکەوە دیـارە و لەچـاو ئـەو رۆژەدا و بـە چەشـنی سـەرەتا و یەکـەم چـیرۆکی نووسراوی کوردی چەند هێڵێکی درشتی هونەری چیرۆکی تیا رەچاو کراوە، هەرچـەندە خاڵێکی گرنگی بزرکردووە کە ناودانانە بۆ کەسانی چـیرۆکەکەی لەگـەڵ ئەوەشـدا دوو پاڵەوان بە ئاشکرا دەردەکەون کە خەوبینەرەکە و شێخی نەمرە، لەلایەکیترەوە گەر ئەم چـیرۆکە بـە پێـودانگی بەرهـەمی سـاڵانی دواتـر بیپێـوین مەرجـە هونـەری و تەکنیکییەکانی چیرۆکی بە کـاڵی تیـا بـەدی دەکرێـت و لاواز دێتـە بەرچـاو، بـەڵام

---

(*) هەمان سەرچاوە، ل ٣٩-٤٠.

(□) ساڵی ١٩٠٣ جەلال نوری کە یەکێك بوو لە ئەدیبە گەورەکانی تورکیا ئەم باسەی لە کتێبی (تەئریخی ئیستیقبال)دا نووسیوە، لە گۆڤاری گەلاوێژی ژمارە (٩، ١٠) ساڵی (٩) ئەیلوول و تشرینی یەکەمی ١٩٤٨دا لەلایەن (ع.ع) ناوێکەوە کراوە بە کوردی بە ناونیشانی گەشتێك لە بەهەشتا، بۆ جاری دووەمیش لەلایەن عەقیدی خوالێخۆشبوو (عبدالقادر بەرزنجی) لەگەڵ پێشەکییەکدا کراوە بە کوردی (بڕوانە گۆڤاری شەفەق، ژمارە ٢، ساڵی ٣، رۆژی (٢٠)ی نیسانی ١٩٦٠.

لێکۆڵینەوەی زانستی بەلای ئەم کوێرە ڕێگایەدا گوزەر ناکات و (هەموو هونەرێك لە دایك بووی سەردەمی خۆیەتی)(*) و لە خانەی بەراوردکردنی بابەتەکانی ئەو ڕۆژگارەدا دەبینرێتەوە.

---

(*) ارنست فیشر، الاشتراکیة و الفن، ترجمة اسعد حلیم، بیروت ۱۹۷۳، ص۲۱.

=====================================================

(*) ئەم نووسینە لە کتێبی: لێکۆڵینەوە و بیبلۆگرافیای چیرۆکی کوردی ۱۹۲۵ - ۱۹٦۹، لە نووسینی: عومەر مەعروف بەرزنجی (بەغدا: چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، ۱۹۷۸) دا بڵاوکراوەتەوە.

# جەمیل سائیب (١٨٨٧ – ١٩٥١)

**حسێن عارف**

هەرچەندە پێش رۆژنامەی (ژیانەوە) هەر لە شاری سلێمانی رۆژنامەی (پێشکەوتن-١٩٢٠ و رۆژی کوردستان-١٩٢٢ و بانگی کوردستان -١٩٢٢ و بانگی حەق-١٩٢٣ و ئومێدی ئیستیقلال-١٩٢٣) و لە بەغداش (تێگەیشتنی راستی-١٩١٨) دەرچوون(*)، بەڵام لە هیچ کامێکیاندا چیرۆکی هونەری (با بە مانا سەرەتاییەکەشی بێ) بەدی ناکەین، تەنها هێندە نەبێ کە تاك و تەرا گفتوگۆیەکی سەرپێی نێوان دوو یا سێ کەسمان بەرچاو دەکەوێ کە بە نیازی ئامۆژگاری کردن و بۆ مەبەستێکی سیاسی رۆژانە نووسراون. وەك (محاوەرەیەکی ئیقتیسادی) لە ژمارە (٥ی رۆژی ٤ی ئەیلوولی ١٩٢٢)ی بانگی کوردستاندا کە ئەحمەد حەمدی نووسیوێتی. یا (مجادەلەی ئەفکار- ئەفکار موتەنەویعە، حسیات موتەلەوینە) هەر لەو ژمارەیەدا. یا (بچۆ ئاغا تێبگەیەنە) لە ژمارە (٢٠)ی ئومێدی ئیستیقلالدا. بێگومان ئەمانە ئەگەر وەك کارێکی ئەدەبی مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێ، دەبێ بخرێنە خانەی شانۆگەرییەوە نەك چیرۆك.

بەڵام لە ژمارە (٢٨ی ژیانەوە)دا کە رۆژی ١٩٢٥/٦/٢٦ دەرچووە، ئەم ئاگادارییە دەخوێنینەوە: ((لە تەرەف شەخسێکەوە خەوێکی زۆر عەجایب و غەرایب بینراوە. ئەم خەوە حەیات و ئیدارە و رابواردنی چەندساڵێکی ئەم وڵاتە ئەنوێنێ. گەلێ ئەسراری

---

(*) جەمال خەزنەدار- رابەری رۆژنامەگەری کوردی.

خوێناوی و وەحشـییانە دەرئـەخات. زۆر ئـەحواڵی خسوسـی ئەخاتـە بەرچـاوی ئـەم عالەمە...هتد).

سا ئەو شەخسە کەس نەبووە جەمیل صائیب نەبی کە بەبێ ئەوەی ناوی خـۆی یـا هەر ناوێکیتری لەسـەر نووسـیبێ، لـە ژمـارە (٢٩ی رۆژی ١٩٢٥/٧/١)ەوە دەسـتی کردووە بە بڵاوکردنەوەی خـەوە (عـەجایب و غەرایب)ەکـەی و لـە (٥٦) ژمارەکـەی (ژیانەوە)دا (١٨) ئەڵقەی لێ بڵاوکردۆتەوە و کە لە دامێنی دواییینیاندا (ژمارە ٢٦ی رۆژی ٢٩ی تەمووزی ١٩٢٦)دا نووسراوە (ماوێتی) و کەچی ئیتر پاشماوەکەی نابێنین.

مامۆستا جەمال بابان کە هات و دوای پەنجا ساڵی خشت چیرۆکەکەی ژیاندەوە و لە چاپی دایـەوە، لـە پێشـەکییەکەی خۆیـدا نووسـیویە: ((نووسـینەکەی (لـە خـــەوما)م لەبەردەســـت خـــەتی کاکینـــە خـــۆی (جمیـــل ســـائیب - ح. ع.) نووسیوەتەوە))(*)، کە بەمە گیروگرفتی (ماوێتی)یەکە کە پێشتر لە کایەدا بـوو دەبڕێتەوە و بەو بارەدا ساغ دەبێتەوە کە تەواو نـەکردنی چـیرۆکەکە لـە نووسـەر خۆیەوە بووە و لەویدا وازی لێهێناوە.

بەر لە هەموو شتێ ئێمە هەرکاتێ باس لەم چیرۆکە بکەین و بە هەر بارێکدا بـێ، دەبێ ئەو راستییەمان لەپێش چاو بێ کـە هێنـدەی تـا ئێسـتا پێزانرابـێ، یەکـەمین چیرۆکی هونەری کوردییە هێنرابێتە بەرهەم و بەوە دەبێتە یەکەمین بەردی بناغـەی ئەم بابەتە ئەدەبییە نوێیە لـە ئـەدەبی هاوچـەرخماندا. هـەروەکو نووسەرەکەشـی دەبێتـە یەکەمین ئەدیبمان کە لەم مەیدانەدا دەستپێشخەری کردبێ و بـەوە دەبێتـە یەکـەمین چیرۆکنووسی کورد.

چیرۆکەکە چەندە ئەدەبە، هێنـدەش سیاسـەت و مێـژووە. هـەروەکو چـەندە وەك ئەدەب بە شێوەیەکی تایبەتی گرنگ و بایەخدارە، هێندەش وەك سیاسەت و مێژوو بە شێوەیەکی تایبەتی لە لێکۆڵینەوەیدا سەرنجڕادەکێشێ و رەخنەگر راسـتەوخۆ دەخاتـە

(*) لە خەوما، چاپی ١٩٧٥، لاپەڕە ٢٥.

بەرامبەر باس و خوازی پلەیەکی مێژوویی ناسك و ئاڵۆزی نەتەوەی کوردەوە. بۆیە من بە چاکی دەزانم بە هەردوو باریدا لێی بدوێم و باشتریش وایە یەکەمجار بە باری دووەمیاندا باسی بکەم.

## بە باری سیاسی و مێژووییدا

کە جەمیل سائیب دەستی کرد بە بڵاوکردنەوەی چیرۆکەکەی ئەو وەختە هێشتا تەنها نزیکەی دوو ساڵێك بە سەر تێکشکانی حوکمداریێتییەکەی دووەمجاری شێخ مەحموودی حەفیددا رابوردبوو، و بگرە هێشتا پاشەرۆکی کارەساتەکە هەر لە کایەدا مابوو. بە باری چالاکی رۆشنبیری و داکۆکی کردندا رۆژنامەی (ژیانەوە) یەکێك بوو لەو دەزگایانەی ئەرکی پڕوپاگەندەکردنی بۆ بەریتانیا گرتبووە سەر شان. لاپەڕەکانی پڕن لە دەیەها نموونەی نووسین لەسەر کۆششی گوایە زۆر دڵسۆزانەی بەریتانیای فەخیمە بۆ مافی کورد.

جەمیل سائیب هەتا ژمارە (٣٧)ی رۆژنامەکە سەرنووسەری بووە و (أموری تحریرییەی)(*) بەدەست ئەوەوە بووە و من باوەڕم وایە کە زۆری ئەو وتارانەی ناوی نووسەریان دیاری نەکراوە، هەر خۆی نووسیونی. بەم جۆرە ئێمە لێرەدا بەرەو رووی هەڵوێستی سیاسی ئەو رۆژانەی جەمیل سائیب دەبینەوە کە بە ئاشکرا دیارە چەند بەرامبەر بە شێخ مەحموود دژ و داخ لە دڵ بووە و لە چیرۆکی (لە خەوما)یدا (وەك دوایی لێی دەدوێین) گەیاندوێتییە ئەوپەڕی. ئەوی راستی بێ، ئەمیش وەك هەر یەکێکیتر لە منەوەرانی ئەو رۆژگارە، دەبوو لەو وەختەدا یەکێ لەم سێ هەڵوێستە هەڵبژێرێ. یا دەبوو لەگەڵ ئەوەدا بێ کە ویلایەتی مووسڵ هەر لە سنووری تورکیای کەمالییەکاندا بمێنێتەوە کە دیارە بەوە دەچووە ریزی تورکخواهەکانەوە. یا دەبوو لایەنی ئەوە بگرێ کە بخرێتە سەر دەوڵەتی عێراقی ژێر دەستەی بەریتانیا و بەوە

(*) ژیانەوە، ژمارە ٣٧ دامێنی لاپەڕە ٢، ژمارە ٣٨، لاپەڕە ١.

دەیدایە پاڵ ئینگلیزخواهەکان. یا دەبوو پشتی شێخ مەحموودێك بگرێ کە کاری لەکار ترازابوو، و لە شکستیدا بوو.

جەمیل سائیب هەڵوێستی دووەمیانی هەڵبژارد و هەر هیچ نەبێ بە نووسین، بە تایبەتی لە رۆژنامەی (ژیانەوە)دا چالاکی بۆ دەنواند. وەنەبێ ئەم و منەوەرەکانیتری وەك ئەم، بۆ سەلماندنی ئەم هەڵوێستەیان لە رووی دوانەکەیتردا بەڵگە و بەهانەیان بە دەستەوە نەبووبێ. لەولاوە چەوساندنەوە و زوڵم و زۆری دەیەها ساڵەی عوسمانییەکان و سەرکوتاندنەوەی گەلی کورد. لەم لاشەوە بە سەرێك شکستی هێنانی شێخ مەحموود و بەدوایدا نائومێدی و ورەبەردان و ئاشووبە. بە سەرێکیش بەڵێنی یەك لە دوای یەکی بەریتانیا و دەوڵەتی عێراق سەبارەت بە مافی نەتەوایەتی کورد و بە کردەوەش (با بۆ خەڵەتاندن و چەواشەکردنیش بووبێ) جێبەجێ کردنی هەندە شتێکی، بەتایبەتی لە رووی خوێندەواری و رۆشنبیرییەوە. ئەمە وەزعێکی تەواو لەباری دەخوڵقاند بۆ ئینگلیز خۆی و هەموو بەرەی ئینگلیزخواهان کە بۆ بەڵگە و بەهانە رانەمێنن لە سەلماندنی راستی هەڵوێستیان و بەرپەرچدانەوەی دوو هەڵوێستەکەیتردا.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، ئەگەر لەم رووەوە بەشێوەیەکی زیاتر تایبەتی باس لە جەمیل سائیب بکەین و لە نزیکترەوە سەرنجی ئەو هەڵوێستەی بدەین، دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە ئەم بە رادەی یەکەم وەك داخ لە دڵێك دژی شێخ مەحموود وەستاوە نەك وەك ئینگلیزخواهێك. چونکە لەلایەکەوە جگە لە چیرۆکەکەی، لە نووسینەکانیتریشیدا کە من بە هی ئەویان دەزانم (ئەگەر بە هەڵە نەچووبم و هی ئەو بن)، بە پێچەوانەی هەندێ لە نووسەرانیترەوە، خۆی لە مەدح و ستایش و پیاهەڵدانی ئینگلیز و بەریتانیای فەخیمە نەداوە، بەڵکو پتر باسی هەر لە شێخ مەحموود و لێ خوێندنی بووە. لەلایەکیتریشەوە، لە وەزیفەی میری یا لە دام و دەزگاکانیتری ئەو سەردەمەدا، دەورێکی وەهای نەدیوە کە سەرنج رابکێشێ و مەغزایەك ببەخشێ. لە زەمانی عوسمانییەکانا کاتبی باج بووە. لە وەختی دەسەڵاتی ئینگلیزەکاندا کراوە بە کاتبی دایەرەی (خەزینە-حسابات). دوایی بووە بە بەڕێوەبەری دایەرەکە. ((تا لە ساڵی

١٩٤٩دا خانەنشین کرا))(*)وە. ئەمە لەکاتێکدا کە بەهرە و توانا و رادەی تێگەیشتن و خوێندەواری ئەم، گەلێ لەوانە بەرزتربووە کە شوێن و پایەی بڵندیان دراوەتێ.

مامۆستا جەمال بابان باشی بۆ چووە کە کوشتنی عارف سائیبی برای و جمال عیرفانی ژن برای لە ساڵی ١٩٢٣دا، وەك هەر مرۆڤێکی خاوەن هەست و بەزەیی، کارێکی گەورەی تێکردووە و داخ و خەفەتێکی زۆری خستۆتە دڵەوە. چونکە هەردووکیان جگە لە خزمایەتیش، دوو منەوەری رووناکبیر و لێهاتوو بوون و تەنانەت دڵسۆزی شێخ خۆشی بوون، بە تایبەتی عارفی برای کە لە کاتی فەرمانڕەوایی شێخ مەحموددا ((یەکێك بوو لە گەنجە تێگەیشتووە پێشکەوتنخوازەکان. بۆیە شێخ کردی بە سکرتێری تایبەتی خۆی))(). بەڵام لە هەمان کاتدا دەبێ لەوە بەئاگا بین کە جەمیل سائیب هەر لە بنەڕەتەوە وەك عارفی برای نەیدابووە پاڵ شێخ. بەڵکو لە تاو وەزعی ناهەمواری ناو شاری سلێمانی: ((بەخۆی و ماڵ و منداڵییەوە سلێمانی جێهێشت، چوو بۆ کەرکووك، دوو ساڵێك لەوێ مایەوە، تا ساڵی ١٩٢٤ کە حکوومەتی عێراق دامەزرا، ئەوسا ئەویش گەڕایەوە سلێمانی))(). واتە دەبێ ئەو هەر لە ساڵی (١٩٢٢)ەوە کە هێشتا شێخ لەناو شاردا حوکمڕان بووە و دەسەڵاتی بەسەریدا هەبووە، ئیتر سا لە دژایەتییەوە بووبێ یا لە کەمتەرخەمی و بێ لایەنییەوە، هەڵاتبێ بۆ کەرکووکی ژێر دەسەڵاتی راستەوخۆی ئینگلیزەکان. داخۆ دەبێ سەبارەت بەمە چی بڵێین؟!.

من پتر رام بۆ ئەوە دەچێ کە ئەم کردەوەیەی لە کەمتەرخەمی و بێ لایەنییەوە بووبێ، بەڵام دوای ئەوە هەردوو باری (زاتی و مەوزووعی) وایان لێکرد بە لای دژایەتیدا لابدا و بکەوێتە ریزی بەرەی دوژمنانی شێخەوە.

---

(*) لە خەوما، چاپی ١٩٧٥، پێشەکی جەمال بابان، لاپەڕە (٤، ٥).

() سەرچاوەی پێشوو، ل ٨.

() سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٣.

ئەم دژایەتییەی جەمیل سائیب بەرامبەر بە شێخ مەحموود، شـێوەیەکی تایبـەتی وەرگرت. واتە شـێوەی منـەوەرێکی قەڵـەم بەدەسـت و چـەکی نووسـین و بەتایبـەتی نووسینی ئەدەبی لێ بخاتە کار. چیرۆکی (لە خـەوما)ی کـە بایەخـدارترینی نووسـینە ئەدەبییەکانییەتی و کە منیش لێرەدا بە تایبـەتی لێـی دەکۆڵمـەوە، دێـڕ بـە دێـڕی تەرخانە بۆ هێرشبردنە سەر شێخ مەحموود و ئەوپەڕی بەهرە و توانای ئەدەبی خۆی بـۆ ئەم مەبەستە تیا بەکارهێناوە، کە بەوە بێ ئەوەی خۆی لێی بە ئاگا بووبێ، یەکـەمین چیرۆکی هونەری لە ئەدەبی هاوچەرخی کوردیدا هێنایە بەرهەم و بۆ یەکەمجار نموونـەی ئەم بابەتە ئەدەبییە نوێیەی تیا هێنایە کایەوە.

## بە باری ئەدەبیدا

بەم بارەدا سەرەتا من چیرۆکەکە وەهـا دەنـوێنم: ((کابرایـەکی هـەژاری بـێ دەرەتان، لە خەویدا لە گەرمیانەوە بۆ کەسابەت دەچێ بۆ شارێکی بەرەوژوور. لە رێگا لەگەڵ کارواندا تووشی گەلێ دەردیسەری دێن، بەتایبەتی کـە دەگەنـە نـاو سنووری حوکمدارییەتی ئەو شـارەی بـۆی دەچـن. چـەندینجار جـەردە رێگـەیان پێدەگرن و دەبێتە شەڕ. ئەم هـەم تـرس و لـەرزی کوشـتن و هـەم مانـدووبوون و سەرما و تۆف و بـاران تـەواو زۆری بـۆ دێـنن. خواخوایـەتی زوو بگەنـە شـار و رزگاری ببێ، بەڵام کە دەگەن خراپتر تووش دێ. ئەم کە کابرایەکی لات و نابووتە و نیـەتی وەك کاروانچـییەکان سـەری خـۆی بقـەبڵێنێ، پێـوە دەبـێ و تۆمـەتی جاسووسییەتی دەدرێتە پاڵ. دەیگرن و دەیبەنە لای گەورەی شار. گەورە فـەرمان دەدا فرێی بدەنـە ژوورێکـەوە. ژوورەکـە بـەلای راسـتدا دەڕوانـێ بەسـەر ژووری (حەریم)ی گەورەی شاردا و بەلای چـەپدا دەڕوانـێ بەسـەر دیوەخـان یـا تـەختی فەرمانڕەواییەکەیدا. لەوێوە زۆر شتی پڕ سەیر و سەمەرە دەبینێ و دەبیسـێ کـە لە هەردوو ژوورەکەدا روو دەدەن و هۆی ئەو هەرا و ئاشووبەیەی ناو شـار و دەور و پشتی دەردەخەن. کابرا لە ئاسـتی یـەکێك لـەو شـتانەدا خـۆی پێڕانـاگیرێ و

دەداتە قاقای پێکەنین. گەورەی شار کە تا ئەو ساتە وایدەزانی هیچ کەسێکی بێگانە ئاگای لە کەین و بەینی نییە، لەم قاقایە رادەچەنی و لێی دەپرسێتەوە. تێیدەگەیەنن ئەوە کابرا جاسووسەکەیە کە خۆی فەرمانی دابوو فڕێ بدرێتە ئەو ژوورەوە. ئەوسا گاڵ دەدا کێشی کەنە بەردەمی و ئیتر بە لێدان بەردەبنە گیانی و داوای لێدەکەن دانی پیا بنێ کە جاسووسە. ئەو دەپاڕێتەوە و داد و بێداد دەکا.. بۆ خوا، بۆ پێغەمبەر، تۆ ئەسحابان، توو ئەسحابان، توو مەلائیکان، تو و چاکان و ئەولیا، تو و قورئان، تو و قەبری باوکت، هاوار، داد، هاوار...))(*) و ئیتر لێرەدا چیرۆکەکە دەقرتێ.

مامۆستا جەمال بابان هەرچەندە بە لە چاپدانەوەی چیرۆکەکە، کارێکی گەلێ بەجێی کرد و بە پێشەکییەکەی خۆشی بەری لێدوان و لێکۆڵینەوەی بۆ فراوانتر کرد، بەڵام بەم باری ئەدەبییەیدا هەقی خۆی نەداوەتێ و حەشاری داوەتە ژێر بارە سیاسی و مێژووییەکەیەوە. دیارە ئەو زیاتر بیر و هۆشی لای ئەوە بووە مەسەلەی ناوەڕۆکی چیرۆکەکە ساغ بکاتەوە کە داخۆ بۆچی دژی شێخ مەحموود نووسراوە و چ زروفێك پاڵی بە نووسەرەکەیەوە ناوە وەهای بنووسێ و تەقەلای داوە بەڵگە و بەهانەی مێژوویی خۆی بۆ دەستنیشان بکات کە ئەمە بێگومان کارێکی پەسند و بەجێیە، بەڵام ئەو راستییە بایەخدارەی فەرامۆش کردووە کە جەمیل سائیب ئەو ناوەڕۆکەی داڕشتۆتە قاڵبی کارێکی ئەدەبی ئەوتۆوە کە وەك لەوەبەر ئیشارەتمان پێدا، بۆ یەکەمجار نموونەی لە ئەدەبەکەماندا پەیدا دەبێ، نەك هاتبێ بەیاننامەیەکی سیاسی نووسیبێ یا ویستبێتی رووداوێکی مێژوویی تۆمار بکات. راستە دەگونجێ بووترێ: رەنگە ئەو خۆی بەو نووسینەی، داهێنانی ئەم بابەتە ئەدەبییە نوێیەی لە ئەدەبی کوردیدا هەر مەبەستیش نەبووبێ و لە بنچینەدا مەسەلەکە بەلایەوە لەوە بەدەر نەبووبێ کە بە هەر شێوەیەك بێ، بیروڕای خۆی بە نووسین دەربارەی ئەو بەسەرهاتانەی سەردەمی ژیانی خۆی دەرببڕێ، بەڵام بە هەر

---

(*) لە خەوما، چاپی ١٩٧٥، لاپەڕە ٧٤.

حاڵ، ئەو (ڕەنگە)یە هیچ لەو ڕاستییە ناگۆڕێ کە ئەو بەو کارەی بووە یەکەمین چیرۆکنووسی کورد لە کوردستانی عێراقدا و چیرۆکی هونەریش لە ئەدەبی تازەماندا، بەو نووسینەی ئەو ڕەنگی ڕێژرا و سەریهەڵدا. ئەم بایەخە ئەدەبییە گەورەیەی، دەبێ هەردەم شایستەی ئیشارەت پێدان بێت و چەندە ناوەڕۆکی چیرۆکەکە بە باری سیاسی و مێژووییدا بهێنرێ و ببرێ، ئەم لایەنەی بە باری ئەدەبیدا نرخی هەقیانەتی خۆی بدرێتێ.

هەر ئەو کارە بەجێیەی مامۆستا جەمال بابان، مەسەلەیەکیتری لەگەڵ خۆیدا هێناوەتە کایەوە. واتە مەسەلەی جیاوازی نێوان ئەو دەقەی چیرۆکەکە، کە لە ڕۆژنامەی (ژیانەوە و ژیان)دا بڵاوکراوەتەوە لەگەڵ ئەوەکەی لەمەڕ ئەم لە بەراوردکردنیاندا سەرنجمدا جیاوازن لە یەکتر، بەتایبەتی لە ڕووی زمان و داڕشتنەوە. بۆ نموونە با لەم چەند دێڕەی هەردوو دەقەکە وردببینەوە. لەوەی مامۆستا جەمال باباندا نووسراوە: ((ئەمجار دوانیان لاپەڕیان لێ گرتین، نەختێ سرپ و هووڕیان کرد و هاتنەوە نزیك ئێمە، کابرای کاروانچییان بانگ کردە لاوە، لەگەڵ ئەویش قەدرێ چرپە چرپیان کرد. کابرایەکەش هات بەلای منەوە و وتی باوکم ئەمانە بە هیوای ئەوەن شتێکیان بدرێتێ، منیش سوێندم بۆ خواردن کە تۆ لە هیچا نیت و هیچیشت نییە بیاندەیتێ، فەقەت ئەوان هەر دەست هەڵناگرن و چۆن لەژێر چنگی ئەم بەدبەختانە دەرتبێنین. منیش تێگەیشتم کە ئیشەکە ناڕەحەتە و ئەمانە تەشقەڵە ئەکەن. یان ئەبێ شتێکیان بدرێتی یان ئێمە بە قەڵبەیەکدا ئەدەن و منیش کێچ لە باخەڵمدا بۆ پوولێك سەوزەڵەگیانم ئەڵێ. هەرچەندە سەرم هێنا و سەرم برد چارەسەرێکم بۆ خۆم نەدۆزییەوە. وتم فلانی تۆ خۆت ئەزانی کە من هیچم نییە بیاندەمێ و خۆمان لە شەڕیان لادەین و ئاگاشم لەم شتانە نییە کە ئەوان ئەیلێن، جا کەیفی خۆیانە ڕەزام بە قەزای خوا، دەسەڵاتم چییە؟!))(*)، بەڵام لەوەی ژیانەوەدا بەم جۆرەیە: ((ئەمجار دوانیان

(*) سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٤.

چوونە ئەولاوە، بەدزییەوە قەدریێ سرپ و هووڕیان کرد و هاتنەوە. کابرای کاروانچییان بانگ کردە لاوە. لەگەڵ ئەویش قەدرێ چرپە چرپیان کرد. کابراکەش هات بەلای منەوە وتی ئەمانە مەقسەدیان ئەوەیە شتێکیان بدرێتێ. منیش سوێندم بۆ خواردن کە تۆ لە هیچا نیت و هیچیشت نییە بیاندەیتێ. فەقەت ئەوان هەر دەست هەڵناگرن. نازانم ئیتر چی بکەین و چۆن لەژێر چنگی ئەمانە دەرتبێنین. وتم فلانی تۆ خۆت ئەزانی کە من هیچم نییە بیاندەمێ و ئاگام لەم شتانەش نییە. جا کەیفی خۆیانە))(*).

وەك دەبینین جگە لە جیاوازی نێوانیان لە زمان و شێوەی دارشتندا، لە یەکەمیاندا چەند دێڕێك دەخوێنینەوە کە لە دووەمدا نییە و لە دێڕەکانیتریشدا چەند رستەیەکی لێ زیاد کراوە. واتە ئەو دەقەی مامۆستا جەمال بابان بلاوی کردۆتەوە، چ لە پوختکردندا و چ بە لێ زیادکردن دەستکاری کراوە، هەرچەندە کە لە ناوەرۆك و زنجیرەی کارەسات و رووداوەکانیدا هەر وەك ئەوەی یەکەمە. جا دەبێ بپرسین: ئاخۆ کێ دەستکاری کردووە و ئەمە چ ئەنجامێك دەبەخشێ؟

بێگومان یەکەمجار دەبێ رامان بۆ ئەوە بچێ کە بڵێین: دەگونجێ جەمیل سائیب خۆی کە (٢٦) ساڵ دوای بلاوکردنەوەی جاری یەکەمی چیرۆکەکەی کۆچی دوایی کردووە، پیاداچوویێتەوە و دەستکاری کردبێ، بەلام لێرەدا دەبێ هەر زوو ئەو پرسیارەش بکەین کە ئەگەر وابووبێ، ئەی چ عەجەب نووکە قەڵەمێکیشی لە کۆتاییەکەی نەداوە کە تەنانەت دەیتوانی بە تەنها رستەیەك یا بە یەك دوو دێڕێك کۆتایی پێبهێنایە وەك ئەوەی بینووسیایە: (بەدەم ئەم هاوار و داد و بێدادکردنەوە، لە خەوە سامناکەکەم راچەنیم و حەمد و سەنای خوام کرد کە ئەوەی ئەمدی خەو بوو). یا دەیتوانی بدا بە دەمییەوە و درێژەی پێبدا، نەك تەنها ئەوەی لەوەبەر نووسیویێتی

(*) ژیانەوە، ژمارە ٣٢ — ٣٣، تەمووزی ١٩٢٥.

دەستکاری بکات و بەپێی پێشکەوتنی زمان و ئەدەبی ئەو رۆژانـەی دەسـتکاری تیـا کردووە پوختی بکا.

کەوابێ دەگونجێ رامان بـۆ ئـەوەش بچـێ بڵـێین: جـەمیل سـائیب خـۆی دەسـتکاری نەکردووە، بەڵکو لەلایەن یەکێکیترەوە کراوە. جا ئاخۆ ئەو یەکە ئەبێ کێ بێ؟! ئـەو یەکـە یا دەبێ کەسێکی بنەماڵەی خۆی بـێ کـە دەستنووسـەکەیان لابـووە و دەشـزانین هـەموو رۆشنبیر و ئەدیب و ئەدەب دۆستن. یا جەمال بابان خـۆی بـێ کـە ئەگـەر بهاتایـە و بـەو چەشنەی دوکتۆر ئیحسان فوئاد دەربارەی (مەسەلەی ویژدان) ئەحمـەد موختـار کردویێتـی، دوو سێ لاپەڕەی دەستنووسەکەی بەردەستی بە زەنکۆگراف لە کتێبەکەدا بڵاوبکردایەتەوە، کلیلی مەسەلەکەی دەداینە دەست، بەڵام ئەو تەنانەت هیچ ئیشارەتێکی بـەوە نـەداوە کـە ئایا دەستنووسەکەی لەگەڵ دەقە بڵاوکراوەکەی لەوەبەردا بەراوردکردووە یان نا!

بەهەر حاڵ گرنگ ئەم بارەی مەسـەلەکە نییـە. بـەڵکو ئەوەیانـە کـە چ ئـەنجامێك دەبەخشێ! ئێمە لەوەبەر هەموو لەسەر ئەوە رێککەوتبووین کە (لە خەوما) بەو دەقـەی ساڵی (١٩٢٥)ی، یەکەمین چیرۆکی هونەری کوردییە. بەڵام ئەی ئاخۆ دەقە دەسـتکاری کراوەکەی ساڵی (١٩٧٥)ی بەچی بدەینە قەڵەم؟ ئاشـکرایە هـەموو نووسـەرێك تـا لـە ژیاندایە هەقی هەیە جارێك و دوان و دە، دەستکاری هەر بەرهـەمێکی خـۆی بکـات و بیگۆڕێ، بەڵام کە خۆی لە ژیاندا نـەما، هـیچ کەسـێك بـۆی نییـە بەرهەمـەکانی بـۆ دەستکاری بکات و جێگا و بایەخی مێژوویان بگۆڕێ، وەك لەگەڵ ئەم چیرۆکەی جـەمیل سائیبدا کراوە. بۆیە من تا ئەو وەختەی ئەم مەسەلەیە ساغ دەبێتـەوە، هـەر دەقەکـەی سەر لاپەڕەکانی (ژیانەوە و ژیان) بە دەقی راستی چیرۆکەکە دەزانم.

* * *

چیرۆکی (لە خەوما) هەرچەندە لە رووی هونەرییەوە وەك هەر بابـەتێکی ئـەدەبی کە تازە سەرهەڵدەدا، سادە و ساکارە و کەموکوڕی زۆرە. بەڵام لە گەڵێ رووی گەشیش خاڵی نییە کە تاڕادەیەك بەهرە و وەستایی نووسەرەکەی دەسەلمێنن.

نواندنی کارەسات و رووداوەکانی چیرۆکەکە لە چوارچێوەی خەوێکدا، ئەگەرچی جۆری باسەکەی سەپاندوێتی، بەڵام لە رووی هونەرییەوە یاریدەیەکی باشی نووسەری داوە کە بەر بۆ خەیاڵی هونەرمەندانەی بەرەڵڵا بکات و هەرچی مەبەستە، بە بیانووی گوایە خەوبینینەوە بێ سڵکردنەوە دەری ببڕێ. جگە لەوەی رێگای پێداوە کە ئەگەر لە هەندێ شوێنا لە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکەدا زۆر زیاد بڕوا و شوولی لێ هەڵکێشێ (واتە موبالەغە بکات) لێی نەگیرێ، چونکە لە خەوبینیندا ئەمە دەبێتە کارێکی ئاسایی. بۆ نموونە: بەندکردنی خەوبینەر (چیرۆك گێڕەوە) لە ژوورێکدا کە بەلای راست و چەپدا پەنجەرەی بڕوانێ بەسەر ژووری (حەریم) و تەختی فەرمانڕەوایی گەورەی شاردا، ئەمە لە کاتێکدا کە تۆمەتی جاسووسیشی درابێتە پاڵ.

بەڵام وەکیتر هەر هەڵبژاردنی ئەو ژوورە بۆ بەندکردنی خەوبینەر، کارێکی گەلێ هونەرمەندانەیە و گەشترین رووی هونەری چیرۆکەکەیە. نووسەر لەم رێگەیەوە ماوەی بۆ خەوبینەر کردۆتەوە کە بچێتە ناو جەرگەی کارەساتەکانەوە و لە بن دەستەوە باس و خواز و نهێنییەکانیان پێبزانێ و بیانگێڕێتەوە. لێرەدا ناچار دەبم ناوی (دۆزەخ)ەکەی هینری باربۆس بێنمە کایەوە. من دەزانم جیاوازی لە بەینیاندا ئاسمان و رێسمانە، بەڵام دەپرسم: ئاخۆ ئەم ژوورەی جەمیل سائیب لە ژووری ئوتێلەکەی لەمەڕ باربۆس ناچێ لەو رۆمانەیدا و پەنجەرەکانیشی شتێك نییە وەك کونە بچکۆڵەکەی دیواری ژوورەکەی باربۆس؟! لە یەکچوونەکە زۆر ئاشکرایە، بەڵام ئەوەتا باربۆس شاکارێکی لەسەر بنیاتناوە و جەمیل سائیب ئەوەی لەدەست نەهاتووە و هەرگیز نەشیدەتوانی لەو وەختەدا ئەمە لەدەست بێت. تەنها هێندە هەیە کە ئەگەر بهاتایە و لە سنووری ئەو ئامانج و مەبەستە سیاسییە تەنگەبەرە بیبردایە دەرەوە و بە باسێکی مرۆڤایەتی رەسەن و فراوانی ئەو سەردەمەی خۆیەوە بهاتایە بەر مەیدان، ئەوا چیرۆکەکەی بە بەریەوە هەبوو گەلێ بایەخدارتر و سەرکەوتووتر بوایە.

جگە لەمانە لە دارِشتن و شێوە نواندنی کارەساتەکاندا هەرچەندە راپۆرتانەیە و ساکارە، بەڵام پوخت و کاریگەرە و خوێنەر رادەکێشێ بۆ خوێندنەوەی چیرۆکەکە بێ

ئەوەی لێی بێزار ببێ. وەسفکردنی کەسان بە دیوی دەرەوەیاندا لە هەڵسان و دانیشتن و گفتوگۆ و جلوبەرگیاندا کە پتر بە باری گاڵتەپێکردن و تیر و توانج لێدان لێیان دەدوێ، بە شێوەیەکی تایبەتی لە چیرۆکەکەدا سەرنجڕادەکێشێ. هەروەها بە کوردییەکی رەوان و زمانێکی پاراو نووسراوە، ئەگەرچی وەك هەر نووسینێکیتری ئەو سەردەمە وشەی بێگانەی زۆر تێدایە و بە ئیملای ئەو وەختەش نووسراوە کە خوێنەری ئێستا کەمێ زەحمەتی پێوە دەکێشێ(*).

---

(*) مامۆستا جەمال بابان لە چاپکردنەوەیدا گۆڕیویێتییە سەر ئیملای نوێ.

==================================================

(*) ئەم نووسینە لە کتێبی: چیرۆکی هونەری کوردی ۱۹۲۵ - ۱۹٦۰، لە نووسینی: حسێن عارف (بغداد: دار الحریە للطباعة، ۱۹۷۷) دا بڵاوکراوەتەوە.

# چەند سەرنجێکی رەخنەیی دەربارەی چیرۆکی "لە خەوما"ی جەمیل سائیب

جەمشید حەیدەری

دوابەدوای چاپکردنی چیرۆکی (لە خەوما)ی نووسەری خوالێخۆشبووی کورد جەمیل سائیب لەلایەن مامۆستای چیرۆکنووس (جەمال بابان)ەوە لە رۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکاندا زنجیرە وتارێك دەربارەی چیرۆکەکە بلاّوکرانەوە و هەلّیانسەنگاند.

منیش بەو پێیەی کە ئێستا لە لینینگراد بۆ وەرگرتنی بەڵگەنامەی (دوکتۆرا) خەریکی نووسینی باسێکم لەسەر چیرۆکی کوردی لە سەرەتای سەرهەڵدانییەوە تاوەکو کۆتایی سالاّنی ١٩٦٠ بە پێویستم زانی کە زۆر بە وردی چیرۆکەکە و ئەو وتارانەی لەسەری نووسراون بخوێنمەوە، بەلاّم بەداخەوە جارێ هەموو وتارەکانم دەستنەکەوتووە و لەم وتارەشمدا باسی ئەوانەیان ناکەم کە چنگم کەوتوون، بەلاّم لە دوارۆژدا شوێنی خۆیان لەو باسەدا دەدۆزنەوە کە لەسەر چیرۆکی کوردی بلاّودەکرێتەوە.

ئەم وتارەی من بریتییە لە دوو بەش یەکەمیشیان دەربارەی ناوەرۆکی مامۆستا جەمال بابانە و بەشی دووەمیشیان دەربارەی ناوەڕۆکی چیرۆکەکە.

مامۆستا جەمال بابان لە پێشکییەکەیدا باسی ژیانی جەمیل سائیب ئەکا و چیرۆکەکە هەڵدەسەنگێنێ و بەپێی تواناش بەرگری لە هەڵوێستی جەمیل سائیب دەربارەی حوکمدارێتی شێخ مەحموودی نەمر ئەکا... سەرەتا دوو سەرەنج دەربارەی پێشەکییەکەی هەیە.. یەکەمیان: مامۆستا بابان نووسیویەتی: "لای خۆمان ریالیزمی

رەخنە بە شیعر لە زەمانی ئەحمەدی خانییەوە (١٦٥٠-١٧٠٦) دەستی پێکرد و بەرە بەرە پەرەیسەند لە زەمانی حاجی قادری کۆییدا"([١]). دووەمیشیان ئەوەیە کە لە پەراوێزی هەمان لاپەڕەدا نووسیویەتی: ئەگەر زیاتر وردی بکەینەوە لە زەمانی بابا تاهیری عوریاندا بە شیعر هەبووە (٩٣٥-١٠١٠)([٢]).

مامۆستا بابان کە چیرۆکەکە بە ریالیزمی رەخنەیی لە قەڵەم دەدا لەڕاستی دوور نەکەوتۆتەوە چونکە چیرۆکەکە ئاڕاستەی بار و سەردەمێکی واقیعی کراوە و مەبەستی نووسەر هاندانی خەڵك بووە دژی حوکمدارێتی شێخ مەحموود.

جێی سەرسووڕمانە کە مامۆستا بابان هەوڵی ئەوە دەدات کەوا پێشان بدات ریالیزمی رەخنەیی لە ئەدەبی کوردیدا دەگەڕێتەوە بۆ کاتی ئەحمەدی خانی یا بابا تاهیری عوریان. چونکە ئاشکرایە ریالیزمی رەخنەیی وەك رێڕەوێکی ئەدەبی لە سەدەی نۆزدەدا سەریهەڵدا و لە ساڵانی ٣٠ی سەدەی ناوبراودا خۆی چەسپاند... جا لام وایە لەوە ناچێت کە لە ئەدەبی کوردیدا پێش ئەوروپا سەریهەڵدابێت، بەڵام ئەگەر مەبەستی تەنها وشەی ریالیزم و رێڕەوی ریالیزمییانە بەجۆرێکی ساکاربێ ئەوە ئەتوانین بڵێین بۆ سەردەمی قۆناغی راپەڕینی ئەوروپا (عصر النهضة) دەگەڕێتەوە و نووسەرە گەورەکانی ئەوروپا وەکو: شکسپیر و سێرڤانتۆس دەستیان پێکردەوە.

هەروەها مامۆستا بابان نووسیویەتی: (لە خەوما) یەکێکە لەو کارە ئەدەبییانە بە شێوەیەکی ساکار و نەرم و لەسەرخۆ دەوری حوکمی شێخ مەحموودی حەفیدی لە سلێمانی خستۆتە بەر رۆشنایی و بەرچاوی خەڵك([٣])، بەڵام ئەگەر مرۆڤ بە وردی و قووڵبوونەوەوە لە ناوەرۆکی چیرۆکەکە بکۆڵێتەوە بۆی دەردەکەوێ کە وانییە و مامۆستا بابان تای جەمیل سائیبی گرتووە... چونکە جەمیل سائیب بە ئاشکرایی و بێ پێچ و پەنا و هونەرمەندانە رای خۆی دژ بە دەسەڵاتدارێتی شێخ مەحموود دەربڕیووە و گوایە ویستوویەتی ئەوە بسەلمێنێ کە جووڵانەوەکەی شێخ بۆ سوودی کورد نەبووە و هەر بەرژەوەندی تایبەتی شێخ خۆی بووە و بەس ((ئەوەی قازانج و خێری خۆمی تیانەبێ نایکەم))([٤]).

هەرچەندە مامۆستا بابان واپێشان دەدات کە رای خۆی دەربارەی حوکمداریێتی شێخ لەگەڵ رای چیرۆکنووسدا ناگونجێ، بەڵام لە نووسینەکەیدا بە ئاشکر دیارە کە تای جەمیل سائیبی گرتووە، ((بەڵام ئەگەر ئێمەش ئاورێك لەو رۆژانە بدەینەوە و بە ئینساف وەك خاوەنی ویژدان سەیری لایەنە باشەکانی یاخود ئیجابییەکان یاخود رووە پێشکەوتووەکان بکەین، ئایا چی ئەبینین بەداخەوە شتێکی ئەوتۆ نابینین بەرگری لەو دام و دەزگایە بکەین))(٥).

وادیارە مامۆستا بابانیش بە چاوێکی زۆر تەسك روانیوویەتی بە حوکمداریێتی شێخ مەحموددا و هەر تەنها کەم و کوڕی شێخ و دام و دەزگای دەسەڵاتداریێتەکەی ئەو ئەپێویٚ و ئیتر باری رامیاری و گەلێ لایەنیتری ئەو سەردەمەی پشتگوێ خستووە.. بەداخەوە وتارەکەی دوکتۆر (عیزەدین مستەفا رەسول)م لەلا نییە کە ئەڵێت ئەگەر خەونیش بێت، خەونێکی زۆر خۆشە.

مامۆستا بابان هەر لە هەمان لاپەڕەدا هەوڵ دەدات بەرگری لە شێخ بکات.. ئەڵێ: ((ئەوی خەتا و ئەنجامی ئەو بارە شێواوە ناهەموارەش بخاتە سەرشانی تەنها شێخ مەحموود خۆی. زوڵمێکە لەو پیاوەی ئەکات))(٦).

مامۆستا بابان دەیەوێ ئەوە بە خوێنەر بسەلمێنێ کە شێخ مەحموود ((خۆی پیاوێکی بە ئایین و راست و ئازا و نیشتمانپەروەر و دڵ ساف و داوێن پاك بوو))(٧).

بەڵام ئەم قسەی هەرگیز لەگەڵ ئەو قسانەیدا ناگونجێن کە لە لاپەڕە ١٤دا دەربارەی چیرۆکەکە کردوونی کە دەڵێ: (نەرم و لەسەرخۆ) ئەوە ئاشکرایە کە جەمیل سائیب لە چیرۆکی (لە خەوما)دا باسی دام و دەزگای دەسەڵاتداریێتی شێخ مەحموود ناکا بەڵکو شێخی کردووە بە قارەمانی چیرۆکەکەی.

مامۆستا بابان دەیەوێ بڵێ جەمیل سائیب سەر بە ئینگلیز نەبووە و پاکانەشی بۆ دەکا... ((ئەگەر وایش بووبێ لە هەوەڵەوە پڕوپاگەندەی بۆ ئینگلیزەکان کردبێت، بەڵام لە دواییدا ئەویش هەموو شتێکی بۆ روون بووەوە و ئینگلیزی ناسی))(٨). زۆر ئاشکرایە کە ئەم چیرۆکە بە هانەهانەی ئینگلیزەکان نووسراوەتەوە و پڕوپاگەندە

بووە بۆ دادپەروەریێتی داگیرکەر و ئەوانی بە رزگارکەری وڵات داناوە... بێگومان ئەم چیرۆکە دوای رووخانی حوکمداریێتی شێخ مەحموود و بوونی جەمیل سائیب بەسەرنووسەری رۆژنامەی (ژیان) نووسراوە و ئەمەشی بەڵگەیەکیترە کە مەبەستی جەمیل سائیب ئەوە بووە ئینگیزەکان بە پیاوچاك لە قەڵەم بدات و لە پەناوە پاکانەیان بۆ بکات کە گوایە ئینگلیز بۆ بەرژەوەندی کورد هەوڵ ئەدات و حوکمداریێتی شێخیش دژی بەرژەوەندی کورد بووە.

ناوەرۆکی چیرۆکەکە بۆمانی روون دەکاتەوە کە چیرۆکنووس تا چ رادەیەك گیانی کوردپەروەری تیا کزبووە و زۆر وردبینانە لە یەکەم لاپەڕەی چیرۆکەکەوە تا دوا لاپەڕە بەرگری لە داگیرکەرەی خوێنڕێژ و دز و جەردە کردووە بەو ناوەی کە گوایە ئینگلیز دادپەروەرن و لە مافی کورد بەرگری دەکەن.. دوا وشەم دەربارەی پێشەکییەکەی مامۆستا بابان ئەوەیە (ما اشبە اللیلة بالبارحة) چونکە بەراورد کردنی رووداوێك کە پەنجا ساڵ بەسەریدا تێپەڕیبێ لەگەڵ ئەمڕۆدا و پشتگوێ خستنی بار و زروفی ئەوسا و ئێستای کوردستان هەرگیز لە جێی خۆیدا نییە و ناگونجێ.

دەربارەی قارەمانی چیرۆکەکە کاك مەحموود زامدار دەڵێ: ((لەم چیرۆکەدا قارەمان نییە بەمانای ئەم وشەیە ئەگەر هەشبێت نووسەر خۆیەتی))([٩]) ئەوەی راستی بێ لەم چیرۆکەدا دوو قارەمان هەیە، یەکەمیان نووسەر یاخود خەوبین، دووەمیشیان گەورەکە (شێخ مەحموود)ی نەمر.

بەڵام دەربارەی زمانی چیرۆکەکە پشتگیری رای مامۆستا حسێن عارف دەکەم ئەوەی کە لە وتارێکدا لە کۆمەڵەی رۆشنبیری کوردی لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٦دا دەربڕی و کورتەی وتارەکەشی لە رۆژنامەی هاوکاریدا([١٠]) بڵاوکرایەوە، بەڵام ئەوەی من لێی بدوێم ناوەرۆکی چیرۆکەکەیە.. جەمیل سائیب بە هەستێکی ناپاك و ناحەزانەوە باسی حوکمداریێتی شێخ مەحموودی کردووە و هەوڵی ئەوەی داوە کە بە هەر جۆرێ بێ شێخی نەمر لەبەرچاوی کورد رەش بکات نەك وەك مامۆستا بابان فەرموویەتی ((نەرم و لەسەرخۆ)).

چیرۆكنووس واپێشان دەدا كە سەردەمی شێخ نالەبار و پڕ لە مەترسی و ئاژاوە بووە و ڕێگاوبان پڕ لە جەردە و دز و پیاوكوژ بووە.. بۆ ئەو مەبەستەش زۆر بە جوانی بە وشەی ساكاری كوردی هەستی دەروونی خۆیی تێكەڵ بە تابلۆی دەوروپشتی كردووە بۆ ئەوەی بتوانێ بە خوێنەری بسەلمێنی كە حوكمداریێتی شێخی نەمر لەسەر بناغەیەكی پووچ دامەزراوە.. و مەبەستی كاربەدەستانی ئەوساشی هەر ڕاو و رووتكردنی خەڵك بووە و بە زۆری زۆردارەكی دەسەڵاتی خۆیان بەسەر خەڵكدا سەپاندووە.

ئەوەی جێگای سەرسووڕمانیشە ئەوەیە كە نووسەر دیمەنێكی وامان پێشان دەدات كە نەچێتە عەقڵەوە وەكو ئەوەی كە دەڵێ: ((نەختێكیتر ڕۆیشتین گەیشتینە مەیدانێك لەوێ سەیرم كرد سێدارەیەك هەڵخراوە، لە ژوور ئەویشەوە سێ چوار داریتر پێكەوە داچەقاون پیاوێكیان پێوە بەستۆتەوە..هتد، لە خەوما، لاپەڕە ٣٩-٤٠.

لام وایە ئەمە زۆر لە ڕاستییەوە دوورە و نووسەر لە خۆیەوە بۆ خەڵەتاندن و چەواشەكردنی خەڵك هەڵی بەستووە ئەوەش هەر بۆ ئەوەی ئەوە بسەلمێنێ كە دەسەڵاتداریێتی شێخ مەحموود ناڕەوا بووە و دەبوایە بڕووخێ.. بۆیە رووخا و خەڵكی لە سایەی ئینگلیزدا ئازادبوون.. گومانی تیا نییە كە جەمیل سائیب لایەنگری ئینگلیزەكان بووە بۆیە چاوی لە هەموو كردارە ناپەسەند و دڕندانەكانی ئینگلیز پۆشیوە كە لە سالانی ١٩١٩ و ١٩٢٠دا بەرامبەر بە میللەتی كوردی (تاوەكو ڕووخانی دەسەڵاتداریێتی شێخ مەحموود) كردیان. بۆ نموونە ئەگەر چاوێك بە یاداشتەكانی مامۆستا ئەحمەد تەقیدا بخشێنین بۆمان ڕووندەبێتەوە كە چۆن بە زۆری زۆردارەكی خەڵك ناچاربوون لە شەقامەكاندا سڵاو بۆ میجەرسۆن بكەن و دەستەو نەزەر بۆی ڕاوەستن و جارێكیان وا ڕوویداوە كە پیاوێكی ناوداری سلێمانی سڵاوی لێ نەكردووە گەلێ جوێنی پێدراوە و تێهەڵدانی خواردووە([11]).

جا بزانین جەمیل سائیب چۆن شێخمان پێشكەش ئەكات.. چۆن بە ((نەرم و لەسەرخۆ)) قارەمانێكی بە جەرگی گەلی كوردمان كە لاپەڕەیەكی زێڕینی لە مێژووی ئازادیخوازانی سەدەی یستەمدا تۆماركردووە... بە خەڵك دەناسێنێ.

جەمیل سائیب دەڵێ: ((هەرچی حرکات وضعیتی گەورەکە هەیە هەمووی هەر غضبە وانانیتە))، ل ٤٧.

هەروەها دەیەوێ بەناڕەوا وای پیشان بدات کە مەبەستی شێخ هەر پارە لێدان و پاراستنی بەرژەوەندی تایبەتی خۆی بووە ((من ئەمانە نازانم، ئەم مانگە هەتا ئەچێتە سەر ئەبێ سەد هەزار لیرەی تۆم بۆ بگۆڕنەوە و بۆم تەواو بکەن))، ل ٤٩.

هەرچەند جەمیل سائیب هەر مەبەستی تانەدان لە شێخ مەحموود بووە، بەڵام بێ ئەوەی پێی بزانێ لاپەڕەیەکی مێژوویی ئەو قارەمانەمان دەخاتە بەردەست.. ((چەند جار چووم بە گژ ئینگلیزدا، لەگەڵ تورکدا تێك چووم.. تەشەبوسم بە روسیا و بولشەویك کرد وتم با میللەتەکە بکەوێتە رەحەتی و سەعادەتەوە))، ل ٥١-٥٢.

هەروەها نووسەر دەست بەسەرگرتنی ماڵی ئەو کەسانەی کە تای دوژمنیان گرتووە و بوونەتە پیاوی ئینگلیز بە زوڵم و کاری ناڕەوا دەژمێرێت و واپیشان دەدا کە ئەو جۆرە خەڵکە ((رایان کردووە و خۆیان لە شالاو و هالاوی زوڵم و زۆری ئەم زالم و خوێنخۆرانە نەجات داوە..))، ل ٥٦.

راکردنی خەڵك بۆ ئەو شوێنانەی کە لە ژێر دەسەڵاتی ئینگلیزی داگیرکەردا بووە بە گوێرەی قسەی چیرۆکنووسی ناوبراو وا ئەگەیەنێ ئەوان رایانکردۆتە پەنای عەدالەت ئەمنییەت، ل ٥٦.

وادیارە جەمیل سائیب تاڕادەیەك قینی لە شێخ و دەسەڵاتداریێتی شێخ بووە و هەموویانی بە جانەوەر و ستەمکار داوەتە قەڵەم... چونکە ئەڵێ: ((کەچی روانیم هەموو جانەوەرانە هەر لەبەرچاومن))، ل ٥٧.

هەروەها دەیەوێ وامان نیشان بدات کە شێخ مەحموود مرۆڤێکی بێ بڕوا بووە و ئامادە بووە لەگەڵ هەر لایەکدا رێککەوێ بە مەرجێ سەربەخۆیی و بەرژەوەندی تایبەتی خۆی بپارێزێ ((قەرارێکی قطعی و قول و تعهدات تەواو وەربگری رێگە و دام و دەزگا بۆ ئێمە دابنێن))، ل ٦٢.

هەرچەندە نووسەر هەوڵی ئەوە دەدات کە شێخمان وەکو کابرایەکی نەفام و نەزان پێشان بدات، بەڵام کاتێ کە شێخ ئەڵێ: ((تورك ئەو تورکە نەماوە)) ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە شێخ ئاگاداری ئەو دەنگوباس و گۆڕانانەی ئەو سەردەمەی تورکیا بووە.

پاش چاوپێکەوتنی شێخ بەو کۆمەڵەیەی کە سەر بە تورك بوون.. سائیب دەڵێ: ((ئەم کابرایە چ نەوعە ئینسانێکە و ئەوانە چ دەعبایەکن))، ل ٦٤.

کە چاویشی بە لایەنگرانی ئینگلیز دەکەوێ.. ئەوانیش (وەکو نووسەر ئاشکرای دەکا) پڕۆژەی خۆیان پێشکەش ئەکەن و دەڵێن تەنها ئینگلیز دەتوانێ رزگارمان کات.. چونکە دەوڵەتێکی بەهێز و توانایە.. ئەوەش لەیاد ناکەن کە بە شێخ بڵێن ئینگلیز دڵنەرم و تورك دڵڕەقن... ئەگینا ئەو معامەلەیەی کە تۆ نەفسی خۆت لەگەڵ ئینگلیز کردت، ئەگەر نیوەی ئەوەت لەگەڵ تورکدا بکردایە، ئەمین بە دە دەفعە ئیعدام کرابوویت، تۆ بزانە ئەم بەینە تورك هێشتی کەس بزانێ باسی میللەت و قەومییەت چییە و چی نییە، بەڵام حکوومەتی ئینگلیز وانییە..))، ل ٦٦.

وادیارە شێخ کۆمەڵەی سەر بە ئینگلیزی زۆرباش ناسیووە و زانیویێتی مەبەستیان چییە، بۆیە پاش پێشکەش کردنی پڕۆژەکەی ئەو تاقمە.. ئەڵێت: ((ذاتا دەمێکە ئەمەت ئەوێ... تۆ خۆت ئینگلیزی...))، ل ٦٨.

چیرۆکنووس بە جۆرێکی وا باسی نوێنەری ئەو کۆمەڵەیە دەکا کە باوەڕیان نە بە تورك و نە بە ئینگلیز نییە و تەنها باوەڕیان بە جەماوەری کورد و چەکی دەستیان هەیە.. کە مرۆڤ سڵیان لێ بکات و لێیان بترسێ.. ((قسەی هەلەق و مەڵەق، یەکێك ئەیکوشت، یەکێك ئەیبڕی... ئەم دەعبایانە ئێستا دونیا ئەرووخێنن.. شایان بە سەپانی خۆیان نە ئەزانی.. بەم نەوعە قسانە کردیان بە قیڕە و هەرا و وەك حەمامی ژنان بوو بە قاو و قێژ کەس نەیدەزانی ئەڵێ چی.. یان ئەبێ هەر خۆمان بین، جارێکیتر خۆمان ناکەین بە ژنی کەس.. بەخوا نە تورك و نە ئینگلیز نایەڵن بە رەحەتی و سەربەستی دانیشین ((...هێشتا ئەوان شێری جەنگەڵی کوردستانیان نەدیوە.. ئێمە خزمەتکاری کەس ناکەین...))، ل ٦٩-٧٠.

ئـەو دێڕانـەی سـەرەوە کـە وەرمگـرتن هەرچـەندە لەلایـەن نووسـەر (جـەمیل سائیب)ەوە، بە قسەی هەڵەق و مەڵەق لە قەڵەم دراوە، بـەڵام لـەلای مـن بەڕاسـتی هەستی هەموو کوردێکی دڵسۆز و نیشتمانپەروەری دەربڕیوە، چونکە تەنها یەکێتی و پشت بە هێزی گەل بەستن سەرکەوتن مسۆگەر دەکا.. لێرەشدا جەمیل سائیب پەردەی لە رووی خۆی هەڵماڵیوە و ئاشکرای کردووە کە چەندێ دڵسۆزی ئینگلیزەکانە و ئـەو دڵسۆزییەی خۆی تۆمار کردووە.

جەمیل سائیب لە کۆتایی چیرۆکەکەدا دەیەوێ بە هەر جۆرێ بێ خوێنەر رازی بکا کە مەبەستی شێخ لەو هەموو هەرا و هۆسەیە هەر بەرژوەندی خۆی بووە نـەك کـورد ((ئەوەی قازانجی خۆمی تیا نەبێ نایکەم))، ل ٧١.

ئەمە ((لە خەوما))ی جەمیل سائیب بـوو، لـە خوێندنەوەیـدا وادەردەکـەوێ کـە خەوێکی بە سام و ناخۆش بووە و لە رۆژگارێکی ناخۆش دەدوێ کـە کـورد دووچـاری بووە، بەڵام من لەگەڵ دوکتۆر عیزەدین دام کە ئەڵێت: ئەگـەر ئەمـە خـەونیش بێـت خەونێکی ناخۆش نەبووە..!

## پەراوێزەکان

(١) جەمیل سائیب.. لە خەوما .. بەغدا،١٩٧٥ لاپەڕە — ١٤.

(٢) هەمان سەرچاوە و هەمان لاپەڕە.

(٣) هەمان سەرچاوە و هەمان لاپەڕە.

(٤) هەمان سەرچاوە و لاپەڕە ٧١.

(٥) هەمان سەرچاوە و لاپەڕە ١٥.

(٦) هەمان سەرچاوە و لاپەڕە ١٥.

(٧) هەمان سەرچاوە و لاپەڕە ١٦.

(٨) هەمان سەرچاوە و لاپەڕە ٢٢.

(٩) ڕۆژنامەی (العراق).

(١٠) ڕۆژنامەی (هاوکاری)، ژمارە ٣٠٢، ڕۆژی ٣٠/١/ ١٩٧٦.

(١١) یادداشتەکانی ئەحمەد تەقی، سلێمانی، لاپەڕە ٣٤

==================================================

(*) ئەم نووسینە لە هەفتەنامەی "پاشکۆی عێراق" ژمارە (١٠) ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٧٧، لاپەڕە (٦-٧) دا بڵاوکراوەتەوە.

(*) بۆیە لەم وتارەدا پێش ناوی جەمشید حەیدەری نازناوی (د.) دانەنراوە، چونکە ئەو کاتەی ئەو بابەتەی نووسیووە و بڵاوکردۆتەوە هێشتا دکتۆرایەکەی وەرنەگرتبوو، ئەمەش پێمان دەڵێت تەنانەت پێش وەرگرتنی دکتۆرانامەکەشی (د. جەمشید حەیدەری) هەر نووسەرێکی خاوەن بەرهەم بووە. (د. ئازاد)

# له خەوما

عەبدولرەزاق بیمار

چیرۆکی هونەری سەرەتامان "له خەوما"ی (جەمیل سائیب) لەبەر گەورەیی قەبارە و لایەنە ئەدەبییە گەشەکەی بەتایبەتی شێوازی دڵڕاکێش و هەست بزوێن، زمانی رەوان، زنجیرەیی و زۆریی رووداوەکان، وەسفی ورد، قووڵبوونەوە لە وەسفدا ئەنجا توانای دەربڕینی مەبەستێکی سیاسی لە چوارچێوەی خۆکردی چیرۆکدا لەو رۆژگارە سەرەتایەی چیرۆکنووسیدا دەبێ بە کارێکی رابەرانەی نایاب و شایانە بە بەردی بناغەی ئەم بابەتە ئەدەبییە تازەیەی لە ئەدەبی هاوچەرخماندا بژمێرین.

ناوەرۆکی چیرۆکەکەش وەکو لە پێشەکییەکەی مامۆستا جەمال بابان* و شیکردنەوەی مامۆستا حسێن عارفدا روون کراوەتەوە و هەروەکو کە لە ژمارەکانی رۆژنامەی (ژیانەوە)دا کە خۆی سەرنووسەری بووە ئاگادارین بریتییە لە رەخنەیەکی توندوتیژ لە حوکمڕانی و لە شەخسی شێخ مەحموود خۆی و دارودەستەکەی لە ساڵی ١٩٢٢دا.

نووسەر جگە لەم چیرۆکە لە وتارەکانیشیدا ئەو رەخنە توندوتیژی بە زیادەوە نووسیوە و بە گورزێکی گەورەی بۆ سەر گیانی رێبازی تورك خوازەکان داناوە، ناوەرۆکی بیروباوەڕی رەخنەکەشی بریتییە لەوە:

١- کە دارودەستەیەکی لێنەهاتوو و کۆنەخواز جڵەوی کاریان گرتبووە دەست.

---

* له خەوما — جەمال بابان — پێشەکییەکەی، بەغدا، ١٩٧٥.

٢- کاربەدەستان پیاو خراپ و چەوسێنەرەوە و دڵڕەق بوون.
٣- شێخ هەلێکی مێژوویی گەورەی لەدەست خۆی و گەلەکەیدا کە لە جیاتی سازان لەگەڵ بەریتانیا دوو چاو و راوی تورك کەوت.

لەلایەنی هونەری چیرۆکیشەوە وادیارە نووسەر کە لە ئەدەبی تورکی و کۆششە سەرەتاییەکانی چیرۆکی عەرەبی لە عێراق ئاگادار بووە کە سەردەمێك باو بوو نووسەران پەنا بۆ (خەون) بەرن بۆ ئەوەی چمکێك لە بیروڕای خۆیان لەژێر پەردەی خەوندا دەربڕن. لەم رووەوە گەلێ بەرهەمی چیرۆکی خەوناوی نووسراوە کە بەناوی (قصص الرؤیا) ناودارە و لە عێراق بڵاوکراوەتەوە.[*] سەرباری ئەم پەردە خەونەش نووسەر ناوی خۆی نەبردووە و لە پەناوە و کەس نەناسانە رەخنە ئاگرینەکەی خۆی لە چوارچێوەی چیرۆکێکی خەونکردوودا لە رۆژنامەدا بڵاوکردووەتەوە. ئەو خۆپارێزییەشی لەبەر بارودۆخی سیاسی بەپێویست زانیوە چونکە نە کۆمەڵەکە بە تەواوی ئەو جۆرە خۆراکە ئەدەبییە سیاسییەی بۆ قووت دەدرا و نە بە چاوی لێبووردنەوە سەیری نووسەری دەکرد، نەخۆشی لە تۆژینەوە و بەرپرسیاریی تاڵ و ناکاوی دوژمنە سیاسییەکانی بێ خەم و دڵنیا دەبوو.

سوودێکیتری گەورەی خەون بۆ لایەنی تەکنیکە، کە پیاو لە خەوندا دەتوانێ بە یەکجار چەند دیمەنێك ببینێ و شریتی رووداوەکان زوو بێن و بچن و نووسەر ئەوەندە پابەندی چۆنیەتی راستی رووداوەکان نەبێت، بەتایبەتی لە دیمەنی ژووری حەپسخانەی کابرای هەژاردا ئەمە باش دەردەکەوێ کە ژوورەکە بەلای راستدا پەنجەرەیەکی بەسەر ژووری (حەرەم)ی گەورەی شاردا دەڕوانێ و بەلای چەپیشدا پەنجەرەیەکی دی بەسەر دیوەخان یان تەختی فەرمانڕەواییەکەیدا دەڕوانێ.[]

---

[*] د. عبدالاله احمد ، نشاة القصة وتطورها فی العراق ١٩٠٨-١٩٣٩، بغداد ١٩٦٩ .
[] حسێن عارف، ل ٢٤.

چیرۆکنووس زمانی پاراو و راوێژی دلڕاکێشه * به سەرنجی ورد لە کەسێتییەکان رادەمێنێ و هەڵسوکەوتی ناو دەروون و رەنگدانەوەی لە لەش و دەموچاویاندا تەڕدەستانە وێنە دەکێشێ.. سەرەڕا ئەکسەسوار و دیمەنی دیکۆر.

بە نموونە دیمەنی مەلاکان لەگەڵ حوکمڕاندا بەم جۆرە هونەرییە دەنەخشێنێ:

((مەلاکان هەر چواریان رەنگیان هێناوبرد و سەیرێکی یەکتریان کرد. لە دواییدا یەکێکیان تیا بوو نەختێ بە پەلەپەل قسەی ئەکرد و دانیشی لە دەما نەبوو. کلکی مێزەرە سپییەکەی شۆڕبووبووە خوارەوە هەتا لای پشتێنەکەی، عەسایەکی باسقەندەی بەدەستەوە بوو، سیواکێکی درێژی کردبوو بە پشتێنەکەیا هەر جارە تۆزێ بەرنووتی هەڵدەمژی و چمکی فەقیانە سپییەکەی لە قۆڵی جبەکەیەوە هاتبووە دەرەوە هەر عەجەلە و پەلەپەلی ئەکرد بۆ قسەکردن. لە پڕێکدا تێی هەڵکرد و وتی))

مەلایەکیتر بەم جۆرە وەسف دەکات و شێوە گفتوگۆکەی جوان تۆمار کردووە:

((یەکێکیتر لە مەلاکان وا بزانم زمانی نەختێ وەکو لاڵ بێ وابوو چونکە هەر قسەیەکی ئەکرد و تفێکی قووت ئەدا و بە تووڕە تووڕ کەلیمەیەکیتری تەواو ئەکرد، لەگەڵ قسەکان خێراخێرا دەست و پلی ئەجوولایەوە و سەر و سنگی بە قسەکانییەوە ئەهێنا و ئەبرد، وتی بەڵێ وەکو فلان ئەفەرموویت وایە. ئەمانە قەولێکی مەعرووف و موعتەبەر و موقتەدابیهین)).*

---

* سەرەڕای ئەوەی کە زمانەکەی بە لای شێوە زمانی شاری سلێمانی دەشکێتەوە، وشەگەلی وەکو (مانگوێتی، یەت) و پەڕاندنی (د) و پێش و پاشکردنی کار و ناوی بکەر لە ڕستەدا دەبینرێ. بەڵام هێشتا پاراو و بێ هەڵە و زیندووە.

ژیانەوە، ژمارە (٤٨).

*ژیانەوە، ژمارە (٤٩).

ئەمەی لەم چیرۆکە سەرەتاییەدا دەبینرێ هەنگاوێکی باشە بەرەو وێنـەگرتنی نـاو دەروونی کەسێتییەکان. یەك بە یەك رەنـگ و هێڵـی خۆیـان بـۆ تـەرخان دەکـات و بەرامبەر هەموویان بە پشووەوە دەوەستێ و سەرنجی خۆیان دەربارەیان پێشان دەدات. با ئەم دیمەنە سەیرکەین کە وێنەی چوار کەسی تێدایە دیاریکراوە. کابرای حـەپس لـە ژوورەکەی دەڕوانێ و دەڵێ:

"روانیم گەورەکە کە ئەمری کرد و منیان خستە ژوورەکەوە خـۆی بـە کەشوفێکەوە دانیشتووە فلّق و هووڕ نێرگەلە ئەکێشێ، کابرایتریش کە سەر لە بەیانی لەگەڵ ملۆزمەکان منـی هێنایـە ژوورەوە ئـەویش لـە خوارەوە وەستاوە. هەرچـی حـەرەکات و وەزعیـەتی گەورەکـە هەیـە هەمووی هەر غەزەبە و هەر ئەنانیەتە.

هەرچی حەرەکات و سەکەناتی ئەویشیان هەیە هـەمووی هـەر تەسلیم و ئیتاعەتێکی پڕ لە مەرایی و قوماربازی و درۆ و ریایە. یـەکێکیتریش لـە پـەنا دەرگاکـەدا وەسـتابوو هـەر فشەفشـی لێئەهات.. دەستێکی خستبووە سەر خەنجەرەکەی هـەموو لەشـی ئەجووڵایەوە، هەروا لە هـەموو ئەعزایـەکی خـوێن ئـەباری، بـێ دەنگ، بێ سەنگ، کـەس قسـە ناکـات، هـەموو قـوڕ و قـەپیان کردبوو. لەپاش نەختێ گەورەکـە سـەری بـەرزکردەوە رووی کـردە کابرای دان ئاڵتوون و وتی:

- تۆ نابێ قەت قسەیەکی راستت ببێ؟ تۆ ئاخیرەکـەی سـەری من بە فەتارەت ئەدەی. ئاخر ئەو هـەموو هـاش و هووشـەی تـۆ کردت! تۆ کە هاتیتەوە وتت چـی؟ کەچـی ئێسـتا دونیـا چـۆنە؟! ئەوانی تۆ هەڵتڕشت هەمووی درۆ و فیشاڵ بوو، بەخوا تۆ هەر بـۆ کوشتن چاکی.

ئەویش وتی:

- قوربان بە چیت باوەڕە ئەوانی من عــەرزم کــردی هــەمووی راست بووە و هیچی درۆ نەبووە، بەڵام مــن بڵــێم چــی مەســەلەی مەشهوورە ئەڵێ دار پوازی لەخۆی نەبێ ناقڵێشێ."*

کە دێتە سەر وێنەگرتنی (حوکمڕان) هەوڵدەدا تووڕەیی و جوێنفرۆشی کەللــەڕەقی بە جۆرێکی دیار پێشکەش بکات. ئەوەتا لە هەمان دانیشــتنی کەســەکانی پێشــوودا نووسەر دەگێڕێتەوە:

"کولەبنەکەی کە لای خواروی وەستا بوو ئەویش هەڵێدایــە و وتــی: بەخوا قوربان راست ئەکات.

ئەویش بەبێ وردبوونەوە و لێکدانەوە کتوپڕ وتــی: بــەخوا راســتە! دەستی کرد بە قسەی ناشیرین، جنێوی خراپ بەوانە دەستێکی دا بــە دەستا وتی: ئاخ من چی بکەم ئەترسم هەر نەگــەم بــەو رۆژە ئەمانــە وجوودیان لەناودا هەڵگرێ."

"کولەبنەی لای خواروو دیسانەوە هەڵێدایە وتی: قوربان. هێشتا لەناو خۆماندا هەزار کەسی خراپمان تێدایە، هەر خەریکی ئــیش تێکــدان و جاسووسین. بەخوا ئەمانە دەفع بکرێن چاکە. گەورەکەش لــەم قســانە رقی هەستا و چاوی لێ دەردەپەڕی و مارپێچی نێرگەلەکــەی فڕێــدا و هەستایە سەرپێیان وتی: هەرچی ئیشی مــن تێکبــدا نــابێ بمێنــێ... کوانێ مەلاکان نەهاتن؟"*

نووسەر لە دیمەنی کردار و رەفتاری (گەورەکە)وە زیاتر دەچێتە پێش و هەوڵدەدا بیروڕا، یان رێبازی حوکمڕانییەکەی بزانێ و بە خوێنەرانی رابگەیەنێ، ئایا بۆچی وا تووڕەیە؟ وا دڵ

---

*ژیانەوە، ژمارە (٤١).

*ژیانەوە، ژمارە (٤٣).

به داخە لە زۆر لایەن؟ ئایا بەرهەڵستانی ئـەو کـێن؟ ئـەو بـۆ میللـەت چـی دەوێ؟ ئـەم روونکردنەوەیەش تا رادەیەك جۆرە بێ لایەنی و بابەتییەکی چیرۆکنووس دەگەیەنێ، چونکە ئەگەر لەسەر زاری گەورە خۆشی بێ، کرد و کۆششی و چمکێك لە رابردووی پێشـاندەدات، لەوانەیە بەرگرییەکی باشیش بێت لە نیازچاکی و ئاواتی گەورەکە:

"لە پاشان گەورەکە دەمی هەڵهێنایەوە و نەختێ بـە حیددەتــەوە دەسـتی کرد بە قسەکردن و وتی: من ئەمە چـەند سـاڵە هــەوڵ و تەقــەلاّ ئــەدەم. برینداری و حەپسی و رەزاڵـەتم کێشـا، ئـەنواعی مسـیبەت و مــەرارەتم چێشت: دەستم لەسەر و ماڵی خۆم شت، هاتم تێکۆشـام، وتم بـەڵکو ئـەم میللەتە بۆ خۆی هەناسـەیەکی رەحـەتی هەڵکێشـێ و بـە سەربەسـت و ئازایانە بۆ خۆیان بژین و دەستی بێگانەمان بـە سـەرەوە نـەبێ. ئێمـەش وەکو ئەم میللەتانـەیتر بکەوینـە رەحـەتی و خۆشـی. زیـادی، گـەورەیی دەوڵەمەند و سەربەرز ببین و دینەکەمان بەرزبێتەوە. چەند جار چووم بەگژ ئینگلیزدا. لەگەڵ توركدا تێکچووم، تەشەببووسم بە رووسیا و بۆلشـەویك کرد، چەند خوێناومان رشت. ئەمــە مــن هیچـی بـۆ خـۆمم نـەکردووە، هەموویم بۆ ئەم دین و میللەتە کردووە. وتوومە با میللەتەکـە بکەوێتـە رەحەتی و سەعادەتەوە و دینەکـەمان زیـاد بکـات و بەرزبێتــەوە کەچـی لەگەڵ ئەم هەموو ئەحوالاّنەدا ئەوەتە هەموویان ئەبینین بەشێکی زۆر لــەم میللەتە لایان داوە لەمن و چوون شوێن غەیرە دین کـەوتوون. رۆیشـتوون بۆ ولاّتان خزمەتی فیکری ئەوان ئەکەن."*

*ژیانەوە، ژمارە (٤٨).

==================================================

(*) ئەم نووسینە لە کتێبی: پەخشانی کوردی ، لە نووسینی: عەبدولرەزاق بیمـار (بغداد: دار الحریة للطباعة، ١٩٨٨) دا بلاّوکراوەتەوە.

# كە ئەدەب دەبێتە گۆڕپانێك بۆ تۆڵەكردنەوە

جەبار سابیر

لەگەڵ هەموو زەرەر و زیانێكی گیانی و ماڵی شەڕە گەورەكانی دنیا، مرۆڤ زۆر و كەم سودی لەو شەڕانەش وەرگرتووە، چونكە هەمیشە بۆ یەكلاییكردنەوەی شەڕەكە بەسود و بەرژەوەندی لایەنەكان، لە پێشبڕكێی ئەوەدان كامیان كەرەستەی باشترو پێشكەوتووتر دروستبكەن تا بەقازانجی خۆیان شەڕەكە تەواوبێت. جەنگی یەكەمی جیهانی ئینسانی والێكرد فڕۆكە دروستكات و لە شەڕەكانیدا بەكاریبهێنێ، جەنگی دووەمی جیهانیش بە هەمان شێوە ئینسانی والێكرد بۆمبی ئەتۆمی دروستبكات و گەر ئەوكات بۆ لەناوبردنی بەشەر بووبێت ئەمڕۆ دەكرێ وەك سەرچاوەیەكی دەوڵەمەندی وزەی كارەبا بەكاربهێنرێت. لەبواری ئەدەبیشدا هەر جەنگی یەكەمی جیهان بووە هۆی نوسینی هەردوو ڕۆمانی(بەرەی خۆرئاوا ئارامە)ی (ئەریش ماریا ریمارك) و (ماڵئاوایی لەچەك)ی (ئیرنست هەمنەگوای). شەڕ پاڵینا بە ئینسانەوە تا كەشتیگەل و پاپۆڕ دروستكات بۆ كۆنترۆڵكردنی دەریاكان و، هەر شەڕیش ئینسانی هاندا تا فڕۆكە و شەمەندۆفێر و ئۆتۆمبیل و دواتر چەكی ئەتۆمیش دروستبكات. ئەمە بۆ هەموو كایە و بوارەكانی ژیان وایە، شەڕ دوور و نزیك و زۆر و كەم گۆڕانكاری تەواو لەسەرخان و ژێرخانی هەر وڵاتێكدا دروستدەكات كە شەڕەكەی تێدا ڕوودەدات. ڕەنگە زۆرینەی شاكار و بەرهەمە فەلسەفی و ئەدەبی و زانستییەكانی دنیا لەدوای شەڕی گەورەوە دروستبووبن، چونكە ئینسان هەمیشە ژان و ئازارەكانی پاڵنەری سەرەكین بۆ كردنی

هەركارێك. هیچ كاتێك لەخۆشگوزەرانی و ئاسوودەی و دڵنیاییدا بەرهەمێكی ئەدەبی یاخود فەلسەفی یان داهێنانێكی زانستی لە دایك نابێت.

سەرەتای سەدەی بیستەم بەهۆی هەڵگیرسانی جەنگی یەكەمی جیهانەوە تەواوی مرۆڤایەتی دەكەوێتە حاڵەتێكی شپرزە و پڕ جولەجولەوە، ئەم ناوچەیەی ئێمەی كورد كە ئەوكات لەلایەن هەردوو دەوڵەتی عوسمانی تورك و قاجاری فارسەوە بەڕێوەدەبرا، حاڵەتە شپرزەییەكە تەواو دەیگرێتەوە و كورد دەكەوێتە خۆی. ئەم كەوتنە خۆیەی كورد جگە لە لایەنی سیاسی و شۆڕشی چەكداریی لایەنی فەرهەنگی و رۆشنبیریش دەگرێتەوە و بەجارێ دەیان شاعیر دێنە بواری ریفۆرمی كۆمەڵایەتی و هۆشیاركردنەوەی خەڵك و هاندانیان بۆ بەگژداچوونەوەی كۆنەپەرستی كۆمەڵگە و دوژمنانی نەتەوەش تا خاكەكەیان لەژێر دەستەیی رزگار كەن. دواتریش ئەوە دەردەكەوێت كە كورد قازانجی زیاتر لە شۆڕشە رۆشنبیرییەكە كردووە وەك لە شۆڕشە چەكدارییەكە. شۆڕشە رۆشنبیرییەكە شاعیرانی وەك (بێكەس و ئەحمەد موختار جاف)و چەندانی تری لێكەوتەوەو وەك دەشزانین (گۆران)یش دەرهاویشتەی ئەو قۆناغە بوو كە شیعری كوردی نوێكردەوە و گەیاندییە لوتكە. رەنگە زۆر لەسەر ئەم قۆناغەی ژیانی كورد و بە تایبەت شیعری كوردی لەو كاتەوە تا سەرەتای شەستەكان قسەكرابێتو تارادەیەك مافی خۆی درابێتێ. بەڵام ئەوەی غەدری لێكراوەو وەك پێویست ئاوڕی لێنەدراوەتەوە نوسینی چیرۆكە لەو قۆناغەدا، واتا لە سەرەتای سەدەی بیستەوە تا نیوەی دووەمی سەدەی بیست، شتێك نییە پێی بوترێ چیرۆكی كوردیو ئەوەی لەو كاتەشەوە ناوینراوە چیرۆك بەرهەمی گۆڤاری (گەلاوێژ)بووە كە بۆ ماوەی دە ساڵ (١٩٣٩ تا ١٩٤٩) بە بەردەوامی دەرچووەو بایەخێكی زۆری بەچیرۆكداوە و دەكرێ دواتر قسە لەسەر ئەو بایەخدانەش بكەین كە لەو كاتەدا و لەو گۆڤارەدا دراوە بە چیرۆكی كوردی.

بەڵام نابێت هەروا سەرپێی لەو قۆناغە بڕوانین و خاڵیكەینەوە لە هەر جۆرە هەوڵێكی چیرۆكنووسین. چونكە ئێمە ئەوە دەزانین كە لە ساڵی (١٩١٣)دا چیرۆكێك

لە بڵاوکراوەیەکدا بەناوی(ڕۆژی کورد) بڵاو کراوەتەوە، چیرۆکەکە ناونیشانی نییە بەڵام نووسەرەکەی ناوی(فوئادی تەمۆ)یە ئەوەی جێگەی نیگەرانیشە نەنوسینی تر، نە هیچ شتێك لەسەر ژیانی ئەو پیاوە نەزانراوە. دواتریش لـە سـەرەتای بیسـتەکانی هـەمان سەدەدا واتا نزیکـەی دەسـاڵ دوای (فوئـادی تـەمۆ) ڕۆشـنبیرێکی ئـەودەمی شـاری سلێمانی بەناوی (جەمیل سائیب) لە یەکێ لە بڵاوکراوەکانی ئەو دەمدا کـە پێموایـە (ژیانەوە)بووە چیرۆکێك بەناوی (لە خەوما) دەنوسێ و لێرەوە یەکەمین بەردی بناغەی چیرۆکی کوردی دادەنرێت و ئەو چیرۆکە دەبێتە یەکەمین چیرۆکی کوردی. دواتریش لە سەرەتای سییەکاندا (ئەحمـەد موختـار جـاف) چـیرۆکێکی درێـژتر لـەوەی (جـەمیل سائیب) بەناوی (مەسەلەی ویژدان) دەنوسێ و هەندێك ڕۆشنبیر بە یەکـەمین ڕۆمـانی کوردی دادەنێن. ئەوەی ئێمە دەمانەوێ قسەی لەسەر بکەین چیرۆکی (لـە خـەوما)ی (جەمیل سائیب)ە کە تائەمڕۆش مشتومڕێکی زۆری لەسەرە و زۆرینەی خوێنـدەواران و ئەهلی ئەدەب بە یەکەمین چیرۆکی کوردی دەزانن و هەندێکیش پێیانوایە کە ئەمـە یەکـەمین چـیرۆکی کـوردی نییـە، بـەڵکو هـەوڵێکی ئـەو کاتـەی ئینگلیزبـووە بـۆ لەکەدارکردنی بزووتنەوەکەی (شێخ مەحموود)ی نەمر و (جەمیل سائیب) ڕقی لەشـێخ مەحمود بووە و لە ئینگلیزەکانەوە نزیك بووە بۆیە ئەم چیرۆکەی نووسیوە. بەڵام ئەوەی گرنگە لەم چیرۆکەدا ڕەخنە گرتنە لەو دەسەڵاتە کوردییەی کە شێخ بەڕێوەی بـردووە. پێش قسەکردن و لێکۆڵینەوە لە چیرۆکەکە دەکـرێ باسـی ئـەم قۆناغـەی ڕۆشـنبیری کوردی بکەین، کە دەشێ ناوی بنێین قۆناغی بەشاری بوونی ڕۆشنبیری کوردی. هەوڵی روناکبیر و شاعیرانی ئەودەم بۆ نووسینی چیرۆك، هـەوڵێکی هەڕەمـەکی و لـەخۆڕا و بێبەرنامە نەبووە، بەڵکو بەرنامەڕێژی بۆکراوە. ئەو رونـاکبیر و شـاعیرانەی ئـەوکات تەنیا بەوەوە نەوەستاون کەزمانی بێگانەی وەك (تـورك و فـارس و عـەرەب) بـزانن، بەڵکو هەوڵیانداوە لەگەڵ خەڵکی ئەو نەتەوانەشـدا تێکـەڵبن و لەگـەڵ کلتـوری ئـەو نەتەوانەشدا بکەونە دیالۆگ و ئەوەندەی بۆیان بکرێت سود لە کلتوری ئەوان وەرگـرن. ئەمەش کاتێك دەڵێین: کە لە بەرهەمی نووسەر و شاعیرانی ئەودەم دەڕوانین و لەگـەڵ

رابردوو، واتا پێش سەدەی بیست بەراوردیان دەکەین، چونکە پێش سەدەی بیست سەراپای رۆشنبیری کورد تەنیا شیعرە و جگە لە شیعر شتێکی ترنییە ناوی رۆشنبیری کوردی بێت. ئەگەر ئەو نوسراو و کتێبانە وەك رۆشنبیری کوردی بژمێرین کە لەلایەن زانا و پیاوانی ئایینی کوردەوە نوسراون لە چەشنی (شێخ مارفی نۆدێ)و پێشتریش (دینەوەری و ئامێدی و شارەزووری)ییەوەو خزمەتی کلتوری عەرەبیان کردووە، دەنا یەك دێڕی تر نییە لە دەرەوەی شیعر.

تێکەڵبوونی ئەو شاعیر و روناکبیرانەی ئەو قۆناغەی کورد بەکلتوری دراوسێ، جیهانبینی ئەوانی گۆڕی و وایلێکردن بیرکەنەوە کە جگە لە شیعر شتی تریش هەیە بە رۆشنبیری بژمێردرێ و وەك بابەتێك بۆ خزمەتی نەتەوەو ریفۆرمی کۆمەڵگە بەکار بێت. ئەوان شارە پڕ ئاپۆرا و گەورەکانی وەك ئەستەمبوڵ و تاران و بەغدادیان بینی و کاریگەری ئەو ژیانە نوێیە وایلێکردن لەوە تێبگەن کە کات درەنگی کردووە و ئیتر شیعر فریای مەسەلەکان ناکەوێت، دەکرێ زمانی ترو شێوازی تری دەربڕین بدۆزرێتەوە بۆ گەیشتنە ئامانج. (جەمیل سائیب) روناکبیرێکی بە ئەزموون بووە و چۆتە دەرەوەی کوردستان و تێکەڵاوی کلتوری تر بووە، بۆیە ئەو هەوڵەی داوە، دواتر (ئەحمەد موختار جاف)ی شاعیر ماوەیەکی زۆر نائیبی پەرلەمانی عێراقی و قائیمقامی هەڵەبجە بووە و زۆر تێکەڵاوی کلتوری عەرەب و فارس و تورك و بووە و هاتوچۆی شارە گەورەکانی بەغداد و ئەستەمبوڵی کردووە و، تیایاندا ژیاوە و ئەوە تێگەیشتووە کە شارستانییەت، تەنیا بەشیعر بنیات نانرێتو پێویستە شێوازی تری نوسین بدۆزرێتەوەو دواتر (مەسەلەی ویژدان) دەنووسێ. لەوێدا شار دەکاتە شوێنی رووداوەکان و بەزمانی خەڵکی شاریش دەنوسێو تەنیا بیر لەوە ناکاتەوە کە دواتر خەڵکی رەشو رووت هەر لە دیوەخانەکاندا شیعرەکانی ئەزبەرکەن. هەوڵی ئەوەدەدات ببێتە خاڵی وەرچەرخانی رۆشنبری کوردی و کۆمەڵگە لە خەوی غەفڵەت بێدارکاتەوە. (ئیبراهیم ئەحمەد)یش کە لە ناوەڕاستی سییەکانەوە واتا لەدوای ئەوانەوە دێت، بەهەمان شێوە کەسێکی خوێندەواربووە و هەر لەو ساڵانەدا کۆلیژی یاسا لە یەکێك لە

زانکۆکانی شاری بەغداد تەواو دەکات و ماوەیەکی زۆر لەو شارەدا دەژی و تەواو تێکەڵاوی کلتوری عەرەب دەبێت. زمانی عەرەبی بەباشی زانیوە، ئیتر هەوڵی خۆی لە بواری چیرۆکنوسیندا دەخاتەگەڕو دواتریش کە لەساڵی (١٩٣٩تا١٩٤٩)دا گۆڤاری (گەلاوێژ) دەردەکات زیاتر پەرە بەو هەوڵەی دەدات و بەرئەنجامی هەوڵەکەیشی کۆمەڵە چیرۆکێکی زۆر باشە و لەو گۆڤارەدا بڵاویدەکاتەوە و بەمجۆرە تا ساڵی شەستەکان جگە لەم سێ کەسە، کەسی تر هەوڵی نوسینی چیرۆکی نەداوە و دەکرێ بڵێین: ئیبراهیم ئەحمەد لەدووانەکەیتر پڕ بەرهەم تر و زمان پاراوتریش بووە و ئەوەبوو دواتر و لە ساڵی (١٩٥٦) یەکەمین رۆمانی کوردیشی نووسی بەناوی (ژانی گەل) و بەداخەوە تا کۆتایی شەستەکان چاپ نەکر او خوێندەواری کورد نەیبینی.

(لە خەوما) چیرۆکێکی تاڕادەیەك درێژە و دەکرێ ناوی بنێین نۆڤلێت. ئەم چیرۆکە بەشێوازێی زۆر سادە رووداوەکە دەگێڕێتەوە، دەسپێکەکەی بەمە دەست پێدەکات (خوایە بەخەوی بگێڕی) لێرەوە تێدەگەین کە کەسێك یاخود باشترە بڵێین: پیاوێك خەوێکی بینیوە و دوای خەبەربوونەوەی دەڵێ: خودایە بەخەوی بگێڕی، واتا ئەمە هەر لەخەودا وابێ و بەڕاستی روونەدات. لێرەوە شتێك بەسەر کەسی خەون بیندا هاتووە و ئەوەندە ترسناکبووە کە هیواداره و لە خوداش داواکارە ئەوە تەنیا هەر خەوبێ و هیچیتر. ئەم کەسە وەك دەڵێن: خەوی زڕاوە و ئیتر لەبەرخۆیەوە و هەر بۆ خۆی ئەو خەونە دەگێڕێتەوە کە بینیوێتی و تیایدا چی بەسەرهاتووە و چۆن بەسەری هاتووە و کێش بەسەری هێناوە. پانتایی چیرۆکەکە و شوێنی رووداوەکان و جوڵەی کەسێتییەکان لەناو شاردایە، زمانی کەسەکان زمانێکی تەواو شارییانەیە و دوورە لە هەر خەوش و خاڵێك کە ئەو دەمە زمانی کوردی هەیبووە.

خەو بۆخۆی حاڵەتێکە مرۆڤ توشی شڵەژان دەکات، بەهەردوو باری خۆشی و ناخۆشیدا، خەوی خۆش ئینسان گەشبین دەکاتو وایلێدەکات لەدوای بێداربوونەوەیەوە چاوەڕوانی شتێکی نوێ بکات کە دەستی کەوێت. خەوی ناخۆشیش ئینسان بەدبین دەکات و بەهەمان شێوە لەدوای بێداربوونەوەی ئیسنانەکە ترسی

ئەوەی هەیە شتێکی ناخۆشی بەسەر بێت. بەپێی شیکردنەوەی سایکۆلۆژیستان بۆ خەو بینین، ئینسان لە دوو حاڵەتدا خەو دەبینی، حاڵەتێك کە تەواو ترس چوار دەوری دەگرێت، یاخود خۆشی و شادمانییەك لەرێیەتیو لە زووترین کاتدا دەیگاتێ. حاڵەتێکی تر بەهۆی فشاری سەر ریخۆڵە و گەدەی ئینسانەوە دروست دەبێت لەکاتی خواردنی زۆر و ئەو جۆرە خۆراکانەی قورسن وەك پاقلەمەنییەکان، ئینسان هەمیشە لەکاتی زۆر خواردندا خەوی زۆرتر دەبینێ، هەر چەند ئەمە مەرجیش نییە لە سەدا سەد وابێت. گەر بگەرێینەوە بۆ خەوەکەی پاڵەوانی (لەخەوما)ی (جەمیل سائیب) دەکرێ بڵێین: ئەم کەسە ترساوە لەواقعێك کە تێیکەوتووە و بەچاوی خۆی ئەو شتانەی بینیوە کە لە خەوەکەیدا بەسەری هاتووە، لەکاتی بێداربوونەوەشیدا کەسی لە دەورنییە و بۆ خۆی دەگێرێتەوە، ترسناکی خەوەکەی وایلێکردووە یەکسەر بەم رستەیە دەست پێبکات (خوایە بەخێری بگێری) ئەوەی لە خەوەکەدا تووشی بووە هەمووی شەر بووە و لە خودا دەپارێتەوە بۆی بکاتە خێر.

لەژێر کاریگەری ئەدەبی ریالیزم و بەهۆی سەرکەوتنی کۆمۆنیزم لە روسیادا و لەوێیشەوە پەلهاویشتنی بۆ ئەم ولآتانەی ناوچەکە. کاریگەری تەواوی بەسەر کایەکانی ژیانی ئینسانداهەبوو، ئەدەبیش یەکێکە لەو کایانە و زیادەرەوی نییە گەر بڵێین: گرنگترین کایەی ژیان ئەدەبە، چونکە هەمیشە رەگەکانی سیاسەت دەچنەوە سەر ئەدەب، کە دواتر سیاسەت دەبێت سەرخانی کۆمەڵگە. چیرۆکی (لە خەوما)ش بۆخۆی دەکرێ وەك ئەدەبی ریالیزم لێ بروانین و پاڵەوانەکەیشی وەك پاڵەوانێکی واقعی یاخود ویژدانی ناودێربکەین. چونکە پاڵەوان لەم چیرۆکەدا پاڵەوانێکی واقعییە و لە ژیانی رۆژانەی خەڵکەوە دێت و بە زمانی خۆی لە خەمەکانی ئەدوێ، کە خەمەکانی ئەو دەبنە ئاوێنەی بەدیار خستنی تەواوی خەمەکانی خەڵکی سەردەمەکەی خۆی. لە چیرۆکەکانی (گێدی مۆپاسانو ئەنتۆن چیخۆف)ەوە چیرۆك رویکردە واقعییەت و ئەم چیرۆکەی (جەمیل سائیب)یش جا بەئاگا بێت یان بێگا لەژێر کاریگەری ئەو رەوتە

چیرۆکنوسییەی (مۆپاسانو چیخۆف) بەتایبەتی نوسراوە. لێرەوە و لە ناوەرۆکی ئەم چیرۆکەوە شتێکی سەرنج راکێشمان بۆ دەردەکەوێت کە ڕەنگە خراپ نەبێت لێی بدوێین. لەسەر دەمی ئەمڕۆدا گرفتی ژیانی رۆژانەی خەڵك نەبوونی پێداویستییە سەرەتاییەکانە، وەك نەبوونی غاز و نەوت و سووتەمەنی بە گشتی، نەبوونی ئاو، نەبوونی کارەبا و ئیتر رۆتین و گەندەڵی ئیداری و نەبوونی عەدالەتی کۆمەڵایەتی. بەڵام لەسەر دەمی (جەمیل سائیب) و لەکاتی نوسینی چیرۆکی (لە خەوما) شتەکان زۆر لە ئێستا سادەتربوون بۆ ئینسان، هەرچەند لە هەموو سەردەمێکدا ئینسان هەر ئینسانە، بەڵام تا بەرەوپێش بچێت تموحەکانیشی زیاتر دەبێت. چیرۆکنووس باس لەوەدەکات کە خەڵك لەوکاتەدا لە نێوان پێشمەرگەکانی شێخ مەحموود و سەربازانی ئینگلیزدا چۆن گیری خواردووە و چۆن زوڵمی لێکراوە. بەڵام گەر ئێستا (لە خەوما) بنوسرایا رەنگە باسی لەوە بکردایە کە ئینسان چۆن سێ شەو لە سەرەی بانزین وەرگرتندا دەوەستێت و سەرمای زستان لەگۆی دەخات و دواتر بەنزینەکەیش وەرناگرێت. باسی لەوە دەکرد کە لەساڵانی (١٩٩٧تا٢٠٠١) چۆن ئینسان لە خاڵی پشکنینی دێگەڵە و کۆیە گیری دەخوارد و تادەگەیشتە هەولێر و دواتر دەهاتەوە سلێمانی پازدە جار دایان دەبەزاند.

زمان لەم چیرۆکەدا پێش سەردەمەکەی دەکەوێت، نوسەر ئەوەندەی بۆی کرابێت خۆی لە وشەی بێگانە بە تایبەت عەرەبی و تورکی و فارسی پاراستووە و، پەنای بۆ وشەی کوردی بردووە و زۆر وشەی بەکارهێناوە کە لەو سەردەمەدا نامۆبووە و تەنیا بەزاری خەڵکەوە بووە، نەك لە نوسیندا بەکار هاتبێ. لەکاتی نوسینی چیرۆکەکەدا زمانی نوسینی خەڵك پڕبووە لە وشەی عەرەبی و فارسی و تورکیش، ئەم هەنگاوە پێشکەوتنخوازانە و نیشتمانیانەیەی (جەمیل سائیب) بۆ دوو هۆکار دەگەڕێتەوە: یەکەم: ناوبراو دژی شێخی نەمر و حوکمدارییەکەیشی بووە و ویستویەتی بە زمانێك قسەیان لەسەر بکات جیا لە زمانی خۆیان، کە هەوڵی پاککردنەوەیان نەداوە، لەکاتێکدا خۆشیان بە شۆڕشگێڕ زانیوە، دووەمیش: جەمیل سائیب پیاوێکی

روناکبیر بووە و نەیویستووە هەروا شتێکی سەرپێی و راگـوزەر بنوسـێ و بـۆ ئـەوەی نوسیوە مێژوو تۆماری کات و لەناو دڵی خۆیدا هەڵیگرێت. پاڵەوان یـاخود کەسـێتی چیرۆکەکە بەنیازی دەست کەوتنی کاسبی و پـارە پەیـداکردن لەگـەڵ کاروانێکـدا لـە گوندێکەوە روودەکاتە شار، ئیتر هەر لە نیوەی رێدا تووشـی تـەقوتۆقی راورووتکـەر دەبنەوە و ئـەم بـێ هیـوادەبێ لـەوەی کـە تەنانـەت بـە سـەلامەتیش بگاتـەوە نـاو خێزانەکەی. دواتریش بەنزیك بوونەوەیان لە شار و لە یەکەم خـاڵی پشـکنین لەلایـەن پاسەوانانی ئەو شـوێنەوە دەسـتگیر دەکـرێ و بـە تکـا و پاڕانـەوەی کـابرای خـاوەن کاروانیش ئازادی ناکەن و لای خۆیان گلی ئەدەنەوە.

گەر بگەڕێینەوە بۆ سەرەتای ئەم لێکۆڵینەوەیە، دەکرێ بڵێین: ئـەوە کوردسـتانی دوای جەنگی یەکەمی جیهانو سەردەمی حوکمڕانی باشو خراپی (شێخ مەحمود)ی نەمر بوو کە وای لە(جەمیل سائیب)کرد (لە خەوما) بنوسێت، ئەمەش بۆیە دەڵێین: چـونکە چـیرۆکەکە هیچ نییە جگـە لـەوەی کەکارکتەرەکـەیی خـەم و ئـازار و مەینەتییـەکی زۆری بەدەسـت حکومەتەکەی شێخی نەمرەوە چەشـتووە، هـەمان شـێوەی ئێسـتا، بۆیـە ئـەو چـیرۆکەی نووسیوە. لێرەیشەوە شەڕی سەرەکی چیرۆکنوس لەم چیرۆکەدا، شەڕێکە بۆ تۆڵەکردنەوە لـە کەسێك کە ژیانی ئەمی فەوتاندووە و لەسەر رەنجی ئەم ژیـاوە، کـە لێـرەدا رەنگـە ئـەمی نووسەر تەعمیم کرێـتە سەر تەواوی کۆمەڵگە. ئەوەی نووسەر دەیـەوێ تۆڵـەی لێبکاتـەوە (شێخ مەحمود)ی نەمرە (دەبێ ئەوەمان قبوڵ بێت کە بەمجۆرە ناوی شێخ بـەرین) چـونکە ئەو کەسەی لەم چیرۆکەدا و لە ماوەی سەعاتێکدا سـێ جـار بـیروڕای دەگۆڕێـت، جارێـك لەگەڵ تورکەو جارێك دژییەتی، جارێك لەگـەڵ ئینگلیـزە و جـارێکیتر دژییـەتی، جارێـك لەگەڵ هیچیان نییە و دژی هەردووکیان، ئەمە تەنیا پشـت بەسـتن بـە قسـەی کۆمـەڵێك خەڵکی بەرژەوەندخواز، وای لەم پیاوە واتا (شێخ مەحمود) کردووە کە بۆچوونی ئـاوا بێـت و خاوەن بۆچوونێکی سیاسی و راست و دروست و واقـع بینانـەی خـۆی نـەبێت لـەپێناوی نەتەوەکەیدا. کارەکتەری چیرۆکەکەی لە ژووری پشـتەوەی شـێخ مـەحموددا زیندانییـە و ژووری ئەودیویشی پڕە لە ژن کە پێدەچێت دیسان خێزانی شێخ بێت، چـونکە زۆر ژنـی تـر

دێنەلای و ماستاو و مەرایی بۆدەکەن و باسی کراس و ئەنگوستیلەی گران بەها و ئاڵتوون و شتیتر دەکەن کە گوایا فلانەکەسی نۆکەری جارانتان هەیـەتیو تـۆ نیتـە بۆچـی نـانێری لێیسەنن؟ ئەویش گورج بەقسەیان دەکات. لێرەدا ناچار دەبین ئاوڕ لـە ژیـانی ئـەو کاتـەی خەڵکی کورد بدەینەوە کە چەند پـڕ رەزالـەت و چەرمەسـەری و نـەبوونی بـووە و ژیـانی مەلیك مەحموودی نەمر و دارودەستەکەیش هەمان شـێوەی ژیـانی سـەرکردایەتی کـوردو دارودەستەکەیان چـەند پـڕ خۆشـگوزەرانی و ئاسـوودەیی بـووە. لەکاتێکـدا و نووسـەری چیرۆکەکە بۆ پەیداکردنی نان هاتۆتە شار و تووشـی ئـەم دەردەسـەرییە بـووە و، سـەرباری ئەوەش بە جاسووس و پیاوی ئینگلیزی دەزانن. لێرەدا دەکرێت ئەوەش بڵێین: کە زۆر کەس ئەم چیرۆکە بە چیرۆك نازانن و پێیانوایـە بەهانـدانی ئینگلیـز و (میجەرسـۆن)ی حـاکمی سیاسی ئـەوکاتی ئینگلیـز لەکوردسـتان نوسـراوە و تـەنیا پڕوپاگەندەیـەکی خراپـە، بـۆ ناوزڕاندنی شێخ مەحمودی نەمر و شۆڕش و حوکمدارییەکەی. بـەڵام ئـەو بۆچـوونەش وەك ئەم بۆچوونەی ئێمە، تەنیا بۆچوونە و مەرج نییە هیچیان راستبن.

دەکرێ لە دواجاردا ئـەوەبڵێین: کـە ئـەدەب باشـترین مەیـدانی تۆڵەکردنـەوەی بـن دەستانە لە سەردەستان و کاریگەرترین چەکی دەستی هەژار و نەداران نوسین و ئەدەبیاتـە. ئەوەشـی دەمێنێتـەوە هـەر ئـەدەبیات و شـاکارە ئەدەبییـەکان. رەنگـە لەپـەنجا سـاڵی داهاتوودا کەس ناوی (شێخ مەحمود)ی نەمر و شۆڕشەکەی لەبیرنەمێنێ، بەڵام هـەر لـەو پەنجاساڵەی داهاتووەدا ناوی (جەمیل سائیب)و چیرۆکی (لەخەوما) زیـاتر بدرەوشـێنەوە و باڵابەرزترین پەیکەریشی بۆدروستکرێت. ئەوەی جێدەمێنێ بۆ نەتەوەی کورد لە سی ساڵی سەرەتای سەدەی بیستەم کۆمەڵێك ناوی وەك (بێکەس و ئەحمەد موختار جاف و جـەمیل سائیب و رەفیق حیلمی)و چەند ناوێکی ترن. کەتا دنیا دنیایە و تاکورد بەرەو پێش بـڕوات ناویان گەورەتر دەبێت و جێگەی گەورەتر لە یادەوەری خەڵکدا داگیردەکەن.

=========================================

(*) ئەم نووسینە لە کتێبی: ژیان لە پێناو گێڕانەوەدا، نووسـینی: جـەبار سـابیر (سلێمانی: لە بەڕێوەبەرێتی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی، ٢٠٠٨) بڵاوکراوەتەوە.

# له خەوما

# له نێوان به واقعکردنی چیرۆك و به چیرۆککردنی واقعدا

جەبار سابیر

رەنگه پێمانوابێ ئەوه تـەنیا سـەدەی بیسـتەمه کـه پڕپـڕه لـه شـەڕ و خـوێن و توونوتیژی، ئەوه سـەدەی بیسـتەمه لێوانلێـوه لـه هـاواری ئینسـان بـۆ ئـازادی و رزگاربوون له نیری ژێردەستی، ئەوه سەدەی بیستەم بوو ئاوسبوو به شۆڕشی پڕۆلیتاریا و دروستبوونی دەیـان دەوڵـەتی نەتـەوەیی لەسـەر کـەوڵی ئیمپراتـۆره نەخۆشـەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست. بەڵام دەبێ بپرسین بۆ تەنیا هەر سەدەی بیستەم تاوانبار دەکرێت بەو جۆره تۆمەتانه؟ لێرەدا سادەترین بەرسڤێك ئەوەیه کـه سـەدەی بیسـتەم سـەدەی کرانـەوه و تێکـەڵبوونی کۆمەڵگـه و کیشـوەرەکان بـوو بـه یـەکتری و بـەهۆی پێشکەوتنەکانی بواری تەکنۆلۆژیا و راگەیاندنەوە، وایلێهات مرۆڤ ئاگـاداری زیـاتری دنیابێت و وای نەبینێ که دنیـا بریتییـه لـەو شـوێنەی ئـەوی لێـدەژی. رەنگـه لـه سەدەکانی پێشووتر و به درێژایی مێـژووی بەشـەر سـەدقاتی سـەدەی بیسـتەم مـرۆڤ کوژرابێ و خوێنی به ناهەق رژابێ، رەنگه له سەدەکانی ناوەڕاست و پێش زایینیشـدا تەنیا له شەڕە ئایینیی و مەزهەبییەکاندا به هێندەی ژمارەی ئێستای بەشـەری سـەر زەوی ئینسان کوژرابێ. (تەیموری لەنگ) له بیرەوەرییەکانیدا دەڵێ: تەنیا له یەکێك له شەڕەکاندا که مەملەکـەتێکم داگـیر دەکـرد، دوو منـارەم لـه کەللەسـەری ئینسـان دروستکرد و روومکرده خودا و وتم: خودایه ئەمه هەمووی له پێناوی تۆدایـه. بـەڵام

کە تەنیا باس لە سەدەی بیست و کوشتار و خوێنڕێژییەکانی ئەو سەدەیە دەکرێت، ئەوە تەنیا لەبەر ئەوەیە کە ئاگادارین و بینیومانە و دەیبینین و وەك مرۆڤ هەموومان ئاگاداری یەکترین و دەزانین چیمان بە سەردێ و چۆنیش بەسەرمان دێت و کێش بەسەرماندێنێت.

جگە لە مێژوو کە ورد و درشتی ڕووداوەکانی بە بێلایەنی و لایەنگیری بۆ نوسیوینەتەوە، ئەدەبیش زۆر زیاتر لە مێژووی بۆ نووسیوینەتەوە و زیادەڕەوی نییە گەر بڵێین: ئەوەی ئەدەب دەینووسێتەوە راستگۆیی زۆرتر تێدایە وەك ئەوەی کە مێژوو تۆماری دەکات. چونکە هەمیشە مێژوو ڕووداوەکان تۆمار دەکات، بەڵام ئەدەب ڕووداوەکان دەنووسێتەوە. ئەوەی مێژوونووسێك دەیکاتە کتێب تۆمارکردنی یادەوەری و بەشداریکردنی خەڵکە لە ڕووداو و شەڕەکاندا، بەڵام ئەوەی ئەدەب دەینووسێتەوە ئەزمونکردنی ڕووداو و ژان و ئازاری شەڕەکان. ئەوەندەی (میخایل شۆلۆخۆف)ی رۆماننووسی روس لە(چارەنوسی ئادەمیزاد)دا زانیاریمان لەسەر جەنگی جیهانی دووەم و ژان و ئازارە زۆرەکانی دەداتێ، رەنگە هیچ مێژوونووسێك نەیتوانبێت ئەو زانیاریانەمان بداتێ و بەوجۆرە پێناسەی جەنگمان بۆ بکات کە چەند کاریگەری لەسەر ژیانی ئینسان هەیە. لێرەوە ئەوەندەی ئەدەب کاریگەری لەسەر ئینسان هەیە هەرگیز مێژوو نییەتی. ئەوەندەی سروود یاخود شیعری (ئەی رەقیب)ی دڵداری شاعیر خەڵك دەهەژێنێ هەرگیز (شەرەفنامە)ی (شەرەفخانی بەدلیسی) ئەوەی پێناکرێ، کە یەکەمین سەرچاوەی مێژووی کوردە. (بێکەس)ی شاعیر توانیتی خەڵك لەبەر دەرکی سەرای سلێمانی لە ڕۆژی شەشی ئەیلولی ساڵی(٦/٩/١٩٣٠)دا بکات بەگژ سوپای عێراق و سوپای ئینگلیزیشدا، کە دەکرێ وەك یەکەمین خۆپێشاندانی مەدەنییانە لە مێژووی کورد و عێراقیشدا بیناسێنین. بەڵام (محەمەد ئەمین زەکی) مێژوونووسی مەزن بە هەموو گەورەیی خۆی ئەوەی بۆ نەکرا و پێینەکرا.

کورد تاقە نەتەوەی جیهان بوو کە بەو ژمارە زۆرەیەوە لە سەدەی بیست هاتە دەرەوە، بە بێ ئەوەی دەوڵەتی نەتەوەیی خۆی هەبێت، تاقە نەتەوە بوو ئەو سەدە پان

و پۆڕ و پڕ  شەڕ و شۆڕ و ئاژاوەو کارەسات و پێشکەوتنەی تێپەڕاند و پشکی لە هیچ شتێکدا نەبوو، جگە لە کۆست و کارەسات و مالوێرانی و دەربەدەری. یەك سەدە تێدەپەڕێ و کورد لە هیچ  بوارێکی ژیانی کۆمەڵایەتیدا ڕۆڵ و کاریگەری نەبووە و نەچۆتە سەر شانۆی جیهان، ڕەنگە دەرهێنەرانی شانۆی جیهانی لە کوردیان ڕانەپەرمووبێت تا ڕۆڵی کەوالیس و لاوەکیشی بدەنێ. ئالێرەوە لەو شەرمەی ئێستای کورد تێدەگەین کە لە ئاست جیهاندا هەیەتی، لە ئاست لاوازترین نەتەوەدا کە عەرەبە هەیەتی، لە ئاست بێ کلتورترین نەتەوەدا  کە تورکە شەرمێکی زۆری هەیە و خۆی زۆر بە کزۆڵەیی پێشانی دنیا دەدات. هەمیشە ڕۆڵی  قوربانی هەیە و هەرگیز نایەوێ ئەو ڕۆڵەی لێوەرگرنەوە. بەڵام ئایا بە ڕاستی کورد  قوربانییە و ئەوانی تریش جەلاد؟ ئایا قوربانی بوونی کورد تەنیا سووچی دوژمنەکانییەتی یان سووچی خۆیشی تێدایە؟ چیرۆکی (لە خەوما)ی (جەمیل سائیب) کە بە یەکەمین چیرۆکی کوردی ناودێر دەکرێت و هەروایشە، ئەوەمان تێدەگەیەنێ  کە نەخێر قوربانی بوونی کورد پشکێکی زۆری خەتاکەی بەر کورد خۆی دەکەوێت. ئەم  چیرۆکە لە سەرەتای بیستەکانی سەدەی بیستدا نوسراوە و ساڵی(١٩٢٣)  لە ڕۆژنامەی(ژیانەوە)دا بڵاوکراوەتەوە. ناوەرۆکی چیرۆکەکە باس لەوە دەکات کە پیاوێك  بەمەبەستی کار و کاسبی و پەیداکردنی پارە لە یەکێك لە ناوچەکانی دەوەرووبەری  سلێمانییەوە لەگەڵ کاروانێکی قاچاخچیدا ڕوودەکاتە شاری سلێمانی و هەر بە هاتنەناوەوەی بۆ شار لە لایەن سەربازانی دەسەڵاتەکەی (شێخ مەحمود)ی نەمرەوە  دەستگیر دەکرێت و تۆمەتی جاسووسی کردنی بۆ ئینگلیز دەدەنەپاڵ، کە ئەو کاتە عێراق  وەك دەوڵەتێکی کۆڵۆنی لەژێر دەستی ئینگلیزدابووە. دواتر لە ژوورێکی توند دەکەن و  هەر لەو ژوورەشدا گوێبیستی ئەوە دەبێت کە مێردی ژنێکیان هەر بە تۆمەتی جاسووسی بۆ ئینگلیز کوشتووە و ئێستاش هاتوون ماڵەکەی تاڵانکەن. ئەم پیاوە چەند جارێك لەم  شوێن بۆ ئەو شوێن دەگوازرێتەوە و جار بە جاریش خراپتر تۆمەتی دەدەنەپاڵ بە بێ ئەوەی کە گوێی لێبگیرێ و بزانرێ چ کارەیە و بۆچی ڕوویکردۆتە سلێمانی. دواجار کابرا دەبەنە

ژوورێك لە نێوان دوو ژووری تردا کە ژووری پێشەوەی خودی (شێخ)ی نـەمری لێیــە و ژووری دواوەیش خێزانی شێخ مەحمود و کۆمەڵێك ژنــی تــر. ئــەم پیــاوە گوێبیســتی هەموو ئەو قسانە دەبێت کە لە هەردوو ژوورەکەدا دەکرێن و خودی ئەو قســەکردنەش دەبنە مەتنی ئەسڵی چیرۆکەکە و خودی چیرۆکنووسیش ویستویەتی ئەو ڕووداوە دروس بکات تا ئەو قسانەی تێدا بکات.

لە ژووری ژنەکان لە ماوەی چەن خولەکێکدا زۆر شــتی ژنــانی تــر وەك ئــاڵتون و کراسی گرانبەها و خشڵ لە لایەن خێزانی شیخی نەمرەوە لە ختوخـۆڕا و بــێ هیچــی هەنجەتێك داگیر دەکرێت. لە ژووری پیاوانیش لە ماوەی چــەند کاتژمێرێکـدا شـێخی نەمر سێ جـار بیروبۆچـوونی سیاسـی دەگۆڕێـت و دواجـاریش هــەموو مەســەلەکان دەبەستێتەوە بە بەرژەوەندی تایبەتی خۆیەوە. ئیتر چیرۆکەکە هەر لــەو ژوورەدا و بــەو جۆرە قسەکردنە لەسەر شێخی نەمر کۆتایی دێت و چارەنووسی کـابراش بــە نادیــاری دەمێنێتەوە و نازانرێ چی لێدێت .لێرەوەدا ئەوەی گرنگە تێبیگەین ئەوەی کــە ئەمــە چیرۆکە و وەك پێشتریش وتمان ئەدەب جا چیرۆك بێت یان شیعر و ڕۆمــان ڕووداوەکــان وەك ئەزموونی خەڵك دەنوسێتەوە نەك تۆماری بکات. بۆیە گەر ئەم چـیرۆکە نەبوایــە چۆن ئەو لایەنە تاریکەی حوکمداری (شێخ مەحمود)ی نــەمرمان بــۆ ئاشــکرا دەبــوو؟ ئەوکات کورد مێژوونوسی نــەبووە و کــەم کەســیش لــە هاوســەردەمانی بزووتنــەوە و حوکمدارییەکــەی شــێخ لـــە یاداشـــتەکانی خۆیانـــدا جورئـــەتی نووســـینەوەی کەموکوڕییەکانی شێخی نەمر و حوکمدارییەکەیان هەبووە. بۆیــە ڕەنگــە تــا ســەدان ساڵی تریش (لە خەوما) تاقە سەرچـاوەی ڕەخنــەیی بێــت لەســەر شــێخ مــەحمود و بزووتنەوە و حوکمدارییەکەی. ئەوەش عەیبە نییە و شانازییە بۆ کورد بە گشتی.

لە خەوما هەوڵی نووسەرەکەیەتی بۆ دەربڕینی ڕاستییەك کە ئەوکات بە هۆشمەندی خۆی درکی پێکردووە، ئەم هەوڵــەی نووســەر بۆیــە کـراوە بــە چـیرۆك تــا سانسـۆری دەسەڵاتی ئەودەم و سانسۆری کۆمەڵگەش ببڕێت، بۆیە کراوە بە چیرۆك تا زیاتر بچێتە یــادەوەری خەڵکــەوە و خــەڵك ئازارەکــانی خۆیــانی تێدابدۆزنــەوە. ئــەوەی نووســەر

نووسێوێتی واقعە، بەڵام بـۆ بـە چـیرۆك و وەك خـەوێك دەربـڕاوە ئەمـەیان پرسـیارە جەوهەرییەکەی ئەم چیرۆکەیە. لێرەوە پرسی ئـازادی ئینسـان دێتـە پێشـی، ئـازادی ئینسان لەو کۆمەڵگەیانەی کە خۆیان حوکمی خۆیان دەکەن و کەسی بێگانـە ڕەقیـب نییە بەسەریانەوە. لە سەرەتای دروستبوونی مرۆڤەوە شەڕ لەسەر ئازادی و لە پێناوی ئازادیدا دەکرێت، شۆڕشی فەڕەنسی(١٧٨٩) لە ئاشەکەی خۆیـدا هـەزاران ئینسـانی هاڕی و هەموویشی بە ناوی ئازادییەوە بوو، تایـەکێك لـە وانـەی کـە برایـە بـەردەم (میقسەڵە)گیویتین، کە بۆ پەڕاندنی ملی هاواریکرد (ئای ئازادی بە ناوی تۆوە چـەند تاوان کرا) هەموو هەوڵی ئینسان لە شـۆڕش و ڕاپەڕینەکانیـدا بـۆ دەسـتەبەرکردنی ئازادییە بۆ ئینسانی کۆمەڵگەکـەی تاکەرامـەتی ئینسـانییان پارێزراوبێـت و کـەس پێشلی نەکات. بەڵام دواتر دەردەکەوێت کـە نـەخێر ئینسـان هـەر ڕزگـاری نابێـت و هەمیشە ملۆزمێك دروست دەبێت تا بیچەوسـێنێتەوە و لـەوەی پێشـوو زۆر زەجـر و ئازاری بداتێ. هەمیشە ئاغایەك هەیە خێر و بێـری ئـەم دەبـات و کـردەی خـەڵك و بردەی ئەو دەبێت. لـەم چـیرۆکەوە تێدەگـەین کـە لـە سـەردەمی حوکمـداری (شـێخ مەحمود)دا ئازادی ئینسان لەژێر پرسیاردا بووە، بۆیە پەنا بۆ شـێوازی تـری دەربـڕین براوە، تەنانەت بە چیرۆکیش جورئەت نەکراوە قسە لەسەر ئەو دەسەڵاتە بکرێت و لـە ناوچیرۆکەکەشدا پەنا بۆ خـەون بـراوە. دەسـتپێکی چـیرۆکەکە بـەم ڕسـتەیە دەسـت پێدەکات(خوایە بە خێری بگێڕی لە خـەوما) ئـەو دەمـە و ئێستایشـی لەگـەڵ بێـت کۆمەڵگە و ئینسانی کوردی نە لە چەمکی ئازادی و مافی هاوڵاتی بوون گەیشـتووە و تێدەگات، نە لە چەمکی دەوڵەت و حوکمدارێتی. نوسەر هەوڵیداوە واقع بکاتە خەون تا نەکەوێتە بەر تووڕەیی حوکمداریەکەی (شێخ مەحمود)ی نەمر و دیسـان خەونیشـی کردۆتە واقـع تـا خـەڵك ئاگـاداری دیـوە تاریکـەکانی حوکمدارییەکـە بـن و بـزانن چیدەگوزرێ بە ناوی ڕزگاری نەتەوە و نیشتمانەوە.

لە ڕووی زمانەوە ئەم چیرۆکە چەند هەنگاوێك لە پێش نووسەرانی سەردەمی خۆیەوە بووە، ئەوەندەی بۆی کرابێت پەنای بۆ وشەی بێگانە بەتایبەت تورکی و

عەرەبی و فارسی نەبردووە، سەرکەوتووانە وشەی دەمی خەڵکی قۆزتۆتەوە و لە چیرۆکەکەیدا بەکاری هێناوە. دیارە ئەمەش چەند هۆکارێکی لە پشتەوەیە کە ڕەنگە گرنگترینیان ئەوەبێت کە نووسەر ویستوویەتی لە ڕێگەی ئەم چیرۆکەوە ئاستی وشیاری نەتەوەیی و کوردبوونی خۆی زیاتر پێشان بدات بەوەی پێمان بڵێت: ببینن شێخ و بزووتنەوە و حوکمدارییەکەی ناتوانن هێندەی من کار بۆ بەرەو پێشبردنی زمانی کوردی بکەن. دواتر ئەوەیشی ویستووە کە بەم کارەی خزمەتێکی گەورەی زمانی کوردی بکات و خەڵکی سادە و ساکاری ئەودەمەش زیاتر لە نووسینەکەی تێبگەن. دیارە ئەمەش بۆ ڕووناکبیری (جەمیل سائیب) گەڕاوەتەوە کە لەو سەردەمەدا بەو زمانە کوردییە ڕەوانە بنوسێت، لە کاتێکدا پاککردنەوەی زمانی کوردی لە سەرەتای سێیەکانی هەمان سەدەوە، لە سەردەستی کۆمەڵێك شاعیری گەورە دەستی پێکرد کە ڕەنگە دیاترینیان (پیرەمێرد و گۆران)ی نەمربن. پێشتر زمانی کوردی ئەوەندەی وشەی بێگانە تێدابووە خوێندنەوەی زۆر زەحمەت بووە، ئەو ڕۆژنامانەی ئەو سەردەمەش بەتایبەت ڕۆژنامەکانی (بانگی حەق و ئومێدی ئیستقلال) کە زمانحاڵی بزووتنەوە حوکمدارییەکەی شێخی نەمربوون سیخناخن بە وشەی عەرەبی و تورکی. ئەمەش وایدەکرد خەڵك کەمتر توانای خوێندنەوەیانی هەبێت. کامڵبونی چینی شارنشین و سەرهەڵدانی بۆرژوازی لە هەر کۆمەڵگەیەکدا، تەواوی سەرخان و ژێرخانی ئەو کۆمەڵگەیە دەگۆڕێت، کە یەکێك لەستوونەکانی سەرخانی کۆمەڵگە ئەدەبەکەیەتی. گەر لە قۆناغی کۆیلایەتی و فیوداڵیدا کۆمەڵگە و تاکەکانی کۆمەڵگە تەنیا شیعر و داستانی میللی و ئەفسانەیان بەرهەمهێنابێت، ئەوا لەقۆناغی سەرمایەداری و دروستبوونی شارەکان و دواتر چینی بۆرژوادا، چیرۆك و ڕۆمان سەرهەڵدەدەن و ڕۆڵی گرنگ لە تەواوی بوارەکاندا دەگێڕن. لایەنێکی تری گرنگ لەم چیرۆکەدا بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە شوێنی ڕووداوەکان شارە، جووڵەی کەسێتییەکان لە شاردایە و ئەمەش شانازییە

بـۆ ئـەدەبیاتی کـوردی کـە چـیرۆکی بـە پێچـەوانەی شـیعرییەوە لـە شـاردا سەرهەڵبدات و بە زمانی شاریش بدوێت. زمانی شار مانای دووربوون لە هـەر جۆرە دەربڕینێکی گوندییانە و سەردەمی کشتوکاڵی، کە زمانی سەرەتایی هەر کۆمەڵگەیەکی دنیایەو دواتر داهێنانە زانسـتییەکان ئـەو زمانـە دەگـۆڕن بـە زمانێك کە زمانی شارە و زمـانی سـەردەمی تەکنۆلۆژیایـە و دوورە لـە هـەر دەربڕینێکی پێشتر لە ڕووی وشەسازی و ئیـدیۆم و شـتی تریشـەوە. بـە پێـی لێکدانەوەکانی ریالیزمی سۆسیالیزم لەژێر کاریگەری سەرکەوتنی کۆمۆنیزم لە روسیا و تیۆزەکانی مارکس و لینین و زۆر بیریاری تری سۆسییالیزم. وەك بەشێك لەسەر خانی کۆمەڵگە، دەبێت ئـەدەبیات ببێتـە گۆڕەپـانی ململانێـی نێـوان چینەکان، بەتایبـەت چـینی ژێردەسـت و چـینی سەردەسـت، هەمیشـە چـینی سەردەست بە زۆری هێز و تفەنگ چـینی ژێردەسـت سـەرکوت دەکـات و، لـەو ناوەشدا چینی ژێردەست کە زۆرینەی خەڵکن چەکی کاریگەری دەسـتیان تـەنیا هەر ئەدەبە و دەتوانن لە ڕێگەی ئەدەبیاتەوە تۆڵـەی ناعەدالـەتیی خۆیـان لـە چینی سەردەست بکەنەوە. لێرەیشەوە ئەدەبیات دەبێتە گۆڕەپانی تۆڵەکردنەوەی بەشخوراوان لە دەسەڵات و چینی سەردەست. ئەم چیرۆکەی (جەمیل سائیب)یش دەچێتە ئەو خانەبەندەییەی کـە ڕیـالیزمی سۆسـیالیزم لـە سـەرەتای سـەدەی بیستەمەوە کردییە مۆدێلێك بۆ ئەدەبیات، پێشتر ئەدەبیات تەنیا کارکردن بووە بۆ دەرخستنی جوانییەکانی ژیان، بەڵام سۆسیالیزم وایکرد ئەدەبیات ئـەرکێکی تریش بخاتە سەرشانی خـۆی، ئـەویش ئـەرکی بـەرگریکردن لـە زوڵملێکـراوان، لێرەیشەوە ئەرکی ئەدەبیات گرانتر بـوو تاڕادەیـەك دوور کەوتـەوە لـە ئەرکـە سەرەکییەکەی کە گەڕانە بە شوێن جوانیدا. هەر لەو ساڵانەیشەوە تیۆرێکی تـر هاتە گۆڕەپانەکەوە ئەویش ئایا ئەدەب یاخود هونەر بـۆ ژیانـە یـان تـەنیا بـۆ هونەرە و واتا تەنیا ئەرکی هونەر دەرخستنی هونەرە یاخود دەرخستنی ئێش و ئازاری چینێکی دیاریکراوی کۆمەڵگەیە کە زوڵملێکراوان و چـینی ژێردەسـتن.

نوسەریش لەم چیرۆکەدا دەیەوێ تۆڵەی خۆی لە بزووتنەوەکەی شێخ مەحمود بکاتەوە کە زوڵمیان لێکردووە. بەر لەم چیرۆکە لە ساڵی(١٩١٣)دا لە بڵاوکراوەیەکدا پێموایە ناوی(رۆژی کورد)بووە، چیرۆکێکی بێناونیشان بڵاوکراوەتەوەو ناوی نوسەرەکەی(فواد تەمۆ)یە. بەڵام شارەزایانی بواری ئەدەبی کوردی بەسەر ئەوەدا تێدەپەڕن و یەکسەر دەچنە سەر چیرۆکی لە خەوما، ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە(فوادی تەمۆ) کەسێکی گومناو بووە و تەنیا هەر ئەو نووسینەیشی هەیە و شتی تری بە دوادا نەهاتووە، چیرۆکەکەیش ناونیشانی نییە و لە ڕووی زمان و تەکنیکی چیرۆکیشەوە ناگاتە (لە خەوما)ی (جەمیل سائیب). ئەم چیرۆکە لە سەرەتای نوسین و بڵاوبوونەوەیەوە هەم وەك بابەتێك لە ڕۆژنامەی (ژیانەوە)ی ساڵی(١٩٢٣) هەم وەك کتێبێك لە سەرەتای هەفتاکانی سەدەی بیستدا، تائێستاش قسەی زۆر لەسەر دەکرێت، قسەکردنەکە چەند لایەنێکی هەیە. هەندێك وەك یەکەمین چیرۆکی کوردی ناودێری دەکەن و هەندێکیش هەر بە چیرۆکی نابینن و وەك پڕوپاگەندەیەك بۆ ناشیرینکردنی حوکمدارییەکەی شێخ مەحمود کە بە دنەدانی ئینگلیز نوسرابێت دەی ناسێنن. ئەمەش بەو دەلیلەی ڕۆژنامەی(ژیانەوە) کە چیرۆکەکەی تێدا بڵاوکراوەتەوە ئینگلیزی لە پشت بووە و خودی (جەمیل سائیب)یش پیاوێکی خۆشەویست نەبووە لای شێخ و حکومدارییەکەی و ئەویش وەك خودی خۆی، خۆی دوور گرتووە لە هەر جۆرە هاوکاری و کۆمەکێکی حوکمدارییەکە. ئەوەی گرنگە بۆ ئێستا و ئایندەی ئێمە و نەوەکانی داهاتووش ئەوەیە کە پێش (جەمیل سائیب) کەسیتر هەوڵی نوسینی چیرۆکی نەداوە و زمانی بەجۆرە بەکار نەهێناوە، لە دوای جەمیل سائیبەوە بە چەند ساڵێك (ئەحمەد موختار جاف)ی شاعیر هەوڵێکی تر دەدات و چیرۆکێك بە ناوی (مەسەلەی ویژدان)ەوە دەنوسێت و بیرۆکەکەیشی لە ڕووی ئینسانییەوە زۆر نزیکە لەگەڵ چیرۆکی (لە خەوما)ی (جەمیل سائیب). دواتریش لە دوای دروستبوونی گۆڤاری (گەلاوێژ)ەوە چیرۆك

دەبێتە پێویستییەکی سەردەم بۆ رۆشنبیرانی کورد. (ئیبراهیم ئەحمەد) دەبێتە پێشەنگی ئەو سەردەمە و چەند چیرۆکێکی زۆر بەرز بۆ ئەو کاتە دەنووسێت. وەك دەبینین لە ئێستاشدا چیرۆك زۆر دەنووسرێت و بڵاودەکرێتەوە، بەڵام هێشتا گرنگی و بایەخی تەواوی چیرۆك لای ئێمە دەرنەکەوتووە و نەیتوانیوە تەواو جێگە بە شیعر لەقکات. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا (لە خەوما)ی (جەمیل سائیب) بۆ هەموو سەردەمەکان وەك پێشەنگ دەمێنێتەوە و تا بەرەو پێشیش بچین زیاتر درەوشانەوە بە خۆوە دەبینێت. چونکە بەر لە هەر تەکنیك و هونەرێکی چیرۆکنوسی (لە خەوما) جورئەتی هەوڵدانە بۆ نووسینی چیرۆك لە کۆمەڵگەیەکدا کە ئەودەمە خوێندەوارەکانی هێندەی لاپەڕەکانی چیرۆکەکە نابێت. (لە خەوما) جورئەتی رەخنە گرتنە لە دەسەڵاتێك کە زۆرترین خوێنی بۆ رژاوە و دواتریش دڵی قوربانیانی دەڕەنجێنێ و گوێ بە هاوار و فوغانیان نادات. (لە خەوما) ئێمەی فێرکرد کە دەروێش نەبین بۆ دەسەڵاتی کوردی و پێی بڵێین: ئیتر ئێمەیش مافی قسەکردنمان هەیە و دەتوانین پێت بڵێین: لە کوێدا زۆر ناشیرینی و لە جەلاد دەچی.

==============================================

(*) ئەم نووسینە لە کتێبی: ئەفسوونی گێڕانەوە، نووسینی: جەبار سابیر (سلێمانی: لە بەڕێوەبەرێتی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی، ٢٠١٠) بڵاوکراوەتەوە.

# "له خەوما" لەنێوان دووسەدەدا

# خوێندنەوەیەکی نوێی چیرۆکی (له خەوما)ی جەمیل سائیب

**ئارام سدیق**

ئەگەرچی نووسین کردەیەکی زاتیە، بەڵام هەمیشە رەنگدانەوەی ئەو سەردەم و قۆناغەی کۆمەڵگەیە، کە تێیدا دەق بەرهەم دێت، وەزیفەی نووسین تەنها پیشاندانی رووە گەش و جوانەکەی ژیان نییە، یان راستر بڵێین تەنها بە خستنەرووی دیوە جوانەکەی قۆناغ و سەردەمێك وەزیفەی نووسەر کۆتایی نایەت، بەڵکو ئەرکی سەرەکی و بناغەیی نووسەر لە بەرهەمهێنانی دەقدا خستنەرووی ئەو لایەنانەی ژیانە، کە کەموکورتیان تێدا دەستنیشانکردنی ئەو کەموکورتیانەیە.

هەرلێرەوە دەتوانین بڵێین نووسین گەواهیدەری ئەو رووداوانەیە کە لە قۆناغێکی کۆمەڵگەدا روو دەدەن. قەسیدەی (قوربانی تۆزی رێگەتم..)ی نالی گەواهیدەری قۆناغێکی شاری سلێمانی و گێڕەرەوەی سۆزی غەریبی خودی نالیە. هاوکات وەڵامەکەی سالمیش (جانم فیدای سروەکەت..) ئەویش شاهیدێکی راستگۆی قۆناغی کۆتایهاتنی دەسەڵاتی بابان و هێرشی رۆمەکان و داگیرکردنی شاری سلێمانیە لەلایەن ئەو داگیرکەرانەوە. سالم زۆر بەوردی وەڵامی هەموو ئەو پرسیارانەی نالی داوەتەوە کە لە نامە شیعریەکەیدا کردوویەتی و وەکو

فۆتۆگرافەرێکی لێهاتوو وێنەی هەموو کوچە و کۆڵانەکانی شاری سلێمانی بۆ نالی گواستۆتەوە.

گرنگی ئەم شیعرە تەنها لەوەدا نییە، کە دەقێکی شیعری هەست بزوێن و پڕە لە سۆزی غەریبی و نیشتمان ...هتد، بەڵکو گرنگی ئەم دەقە لەوەدایە مێژووی قۆناغێك دەگێڕێتەوە و نالی و سالم هەردووکیان دەبنە مێژوونوسێکی راستگۆی ئەو قۆناغە. ئێمە لەبەر دەیان هۆکاری سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتی، کە نەمانتوانیووە ببینە خاوەنی زۆرشت و مێژوونوسیشمان نەبووە تا راستی و وردەکاریەکانی ئەو رووداوانە بگێڕێتەوە بۆیە شاعیرانمان لەو سەردەمەدا ئەرکی مێژوونوسیشیان بینیووە. ئەگەرچی هەردوو دەقەکەی نالی و سالم زیاتر بە شان و باڵی باباندا هەڵیانداوە و دژی رۆمەکان کاریان کردووە، بەڵام ئەو دوو دەقە لە ریزی جوانترین ئەو دەقانەن، کە مێژووی ئەدەبی کوردی شانازیان پێوەکات.

بەڵام بەهۆی تێپەڕبوونی قۆناغ و وشیاربوونەوەی زیاتری نووسەران و رۆشنبیرانەوە لەسەرەتای سەدەی بیستدا رەخنەگرتن لە دەسەڵات لەنێو نووسەراندا سەریهەڵدا لە زەمانی شێخ مەحمودی حەفیددا چەند نووسەر و رۆشنبیرێك رەخنەیان لە دەسەڵاتەکەی گرتووە و کەموکوڕییەکانیان دەستنیشانکردووە، ئەگەرچی لەوکاتەدا رەنگە راستەوخۆ نەیان توانیبێ رەخنەکانیان ئاراستە بکەن، بەڵام لە رێی دەقی ئەدەبی و بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ رەخنەیان ئاراستەی دەسەڵاتەکەی شێخ مەحمود کردووە، کە دەکرێت ئەو رەخنانە وەکو سەرەتای رەخنەگرتن لە دەسەڵاتی کوردی سەیر بکرێت.

ئەوەی مەبەستی سەرەکی ئەم نووسینەی ئێمە قسەکردنە لەسەر چیرۆکی (لەخەوما)ی (جەمیل سائیب)ە، کە یەکێکە لەو چیرۆکانەی هەندێك بە یەکەم چیرۆکی کوردی دەزانن و هەندێکی تر (مەسەلەی ویژدان)ی ئەحمەد موختار جاف بە یەکەم چیرۆکی کوردی دەزانن، بەڵام ساخکردنەوەی ئەم مەسەلەیە کاری ئێمە نییە و ئێمە تەنها دەمانەوێت لەم نووسینەدا لەسەر چەند لایەنێکی ئەم چیرۆکە قسەبکەین. تا نەوەی نوێ هەم ئاگاداری ئەو قۆناغەی مێژووی ئێمە بێت و هەم ئەو چیرۆکە لە خانەی لەبیرچونەوە دەربهێنێت.

لە خەوما شێوەیەکی ساکاری گێڕانەوەی لەخۆگرتووە و کات و شوێن تێیدا ونە، بەڵام ئەوە بۆ خوێنەر روونە، کە چیرۆکی "لە خەوما" لە زەمانی دەسەڵاتی شێخ مەحمودی حەفیددا نوسراوە و روداوەکانیش گێڕانەوەی واقیعی ئەو سەردەمەیە گرنگی ئەم چیرۆکە تەنها لەوەدا نییە، کە یەکەم چیرۆکی کوردیە، بەڵکو گرنگی ئەم تێکستە لەوەدایە کە یەکەم هەوڵی نووسەری کوردە بۆ رەخنەگرتن لە دەسەڵاتی کوردی. ئەگەرچی هەندێك کەس پێیانوایە ئەم چیرۆکە ویستوویەتی خزمەت بە دەسەڵاتی بێگانەی ئینگلیز بکات، بەڵام من تەواو پێچەوانەی ئەو ڕایانە لەم چیرۆکە دەڕوانم و پێموایە لە هەموو روویەکەوە رەخنەگرتنێکی جەریئانەی تێدایە لەمەڕ دەسەڵاتی شێخ مەحمود و دەسەلاتی ئینگلیزیش ئەگەر ئێمە بەوردی لە چیرۆکەکە رامێنین هەست بەوە دەکەین کە نووسەر تەنها لە هەوڵی خستنەڕووی رووە تاریك و ناشایستەکانی سەردەمی شێخ مەحموددا نەبووە، راستە هەوڵی خستنەڕووی ئەمەی داوە، بەلاّم هەوڵی رەخنەگرتن و ڕەتکردنەوەی دەسەلاّتی داگیرکەری ئینگلیزەکانیشدا بووە و ئەمەش بەروونی لەچیرۆکەکەدا و لەرێی دەنگە جیاوازەکانیەوە خراونەتەڕوو.

لەخەوما لەڕێی کەسی یەکەمی تاکەوە دەگێڕێتەوە و کە کەسێکی هەژارە و بەدوای کاردا شاری خۆی بەجێدێڵێ و دەیەوێ لە شارێکی تر ئیشێکی دەست بکەوێت و پاش ئەوەی دەچێتە شارەکەی تر لەوێ بەتۆمەتی جاسوسی دەگیرێ و دەخرێتە زیندانەوە و چیرۆکەکە کۆتایی دێت.

لە زینداندا گێڕەرەوە (کە کەسی سەرەکی چیرۆکەکەشە) ئاگاداری زۆرێك لە ئیش و کارەکانی ناو زیندان دەبێت لەم رێگەیەوە نووسەر چەندین وێنەی جیاجیا و کەسایەتی جۆراوجۆر دەخولقێنن هەر لەو رێگەیەشەوە رەخنەی توند هەم ئاڕاستەی دەسەلاّت و هەم ئاراستەی داب‌ونەریتە کۆمەلاّیەتییەکانی کۆمەلگەی کوردی دەکات. نووسەر رەخنەی توند لە مەلایانی دەرباری دەسەلاّت دەگرێت و پێیوایە ئەوان نەدین دەزانن و نەدیانەت و تەنها ماستاوچی دەسەلاّتن. مەلاکان ئەوە رەتدەکەنەوە کە لەگەڵ ئینگلیزی کافردا ببنە هاوپەیمان، بەڵکو لەگەڵ تورك ببنە هاوپەیمان، چونکە

دژی دین و دیانەتەکەیان نییــە، ئەمــە یەکێکــە لــە مەنــەلۆژە کوتــەکانی نێــو ئــەو گرتووخانەیەی، کە گێڕەرەوە (فیگۆری سەرەکی چیرۆکەکە)ی تێدا زیندانە.

یەکێك لەو خاڵانەی بونیادی چیرۆك بەهێز دەکات زمانە. زمانی ئەم چیرۆکە زمــانێکی گوندیە. هەڵبەت ئەو چیرۆکانەی لە نیوەی یەکەمی سەدەی رابــردوودا نوســراون زمــانێکی گوندی بەسەریاندا زاڵە. ئەم حاڵەتەش لە چیرۆکی "مەسەلەی ویژدان"ی ئەحمــەد موختــار جافیش رەنگدانەوەی هەیە هەڵبەت ئەمەش بۆ ئەو خاڵــە دەگەڕێتــەوە، کــە کــورد وەکــو گەلێکی بندەست خاوەنی شار و شارستانی نەبووە و شارەکانیش هەڵگری هەمان خاسیەتی گوند بوون، بەڵام لە فۆرمی گەورەتردا. گێڕانەوەش وەك لە سەرەتادا ئاماژەمــان پێــدا بــە شێوەیەکی ساکارە و لە رێگەی کەسی یەکی تاکەوە دەگێردرێتەوە.

دەمەوێ لێرەدا بگەڕێمەوە بۆ مەوزوعیەت لەم چــیرۆکەدا کرۆکــی ئــەم چــیرۆکییە باس لە جاسوسی و تێوەگلان دەکات بە کاری جاسوسی. کەسی سەرەکی ئەم چــیرۆکە کە (گێڕەرەوەیە) بە تۆمەتی جاسوسی دەخرێتە زیندانەوە پاش ئەوەی ماوەیــەکی زۆر لــە زیندانــدا دەمێنێتــەوە و رۆژانــە ئــازار و ئەشــکەنجە دەدرێــت و هــاوار و نــزای تۆمەتبارکراوەکە چیرۆکەکە کۆتای دێت. نووسەر دەیەوی لەم چــیرۆکەدا پەنجــە بخاتــە سەر قوڵترین و دێــرینترین زامــی کۆمەڵگــەکان بەگشــتی و کۆمەڵگــەی کــوردی بــە تایبەتی. زامێك، کە دەیان بگرە زیاتریش لە شۆڕشەکانی ئێمەی زیندە بەچاڵ کردووە، ئەمە بێجگە لەوەی لە چەندین لایەنی کۆمەڵایەتییەوە کاریگەری نێگەتیڤی هــەبووە. جاسوسی ئەو زامە سەخت و دزێوەی نێو هەناوی کۆمەڵگەی کوردی، کە ئێمە لەرێی ئەمەوە دەیانجار هەوڵی دروستبوونی دەوڵــەت و ئــەزموونی سیاســی و ئازادمــان لــە دەستچووە. داگیرکەرانی کوردستان هەمیشە ویستویانە چ لە رێــی جاسوســی کــوردی (ناوەکی) و چ جاسوسی (دەرەکییەوە) هەوڵی لە باربردنی دروستبوونی کیانی کــوردی بدەن. ئەوەی ئەم چیرۆکە پێمان دەڵێــت تــەنها ئیشــکردنە لەســەر رووە سیاســیەکەی چەمکی (جاسوسی) و ناڕاستەوخۆش ئەو دووفاقیەی کەسێتی کورد دەخاتــەڕوو، کــە خاوەنی کەســایەتیەکی دەمامکــدارە. کەســایەتیەك لــە دەرەوە و لــە نێــو کۆمەڵــدا دەمامکێك دەپۆشێت و خودی خۆیشی لە ناوەڕۆکیدا خاوەنی کەسایەتیەکی ترە.

سائیب له ڕێی چەند مەنەلۆژێکەوە ئەو دوو فاقیەی کەسایەتیی کورد دەخاتەڕوو لەلاپەڕە(٧١) دەڵێت: "من بۆچی بۆ ئەو خەڵکە خۆم توشی ئەزێت و دەردی سەری بکەم، ئەوەی قازانج و خێری خۆمی تێدا ئەبێت نایکەم". لێرەوە تێدەگەین نووسەر دەیەوێت لەڕێی چەند ئاماژەیەکی تیژتێپەڕەوە چەند نەخۆشیەکی کۆمەڵایەتی نێو کۆمەڵگە بخاتەڕوو. ئەم نەخۆشیانە بەر لە سائیب هیچ کەسێکیتر لەسەر ئەم مەسەلەیە نەدواوە ئەمەش خاڵی درەوشاوەی ئەم چیرۆکەیە.

کورد بەدرێژای مێژووی خۆی لەلایەن داگیرکەرانی کوردستانەوە هەوڵی بچوکردنەوە و لەباربردنی ژیانی ئاسایی دراوە بۆ جێبەجێکردنی ئەم پلانانەش دەیان و سەدان ڕێگەی جۆراو جۆری بەکاربردووە. لێرەدا کاری من نییە ئاماژە بە سەرجەم ئەو ڕێگایانە بکەم، بەڵکو دەمەوێ ئەوە بخەمەڕوو، کە نووسەر لەم چیرۆکەدا ئاماژەی چەند ڕێگەیەك داوە لەوانە جاسوسی و هاوکات گۆڕینەوەی دوژمنێك بەدوژمنێکیتر، کە وەکو پێشتر ئاماژەمان پێدا مەلاکانی دەربار بۆچوونیان بەرامبەر داگیرکەری تورك باشتر بوو تا ئینگلیز. لەم حاڵەتەی دوایدا و لە دیالۆگێکدا چەند کەسێك کە لە گفتوگۆدان ئاماژە بەوە دەکەن هەرچۆنێك بێت ئەم داگیرکەرەی هاتووە(مەبەستیان لە ئینگلیزە) باشترە لە تورك، چونکە ئینگلیز زۆر بێ شەهامەت و دیکتاتۆرن. لێرەوە تێدەگەین کە گەلی ئێمە هەمیشە لیبۆکی گەمەی نێوان داگیرکەران بوون و لە چەندین لاوە هەوڵی قبولکردنی نەرمڕەوەکەیانمان داوە.

یەکێك لە ئەفسەرە باڵاکانی ئەو بنکەیەی کە(پاڵەوان)ی چیرۆکەکەی لێ گیراوە ئاماژە بەوە دەدات، کە ئەگەر(بەد)ی ناو خۆمان لێمان بگەڕێن، ئێمە بۆ خۆمان زۆرچاك ئەژین. ئاماژەدان بەم حاڵەتە کارێکی گرنگە، ئێمە پێشتر وتمان کە داگیرکەران دەیانەوێت لە هەر ڕێگەیەکەوە بێنە ناو ژیانی تاکەکانی کۆمەڵگەی کوردییەوە و هاوکات لەوێوە هەوڵی رووخاندن و کەشفکردنی نهێنیەکانی بدەن. ئاماژەدان بەکەسانی (بەد)ی ناو خۆمان دەست خستنە سەر ئەو برینە قوڵەی کە قارەمانانی قەڵای دم دمی بەرەو مەرگ برد و کە تا ئێستاشی لەگەڵدا بێت شۆڕش و بزوتنەوەی کوردی پێوەی دەناڵێنێ. پاڵەوانی ئەم چیرۆکەی "سائیب"یش بەهەمان تۆمەت لە زیندانە ئایا چارەنوسی چییە؟ ڕەنگە ئەگەر چیرۆکەکە بە(تەواوی) بگەیشتایەتە دەستی ئێمە چارەنوسێکی هەبوایە، بەڵام ئەگەر

چیرۆکەکەش لێرەدا کۆتایی بێت لەبەردەستی ئێمەی خوێنەردایــە ئــەوا نووســەر زیرەکانــە دەیەوێت کۆمەڵگــە بەگشــتی و خوێنەر(تاکــەکانی) بەتایبــەتی لــە هــەوڵی دیــاریکردنی چارەنوسێکدابن بۆ ئەو جاسوسە، یان کەسانی جاسوس بەگشتی.

دواجار دەمەوێ دووبارە ئاماژە بەوەبکەم کە ئەم چیرۆکە لەڕووی گێڕانــەوەوە ســادە و ساکارە و مەنەلۆگەکان زۆر سادەن هەروەها زیــاتر ریپۆرتــاژێکی رۆژنامەوانیانــە دەچــێت، چونکە وەسفی ئەوجێگایانەی کراون وەسفێکی قوڵ نین و سادەن، هەروەها من بڕوام بەوەش هەیە کە ناکرێت بە چاوی ئێستاوە لەو چیرۆکە بڕوانین، بەڵام سەرەڕای ئەو کەم و کورِیانەش ئەم چیرۆکە بەلای منەوە یەکێکە لەو چیرۆکانەی پێگەیەکی دیاری لە نێو ئەدەبی ئێمــەدا، نەك تەنها لەبەر ئەوەی چیرۆکێکی کۆنە، یان یەکەمین چیرۆکی کوردییە، بەڵکو لەبەر ئەوەی نەفەسێکی جوانی رەخنەگرتنە لەدەسەڵاتی کوردی. لە زەمەنێکدا کە تاکی کورد وشیاری نەبوو و تەنها گوێگر بووە. هاوکات کورتــە چــیرۆکەکە لــە ژێــر هــەر مــەرام پەیامێکــدا نوسرابێت ئــەوە قســەیەکی تــرە وەکــو ئــەوەی هەنــدێك نووســەر و رۆشــنبیر دەڵــێن بــۆ خزمەتکردنی دەسەڵاتی ئینگلیز و دژی حکومەت و دەســەڵاتی شــێخ مــەحمودی حەفیــد نوسراوە وەکو پێشتریش هێمای بۆ کرا ئەم قسەیەم قبــوڵ نییــە، چــونکە پێموایــە هــەموو دەسەڵاتێك لە دنیادا ئەگەر دیموکراسیترین دەسەڵاتیش بێت لە کــەموکورِی بــەدەر نییــە و دەکرێت رەخنەی لێبگیرێت. کەسانێکیش دەبێت رەخنە لەو کەموکورِیانە بگرن. بۆیە ئەگەر بە هەر هۆیەك چیرۆکەکە نوسرابێت ئەوا (جەمیل سائیب) توانییــەتی چــیرۆکێکی جــوان و مۆدیلێکی نوێ لە رەخنەگرتنی دەسەڵات لە نێو ئەدەبی کوردیدا بهێنێتە ئاراوە، کە پێشتر بوونی نەبووە، یان زۆر کــەمبووە، هــەروەها وەکــو نــالی و ســالمیش بۆتــە مێژوونوســێکی قۆناغێکی گرنگی کۆمەڵگەی کوردی و شاهیدی سەدەی رابردووە و هاوکــات ئامادەیشــی لــەم سەدەیەشــدا هەیــە وەکــو مەوزوعیــەت، بۆیــە هــەر لێــرەوە دووبــارە خوێندنــەوە و چاپکردنەوەی ئەم چیرۆکە ئاشناکردنی بە نەوەی نوێ کارێکی جوان و بەسودە.

==========================================

(*) ئەم نووسینە لە کتێبی: ئیستاتیکای گێڕانەوە، نووسینی: ئارام سدیق (سلێمانی: لە بڵاوکراوەکانی یانەی قەڵەم، ٢٠٠٩) بڵاوکراوەتەوە.

# (له خەوما) یان کێشەی نێوان ڕۆشنبیر و دەسەڵات

د. ئازاد حەمە شەریف

کێشەی نێوان دەسەڵات و ڕۆشنبیر کێشەیەکی یەگجار کۆن و لەمێژینەیە. یەکەمین نموونەی بەرچاوی ئەم کێشەیە خۆی لە دادگاییکردن و لەناوبردنی (سوکرات ٤٧٠؟-٣٩٩ پ.ز.)دا دەردەخات. هەر لە هەمان ڕۆژگاردا کێشەی نێوان فەیلەسوف و بیرمەندی گریکی (ئێمپیدۆکلیس ٤٨٤- ٤٢٤ پ. ز.) لەگەڵ سیاسییەکان و سوفیستەکانی ڕۆژگاری خۆی بە خۆ فڕێدانە ناو خەرەندی (ئێتنا)وە کۆتایی هاتووە. دوابەدوای ئەمە ڕۆژ بەرۆژ و ساڵ بەساڵ تادێت کێشەکە بەرفراوانتر دەبێت. خۆ لە سەدەکانی ناوەڕاست و سەردەمی بوژانەوەدا دەیان بیرمەند و فەیلەسوف لە لایەن کلێسا و دەسەڵاتە کۆنخوازەکانەوە کەوتنە بەر شاڵاوی گرتن و ڕاوەدوونان و لەناوبردن.

لە ڕۆژئاوادا چەند سەدەیەك لەمەوبەر ئەو کردارانە بەرامبەر بە (تۆماس مۆر) و (گالیلۆ) و (جان دارك) و (برۆنۆ) دەیانی تریش ئەنجامدرا. بەڵام لە ڕۆژهەڵاتی خوێناوییدا (حەلاج) سەردەستەی شەهیدی فیکرە. دوای ئەو ڕۆشنبیر و خوێندەوارە هەڵکەوتووەکان، بەهرەمەندە بیرتیژەکان لە ڕۆژهەڵاتدا ژیانێکی کولەمەرگی ژیاون و تاڵاوی مەرگ و مەینەتیەکانیان پێ چێژراوە. هەر لە (ئەحمەدی خانی) و (حاجی قادری کۆیی) و (جەمیل سائیب) و (بێکەس) و (قانیع) و (محرم محمد امین) و (عەبدولخالیق مەعرووف) و (قادر کابان) بگرە تا دەگات بە (سەمەدی بەهرەنگی) و (حەسەنی قزڵجی) کە چۆن لە زیندانەکانی ساواك بزر کران. (عەبدولرەحمان زەبیعی) بە جۆرێکی نادیار بێسەروشوێن کرا و (یەلماز گۆنای) و دەردەسەریەکی بێ وێنەی

بەدەست تورکە کەمالیستە هونەرکوژەکانەوە چەشت.  (نەجمەدین مەلا) و (پیرەمێرد) و (گۆران) و (هێمن موکریانی) و (دڵشاد مەریوانی) هەریەکەیان بەشێوەیەك لە شێوەکان تووشی ئازار و تۆقاندن و تیرۆر هاتن.  (بدر شاکر السیاب) و (ابو القاسم الشابی) نائومێدکران و (نەجیب محفوز) یش هەوڵی تیرۆر کردنی درا و (سەید دەروێش) چۆن بووە شەهیدی پەیڤ و (نازم حیکمەت) ساڵانی دوورودرێژی لە ناو زیندانەکانی تورکیا بەسەربرد.

جا هۆی بنەڕەتی ئەو کێشەیە لەوەدا خۆی بەرجەستە دەکات کە رۆشنبیر و رۆشنبیرانی راستەقینە هەموو کاتێك خۆیان بە دەمڕاستی بێدەسەڵاتان زانیووە لە بەرامبەر ستەم و زۆرداریییەکانی دەسەڵاتداران کە دەرحەق بە چیینی ژێرەوە و ناوەڕاستی کۆمەڵگەی ئەنجام دەدەن . هەردەم دەسەڵاتدارەکانی رۆژهەڵات، هەرچەندە لە ناوەوەی وڵاتدا بەهێزیش بووبن ، ئەوا بەرامبەر بە بێگانان کەسانی سەرشۆڕ و ملکەچ و ریسوا و دەست لەسەر سیینە بوون. ئەوان بۆ مانەوەی خۆیان هەموو جۆرە نۆکەری و خزمەتکارییەکییان لە بێگانان پێ پەسەند بووە و هەمیشە گوێڕایەڵی فەرمانەکانی ئەوان بوون. بەڵام لە بەرامبەر دەنگی کەسانی خۆوڵاتی هەمیشە شمشێر بەدەست و ئامادە و لەسەرپێ بوون بۆ لەناوبردنی هەر نووزەیەکی نارەزایی. ئەم دووفاقی و دووڕوویییە لە کۆمەڵگەی کوردەوارییدا هەر لەسەردەمی شاعیری پایەبەرزی کورد (ئەحمەدی خانی)یەوە زۆر بە ئاشکرا هەستپێکراوە. ئەگەرنا قەتاوقەت شاعیرێکی نەتەوەپەروەر و وێژدان زیندووی وەکو (ئەحمەدی خانی) (١٦٥٠-١٧٠٧) نەیدەگووت:

ئەمما ژ ئەزەل خودێ وە ساکر
ئەڤ رۆم و عەجەم لەسەر مە راکر
تەبەعیبەتی وان ئەگەر چی عارە
ئەو عارە ل خەلقێ نامدارە

ناموسه ل حاكم و ئەمیران
تاوان چی یە شاعیر و فەقیران؟*

سەرچاوەی ئەم نۆكەری و خزمەتكارییەش گری ی خۆبەكەمزانینی كورد بووە بەرامبەر بە هەموو شتێكی بێگانە كە بەدرێژایی مێژوو كورد بەگرانی باجەكەی داوەتەوە و تا رۆژی ئیمڕۆش ئەو باجە قورسە هەر دەداتەوە .

لەكاتێكدا رۆشنبیران هەمیشە قیبلەنومای رێگای ئازادی و سەرفرازی بوون بۆ میللەت و دەسەڵاتداران و هەمیشە ویستوویانە تۆوی ئازادی و سەربەخۆیی لە ناوەوەی وڵات و مێشكی یەكە بە یەكەی نەوەكانی سەردەمی خۆیان و هی دوارۆژ بچێنن. دەسەڵاتداران چونكە خۆیان بە رێبازی نۆكەری پەروەردەكراون، هەمیشە ویستوویانە لە رێگای خزم خزمێنە و پەیڕەوكردنی سیاسەتی "كێ باشتر نۆكەریم بۆ بكات ئەو دڵسۆزترین كەسە" و بەرتیل و بەرتیلخۆری و پشت بەستن بە چیینی بەكرێگیراوی گۆشكراو بە فیكری بێگانەپەرستییەوە دەرفەتە زێڕینەكانی سەربەخۆبوون و پێشكەوتنی كۆمەڵگەی كوردەوارییان بەفیڕۆ داوە. چونكە ئەوان وایان كردووە كەسانی ناشایستە لە پلەی شایستەدا دابمەزرێن. بەمەش ئەوپەڕی نادادپەروەری كۆمەڵایەتییان لە كۆمەڵگەدا بەرپاكردووە.

لەكاتێكدا ئەو دەسەڵاتدارە كورتبینانە بە خۆیان ئامادە نەبوون ئازادی بە رۆشنبیرە ژێردەستەكانی خۆیان رەوا ببینن، نازانم بە چ مافێك داوای ئازادی لە دوژمنان دەكەن؟ لەكاتێكدا ئەوان بەخۆیان لە فەرمانڕەواییدا دیموكراسی نەبوون، نازانم بە چ مافێك داوای دیموكراسی لە بێگانان دەكەن؟! هەڵبەتە ئەمەش هەرگیز بۆ هیچ كەسێك مەیسەر نەبووە و نابێت. چونكە ئەگەر مرۆڤ ئازادی و دیموكراسی بە

---

*- ئەحمەدی خانی، مەم و زین، ئامادە كردن و پەراوێزنووسینی : هەژار (پاریس ئینستیتیوتی كوردی پاریس، ١٩٨٩) ل ٢٠.

ژێردەستەکانی خۆی نەدات، چۆن دەتوانێـت لـە دوژمنەکـەی خـۆی داوای ئـازادی و دیموکراسی بکات؟

پـێش ئـەوەی بچـینە سـەر شـیکردنەوە و لێکدانـەوەی نـۆڤلێتی (لەخـەوما)ی شاکارنووسی کورد (جەمیل سائیب)، وای بەباش دەزانم کە هەندێك زانیاری لـەبارەی ئـەو سـەردەمەی کـە ئـەو شـاکارەی تێـدا نووسـراوە بخەمـە بەردەسـت. هـەروەکو هەموولایەکیش ئەوە باش دەزانێت کە (جەمیل سائیب) لەم بەرهەمە تاقانەیەیدا زۆر بەتووندی رەخنە و سەرنج ئاراستەی حوکمڕانی و دارودەستە و جۆری فەرمانڕەوایـەتی (شێخ مەحمود) دەکات.

با لـە دەمـی پیـاوێکی راسـتگۆی وەکـو (رەفیـق حیلمـی) زۆر نزیـك لـە شـێخ مەحموودەوە بـزانین ئایـا مەبەسـتی شـێخ لـە دامەزرانـدنی حکومـەتی کوردسـتان، ئاراستەکردنی کوردستانە بەرەو ئازادی و سەربەخۆیی یـاخود بەرژەوەنـدی تایبـەتی و خزم خزمێنە و گیرفان پڕکردن بووە:

> وە لە سلێمانیدا تەشکیلاتێکی وەکو تەشـکیلاتەکەی پێشـووی لیـوا دامەزرا. "سید عمر"ی مامی شێخ محمود کرا بە متصرف، و حـاجی سید حسنی مامی دووەمی بوو بە حاکم وە یا (رەئیسی شەرع). شیخ قادری براشی بوو بە (سەرداری لەشکر). سید علی [بسم الله]ش بـێ بەش نەکرابوو و بوو بوو بو (قۆمیسەر). بەم جۆرە بەشی زوربەی خزم و کەس و کاری حوکمدار و دەسـتە و دائـرەی شـێخان هەریەکـە بـە جوورێك و بەپێ ی حاڵ، کارێك و یا مەواجبیکیان بـۆ رێکخرابـوو و دامەزرابوون.*

*- رەفیق حلمی، یاداشت (بەرگی یەکەم) (هەولێر: چاپخانەی رۆشنبیری و لاوان، ١٩٨٨) ل ٦٢.

جا دوای تێکشکاندنی هێزی تورك له هـەموو بـەرەکانی شـەڕ بەتایبـەتییش لـە شەڕی بەسرادا و بەخشیینی (شێخ مەحموود) لەو شەڕەی لە (شعیبە) دژ بـە ئینگلیـز بەوەکالەت بۆ تورکانی کردبوو، لەو ساتەوەختە ناسکەی کە ئینگلیز هاتبووە سلێمانی و (مێجەر نۆئێل)ی دۆست و پشتیوانی کورد کرابوو بـە راوێـژکار و یەکـەم نوێنـەری ئینگلیز لە کوردستان، ئینگلیز سەرەتا ئامـادەی هـەموو جـۆرە هاوکارییـەك بـوون تەنانەت بە دامەزراندنی (کوردستانی گەورە)شەوە،* با بزانیین شـێخ مـەحموود چـۆن چۆنی فەرمانڕەوایەتی کردووە؟

ئەوانەی کە ئەیان توانی لە حوکمدار نزیك ببنەوە لەم بابەتـە بـوون: دەس و پیێ وەندی نەفام و نەخویندەوار، دەوروپشتی چاوبرسی و دووای تالآن کەوتوو، نۆکەری خەنجەر لە پشت و عـەشایری تفەنگ لـە شـان. هەرچەن لە بەغداوە هەتا لە (تورکیا)وە هەندێ لـە زابتـە کوردەکـان هاتبوونەوە سلیمانی و لەو سـەرودەمەدا هەنـدێ خوینـەواری بـاش و نیشتمان پەروەر لەوێ بوون و ئەیان ویست کـە دەس لـەناو دەس تـێ بکۆشن و یارمەتی حوکمدار بدەن بەڵام رێکەوتنی تاقمی دەوروپشـتی حوکمدار و ئەمانەی تر نەئەگونجاو تاقمی یەکەم لەبەینی حوکمـدار و تاقمی دووەمدا لە خەنجەر و دەمانچـە دیـوارێکی دروسـت کردبـوو. ئەگەر حوکمـدارخۆی بـی ویسـتایە، ئـەم دیـوارەی ئەرووخانـد و لـە زابتەکان و منەوەرەکان نزیـك ئەکەوتـەوە. بـەڵام وەکـو ووتبوومـان، نەترسان لە دوارۆژ و ئازایی و کەم تەرخەمی خۆی لە لایەکەوە، (گرێ یەکی نەفسی) کە بەرامبەر بـە زابـت و منـەوەر پـەیای کردبـوو لـە لایەکی ترەوە بەرهەڵستی ئەوەبوو کە شەقێك لـە دیـواری خەنجـەر و

*- رەفیق حلمی، یاداشت (بەرگی یەکەم) ل ٦٩.

دەمانچەکە هەڵدا و بیرووخێنێ و خۆی بگەیەنێتە خوێنەوارە باشەکان. لەناو منەوەرەکان و زابتە کوردەکاندا بەراستی هی بـاش و نیشـتمان پەروەر هەبوو و هەموویان لەوانە نەبوون کە "شیخ محمـود" لـێ یـان بسڵەمێتەوە، بەڵام وەکو ووتمان (گرێ یەکی نەفسی) لەو دیو دیـواری خەنجەر و دەمانچەکەوە "شیخ محمود"ی راگرتبـوو و وەسـتاندبووی. و بەرهەڵستیکی هەرە گرنگی نزیك بوونەوەی بوو لە زابتەکان. ئەمەش گرێ یەکی تازە نەبوو. بـەڵکو لـەو رۆژەوە پـەیا بـوو بـوو کـە لقـی کۆمەڵی (اتحاد و ترقی) لە سلیمانی دامەزرا بوو. ئـەو کۆمـەڵـە کـە بەشـی زوربـەی لـەم چەشـنە زابتانـە بـوو کـە بـوو بـوون بـەهۆی دەرپەرراندنی نەوەی "کاك ئەحمەد" لە سلیمانی. ئەو دەرپەررینە کـە بە کوژرانی "شیخ سعید"ی باوکی "شیخ محمود" و "شیخ ئەحمەد"ی برای دووایی هـاتبوو و بـوو بـوو بـەهۆی نوشوسـتی و دەربـەدەری و کەساسی و ماڵ وێرانی یان.. *

شیخ مەحمود لە جیاتی ئەوەی هەرهیچ نەبێت هێندەی ئینگلیزەکان بەرامبەر بـە رۆڵەکانی نەتەوەکەی لێبووردە و بەخشـندە بێـت، دەبیـنین لـەجیاتی ئـەوەی زابـت و منەوەرەکان لە خۆی نزیك بکاتەوە و سۆزیان بەلای خۆیدا رابکێشێت ، لـە سـۆنگەی رقی کەسییەوە ئەوانی لە خۆی دوور خسـتبۆوە. چـووبوو گێـل و گەمـژە و نـەزانانی کردبووە لایەنگر و راوێژکار و کاربەدەسـت. بـا بـزانین لـە هەسـتیارترین پۆسـت کـە بەرێوەبەری پۆلیسە و راستەوخۆ پەیوەندی بە ژیانی هاووڵاتیانەوە هەیـە و پاراسـتنی حکومەتیش لە ئەستۆی ئەودایە، شێخ مەحموود کێ ی داناوە:

---

*- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ل ٦٧-٦٨.

"تایەر ئەفەندی" فەرخە کە لە دەوری تورکەکاندا تەحسیلدار (جابی) بوو لـەو دەورەدا کرابـوو بـە (مـودیری پـولیس). ئـەم کابرایـە کـە لـە (کویرەخەت)یك بەولاوە سەرمایەی زانیاری نەبوو، (خوا لیٚ ی خۆش بیٚ) ئێجگار فیزێکی زلی هەبوو و قین لە سکیش بوو.*

هەڵبەتە کاتێك ئینگلیز ئەو کردارانەی لە (شێخ مەحمود) دەبینـی و دەیبینـی (شـێخ مەحمود) بە ئاراستەی تورکەکان مل بـادەدات و بـە گـوێی شـێخ و مـەلا و کۆنـەخواز و نارۆشنبیران دەکات، دڵی لێی کرمیٚ دەبێت، بەتایبەتیش کە بە بەڵگەوە دەبینێـت نامـە و نامەکاری و هاتوچۆ و پەیوەندی لە نێوان بارەگای (شێخ مـەحمود) و (ئـۆزدەمیر — عـەلی شەفیق)ی پیاوی کەمال ئەتاتورك لە (رەواندز) بەردەوامە. ئەوەی راستی بێت (ئـۆزدەمیر) زۆر زیرەکانە لەسەر تەلی عاتیفەی شێخ مەحموود یاری دەکرد و بەناوی (ئیسـلامییەت) و (غەزا) و (دین) و (تۆڵە)سـەندنەوە هـانی شـێخ مـەحموودی دەدا. شـێخ مـەحموودیش چونکە لە بواری گەمەی سیاسی و درۆ و دەلەسەی سیاسییدا کەمزان و کۆڵـەوار بـوو، بـە قسە رەنگاورەنگەکانی (ئۆزدەمیر) زوو بەزوو فریووی خوارد. راوێژکارە نەزان و دەوروبـەرە کەمزانەکانیشی هانی نزیك بوونەوەیان لە تورکەکان دەدا و ئینگلیزییان بە دوژمنی "دیـن و دەوڵەت" لەلای ئەو وەسف دەکـرد. ئـەو رونـاکبیرە نیشـتیمان پەروەرانـەش کـە داوای سەربەخۆیی کوردستانیان دەکرد لەلای ئەو بە هەمان چاوی سیخووڕانی ئینگلیـز تەماشـا دەکران. هەر ئەمەش بوو ماڵی کوردی وێرانکرد نەك منـەوەرەکان وەك برایـەکی نووسـەر بەمدواییانە لە کتێبەکەی خۆیدا بەمجۆرە نووسیوویەتی.* ئەگەر بمانـەوێت زێـتر لـەو خاڵـە دڵنیا بین، پێم باشە لەم قسەیەی (رەفیق حلمی) بەباشی ورد ببینەوە:

---

*- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٨٦.

- هەمان سەرچاوەی پێشوو، بەرگی شەشەم، ل ٣٣.

*- بڕوانە بەهات حەسیب قەرەداخی، بەڵێنەکانی ئینگلیز و گوتاری منەوەرانی کورد، (هەولێر: چاپخانەی رۆشنبیری، ٢٠١١)

به کورتیەکەی شیخ محمود لەگەڵ ئینگلیز ڕێ نەئەکەوت و متمانەی پێ نەئەکردن. لەبەر ئەمە تەقەلای (نوئێل) کەڵکی نەگرت و ناکۆکی کەوتە بەینی (ویلسن)و "شیخ محمود"ەوە.*

لەو قسانەی سەرەوەی ناو یاداشتەکەی (ڕەفیق حلمی) وەك دەرکەوت، وەنەبێت تەنیا هەر ئینگلیزەکان ڕۆڵیان لەوەدا هەبوو بێت کە ئیدارەی شێخ مەحموود بنکۆڵ بکەن، بگرە شێخ مەحموود خۆیشی زۆر بەتەنگ پێکهێنانی ئیدارەیەکی ڕێك و پێك و نیزامێکی پێشکەوتوو نەبوو. هەڵبەتە هۆی ئەوەش لە نادڵسۆزی شێخ مەحموودەوە نەبوو، بەڵکو لەوەوە سەرچاوەی دەگرت کە هەر ئەوەندەی لە کاروباری بەڕێوەبردنی وڵات دەزانی و هەر بە عەقڵیەتی خێڵایەتی و شێخایەتییەوە فەرمانڕەوایی دەکرد. خۆ دەورەگیرانی شێخ مەحموودیش بەکەسانی نەزان و نەخوێندەواری خێڵ پەروەر و شێخ پەروەر هێندەی تر قوورەکەی خەستتر کردبوو:

وەکو لە پێشەوە باسمان کردبوو "شیخ مەحمود" هەر وەکو بۆ داڕشتنی بناغەیەکی باش و بەهێز بۆ ئەم حکومەتە تازەیە تەقەلایەکی تەواو و بە کەڵکی نەئەدا؛ هیچ نەبێ بۆ پاراستنی جێ و ناوچەی نەفسی خۆشی کردەوەیەکی ئەوتۆی دیار نەبوو. نە تەشکیلاتێکی ئیداری ڕێك و پێك، نە دانانی نیزامێك و ڕێگەیەکی تایبەتی بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری حکومەت!..*

---

*- ڕەفیق حلمی، یاداشت (بەرگی یەکەم) ، ل ٧١.

*- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٨٣.

هەر بۆیەش هیچ مایەی سەرسوڕمان نییە لەلای کەسانی خوێندەوار و ڕۆشنبیر کە پێش ڕوودانی کارەسات هەست بە ڕوودانی کارەساتەکە بکەن، چونکە ئەوان بەهۆی بیرتیژی و قووڵ ڕوانینیانەوە دەتوانن ئایینده لە ئێستادا بخوێننەوە. هەر ئەمەش بوو وای لە زۆربەی منەوەرانی سەردەمی شێخ مەحموود کرد بوو کە لە جۆری حوکمڕانی ئەو بتەکنەوە و تا ئەوپەڕەکەی لێی ناڕازی ببن. ئەویش بۆ خۆی قسووری پێ نەکردبوون بە پشتگوێخستنیان و هەندێکجاریش چاوپۆشین لە خراپەکاری بەرامبەریان و سزادان و دەستبەسەرکردن و گرتنیشیان و جاروباریش پەردەپۆشکردنی کوژرانی ئەو کەسانەی بە شێوەیەك لە شێوەکان بە دوژمنی لە مێژینەی خۆی دادەنان.

> ...بەڵام لەناوشارا لەم ڕۆژانەدا دەنگێکی گرنگ و سامناك بڵاوکرایەوە، ئەیان ووت: بە فیت و هاندانی دەستەی ئۆزدەمیر، بڕیاری ئەوە دراوە کە دۆستەکانی ئینگلیز و لاوەکانی نیشتمان پەروەری کورد بکوژرێن و لەناو بدرێن. (جەمال عیرفان)یش لەم ڕۆژانەدا کوژرا. *

هەڵبەتە کوژرانی (جەمال عیرفان)ی سەردەستەی منەوەرەکانی ئەو سەردەمە ئەوپەڕی بێ متمانەیی لە نێوان شێخ مەحموود و دەستەی نیشتمان پەروەران و "منەوەرەکان" دروستکرد. (جەمال عیرفان) خۆی لە سەرەتاوە یەکێك بوو لە ئەفسەرە پایەبەرزەکانی لەشکرەکەی شێخ و خاوەن بیروباوەڕی چەپ و داکۆکیکار بوو لە چینی هەژاران و دژ بە کۆنەپەرستانی ئینگلیز و کورد و تورك بوو. کۆنەپەرستانی هەرسێ لایەن، لە ڕێکەوتی ١٢ی کانوونی یەکەمی ١٩٢٢ دا گەلەکۆمەکی لە (جەمال عیرفان) دەکەن و لەناو ماڵەکەی خۆیدا دەیدەنە بەر دەستڕێژی گوللە و شەهیدی دەکەن.* جا ڕووداوێکی وا لە

---

*- ڕەفیق حلمی، یاداشت (، بەرگی شەشەم) ل ٤٠.

*- جمال بابان، أعلام الكورد (السليمانية: مطبعة دەروون، ٢٠٠٩) ص ص ٩٩ -١٠١

ناوچەی ژێر کۆنترۆڵی شێخ مەحموود بووە و چونکە تاوانکاران نەدرانە دادگا، زۆر ئاسایییە بەر لە هەموو کەسێك تاوانەکە بەرۆکی فەرمانڕەوای ئەو ناوچەیە بگرێتەوە.

خۆ مەسەلەی کوشتنی (عارف سائیب) برای (جەمیل سائیب) بە دەستی خزمێکی شێخ مەحموود لە ڕێکەوتی ١٦ی مایسی ١٩٢٣دا هێندەی تر بووە هۆی قوولکردنەوەی برینی نێوان شێخ مەحموود و ڕۆشنبیران. (عارف سائیب) شاعیرێکی دەستڕەنگین و سکرتێری تایبەتی شێخ مەحموود و ئەفسەرێکی جەنگاوەری لەشکرە تازە پێکهێنراوەکەی ئەو بوو،* ئەم ڕووداوانە هێندەی تر وایان لە ڕوناکبیران کرد ئەگەر نەشتوانن حوکمڕانی شێخ بگۆڕن تا پێیان بکرێت لێی دوورتر بکەونەوە چونکە هەموو مەترسییەکان هەر لەلای ئەوەوە بۆ لای ئەوان دێت.

شێخ محەمەد خالصی، کوڕی شێخ ڕەزای تاڵەبانی لە ساڵی ١٩٢٤دا نامەیەکی بۆ شێخ مەحموود ناردووە کە تیایدا هۆشداری پێدەدات کە دەوروبەرەکەی پڕی پیاوخراپ و گەندەڵ و کاسەلێسە. بۆیە زۆر پێویستە متمانەیان پێنەکات و تا زووە ئەو جۆرە کەسانە لە خۆی دوور بخاتەوە. شیعرەکە بەمجۆرە وەسفی ئەم ڕۆژگارەمان بۆ دەکات:

لەپاش تاڵان و عەزل و لانەواز و خانەوێرانی
حەواڵەی خۆت دەکەم قوربان چلۆن بێم بۆ سلێمانی
لەبەرچاوت وەکو یەك وایە بێ فەرقن لە خزمەت تۆ
شەهێن و حاجی لەقلەق، شێر و ڕێوی، مرشید و جانی
کەر و گا، خەرجی بار و جووتە ئێستر ماڵی کاروانە
ئەمانە نابنە کوێخا و رئیس و میری دیوانی
بەیار کێڵان و گای لەڕ، پیر و کچ خوستن، ژن و تەدبیر
سەگ و جۆ، ئەسپ و ئێسك، بۆق و سەردار، جرجی ناوکانی

---

*- جەمال بابان، پێشەکی کتێبی لە خەوما، هەولێر: دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، ٢٠١٠) ل ل ٢٧-٢٨. (هەر ئاماژەیەکی تر بۆ نۆڤلێتی لەخەوما لەم چاپەی سەرەوە وەرگیراوە(نووسەر)

عەبا و کەر، فیّست و ریّوی، ورچ و شەپقە، میّزەر و مەیموون
حەیا و کویّر، شەرم و دۆم و وەفا و ناموس و سۆزانی
لە کویّت دۆزینەوە ئەم کویّر و عوورانەی لە خوا عاسی
چلۆنت کەوتە خاتر مشکەکویّرەی ورچی کویّستانی
هەموو شیّر و پلّنگن وەختی نانخواردن لە ئەتراف
سمیّلبابڕ، کفندز، کەللەخڕ، پەرچەم مەریوانی
دوعات با بۆ بکەن ئەمجا، بە تەدبیریان نەکەی زینهار
مەلا و دەرویّش و سۆفی و شیّخەکانی لوقمە باتمانی
لە رۆژی وا پیاویّك چاترە بۆ تۆ لە دوو سەد کەس
هەزاری لیرەیەك ناکا، دە پارە و پوول و تارانی*

بۆ ئەوەی ویّنەی ئەو رۆژگارەمان لەبەرچاو روونتر بیّت و باشتر لەو پیّشینە سیاسی و کۆمەلاّیەتی و دەروونیەی ماوەی حوکمڕانیّتی شیّخ مەحموود بگەین، واباشە چەند دیّریّك لە شیعرە بەناوبانگەکەی ئەحمەد بەگی ساحیّبقڕان (حەمدی) کە لەبارەی (ئیدارەی کوردستانی جنووبی سالّی ١٩٢٣)وە نووسیوویەتی بخەینە بەرچاو.

(حەمدی) خۆی پیاویّکی رۆشنبیر و کوردپەروەر بوو لە بنەمالّەی دوانزە سوارەی مەریوان بوو. ئەو رۆشنبیریّکی گەورەی کورد و کەسایەتیەکی دیاری سلیّمانی بووە. لە کابینەی یەکەمی شیّخ مەحموودا وەزیری گومرگ بووە. بەلاّم شیّخ مەحموود دوای قایمکردنی شویّنپیّی خۆی لە دەسەلاّتدا رۆشنبیرانی دوورخستۆتەوە و کەسانی نەزان و خزمانی خۆی لە شویّنی ئەواندا دامەزراندووە. هەلّبەتە لادانی رۆشنبیران هەرگیز بەخیّر بۆ هیچ دەسەلاّتداریّك تەواو نەبووە و تەواویش نابیّت. گەورە زالّمان و دیکتاتۆرانی دنیا هەر لە (هۆلاکۆ)وە تا دەگات بە (هیتلەر) لە وشە و زمانی رۆشنبیران ترساون. بۆیەش ئەو هەلّەیەی کە شیّخ مەحموود بەرامبەر بە رۆشنبیرانی

* لە پیّشەکییەکەی کتیّبی جەمال بابان، لە خەوما، ل ل ٢٢-٢٣ وەرگیراوە.

سەردەمی خۆی کردوویەتی بەئاسانی ناسرێتەوە و لە نووکی خامەی نووسەرانی سەردەمی خۆیەوە چووەتە ناو مێژووەوە.

وەنەبێت (حەمدی) کاتێك کرا بە وەزیری گومرگ دڵی پێی خۆش بوو بێت، چونکە لە باسی تەشکیلاتی یەکەمدا زۆر بە پەنهانی، بەڵام بەوردی باس لەوە دەکات کە کەسانی ناشارەزا و کۆلەوار و نەزان و دژبەیەك لەو تەشکیلاتە دەبینران:

گورگ و چۆبان، وشتر و قەزاز، زین و گای شێت
مێرووله و تەختی سولەیمانی، عەفاریت و نگین
بوخل و شاهی زوهد و مەستی عەقڵ و شێتی کیبر و زیل
سەبحەوو فیشەکلغ و داری سیواك و ماڵ بڕین
جەمعی ئەم زددانە چونکە داخلی مەنتیق نەبوون
دائیما ئەموت ئەمە دێون دڕنجن ئاخۆ چین
تاقمێکی تازەکورەی ڕووتەڵە جا دەرپەڕی
عالەمیٚ زانی ئەمانە ئەووەلی ئاخر شەڕین
ئەو شەوەی نەحسە کە ئیعلانی ملوکییەت کرا
تف کرا ئەمجا لە دەست و هەڵکرا دامەن لە قین*

جا ئەگەر (حەمدی) باسی تەشکیلاتی یەکەم کە بەخۆی تیایدا وەزیر بووە وا بکات کە پڕ مرۆڤی نەزان و قینەدار و نائاسایی و دەروون نەخۆشە، کە زۆربەیان سیفەتی گیانەوەر و ئاژەڵی خراپیان لەناو شیعرەکە پێدراوە، دەبێت لەبارەی تەشکیلاتی دووەمەوە کە ئەگەر وەکو هی یەکەم نەبووبێت ئەوا رەنگە زۆر لەو باشتر نەبووبێت، چی بڵێت؟!

* ئەحمەد بەگی ساحێبقڕان، دیوانی حەمدی، ساغکردنەوە و ڕێکخستن د. عەبدوڵڵا خدر مەولوود (هەولێر: چاپخانەی رۆژهەڵات، ٢٠١٠) ل ١١٧

با پێکەوە بەوردی شیعرەکەی (حەمدی) بخوێنینەوە، ئەوسا زۆر بەباشی لەوە دەگەین بۆچی (جەمیل سائیب) هێندە توونــد رەخنــەی لــەو ســەردەمە گرتــووە. شیعرەکە وادەڵێت:

باسی تەشکیلاتی سانی هەر ئەکەم بۆ پێکەنین
کەمترین بوو گەورەتر هەم گەورەتر بوو کەمترین
ناعیلاجم ئیسم و شوهرەت باس ئەکەم عاجز مەبن
تا ببینن شکڵی وەزعییەت بە جارێ قارئین
کۆیلی مولازم وەزیری خاسەیی قۆڵی یەسار
ئیبنی سەرمزگەوت وەزیری موشفیقی قۆڵی یەمین
کاتبی مابەین بوو تاهیر تەرجەمەی حاڵی بکەم
پیس دەبێ دیوان لە پاشا موستەحەققە بۆ دڕین
حەیفە تەعریفی ڕەشە و عەمێ و ئەحەی دایەنەکە
ناکرێ ئەعزان ئەمانە چونکە عوزوێکی بەرین
خەزنە کیسەی باخەڵ و مەسرەف ڕەشەی حاجی فەتاح
حامیلی سینی حەماڵ و زەرفی پڕ ماشێنی شین
تابیعن ئەلوات و هەرزە قاتیل و دز بوو هەموو
ئەهلی ویجدان و شەریف و تێگەیشتوو مونکرین
زابتانی عەسکەری زۆرە و زڕە و ئەولا دریژ
هەردوو جلخوار و قلێش و یونسی باجی هەمین
ئەمری یەومییە هەموو هەر حەپس و زنجیر و جەزا
فیکری لەیلییە هەموو هەر کوشتن و یەغما و دزین
حاکمی شەرع و عەدل مەحکوومی عالەم مارفەشەل
موخبیری سادق بۆ کازیب سوئی زەن عیلمول یەقین

قەهوەچی و پێش خزمەتی دیوانی عالی دوو سمە
ئەم بوو مەشهوری قوولی بوو ئەو بوو مەعرووفی شەلین
موحتەرەم مەئمووری تەشریفاتی دەوڵەت بوو وسوو
نازری فەرشی رەحە بۆ خەڵوەتی ئامە ئەمین
جائیزە بۆ میللەت و کوردایەتی بێ ڕەشبەڵەك
باجی ڕەحمە بێقەزابی نایەڵێ ڕێك هەڵپەڕین
گەرچی ئێستا مردووە مەوقعیە باسی هەر ئەکەم
نانەوا گوێ ڕەپ بوو شەخسی ئەووەل و مەجلیس نشین
جەردە شێخ ساڵح کە مورشید بوو لەگەڵ دەروێشەکان
من کە وام زانی لە کوڕڕەی حەڵقەیی زیکرا فڕین
سەیری سیرەتکەن کە سووڕەت ڕووکەشێکی سەنعییە
گورگ دەچێتە پێستی مەڕ زاڵم دەبێتە پۆست نشین
ناوی جەمعییەت موجاهید بوو وەزیفەی جیا جیا
دەستە دەستە قاتیل و دز بۆ عیبادی موسلمین*

باشە، ئەگەر لە شیعرەکەی پێشووتری حەمدی دا دارودەستەی شێخ مەحموود لە تەشکیلاتی یەکەمدا بە مرۆڤی گێل و نەزان و بەفیز و "کیبر" و "دێو و درنج" پڕکرابێتەوە، ئەوا وەکو لە شیعرەکەی سەرەوەدا کە باسی تەشکیلاتی دووەمە دارودەستەکە لە (دز و شێخی جەردە و قاتیل و گەندەڵ و ساختەکار و پیلانگێر و هەتیوو و تورکپەرستە خۆفرۆشەکان و زوڵمکاران) پێکهاتووە. لە هەمووش سەیرتر بەپێی دێرەکانی ناو شیعرەکە هەرچی مرۆڤی گەورەپیاو هەن لە دارودەستەکەی دوورخراونەتەوە و هەرچی کەسانی کەم و کاسەلێس و هیچ و پووچ و هەرچی و

---

*- ئەحمەد بەگی ساحێبقڕان، دیوانی حەمدی، ل ل ١١٨ -١١٩ .

پەرچی هەن شوێنی گرنگیان لە ئیدارەی دەوڵەت پێدراوە. لە هەمووش سەیرتر ئەوەیە کە فەرمانڕەوایی هەڵپەڕین (واتە هەڵسوکەوتی ناو کۆشکی مەلەکی) بەدەست باجی ڕەحمە بووە!!

بەڕاستی ڕێکەوتێکی زۆر سەیرە! چونکە مێژووی دانانی ئەم شیعرەی (حەمدی)ش ساڵانی ١٩٢٤-١٩٢٥ ە کە هەمان ڕێکەوتی دانانی نۆڤلێتی (لە خەوما)ی (جەمیل سائیب)ە. پرسیارەکە لێرەدا ئەوەیە: ئایا هەردووکیان پێکەوە بڕیاریان داوە لەسەر هەمان بابەت حوکمڕانی ئەم سەردەمەی شێخ مەحموود دابشۆرن؟ یاخود لەو ڕۆژگارەدا بەڕاستی دارودەستەی شێخ مەحموود دۆزەخییان بۆ ڕۆشنبیران و کەسانی دڵسۆز بەرپا کردبوو؟

جا بۆ ئەوەی زێتر بە ناواخنی ئەو سەردەمەی شێخ مەحموودا بچین واباشترە ئێستا بێینە سەر لێکدانەوەی خەونەکەی (جەمیل سائیب) کە وێنەیەکی ڕەشتر و تاریکتری لەوەی پێشووتر لە زەینمان تۆمارکراوە دەخاتە ڕوو.

**یەکەمین** دیاردەی خراپ کە لە خەونەکەدا بەرچاو دەکەوێت لە دەستدانی کۆنترۆڵی فەرمانڕەوایەتییە لەو ناوچانەی لەژێر یان لە دەرەوەی قەڵەمڕەوی شێخ مەحموود دان. تەنها لە ماوەی شەو و ڕۆژێکدا جەردە و ئەشقیا لە سێ چوار لاوە ڕێگا بە کاروانچییان دەگرن و لە هەر پەناگرد و کۆردەرە و شێوێکدا هەر فڕکان فڕکانی تەریدە و جەردەیە (لە خەوما، ل ٣٦) .

**دووەمین** دیاردەی خراپ بریتییە دیاردەی گەندەڵی و بەرتیلخۆری قوڵخچییەکانی قەراغی شار ، کە بە زاراوەی ئەمڕۆ دەبنە سەرباز و پۆلیسی زاڵگەکانی سەردەمی شێخ مەحموود. ئەوان هەتا پێیان دەکرێت بێڕێزی بەرامبەر ئەو کاروانچییانە دەکەن کە هیچ پارە و پوولێکیان نییە یاخود ئامادەنیین هیچ بەرتیل و شیرینییەکیان پێ بدەن. خۆ پاش لێدان و سەنگمە حەساری ئەوەی هەر هیچ نەدات تۆمەتی سەیر و سەمەرەی وەکو جاسوسی بۆ هەڵدەبەستن و کابرای خەونبینەکەی ناو ئەو نۆڤلێتەی (جەمیل سائیب)یش کەسێکی بێ پارەوپوولە، بۆیە هەر لەسەرەتاوە دەبێت خۆی بۆ تێهەڵدان و گیران و تۆمەتباربوون بە سیخووڕیکردن ئامادە بکات (لە خەوما، ل ل ٣٨

-٣٩) . ئەمەش تەنیا لەسەر کەسانی هاتوو لە دەرەوەی قەڵەمڕەوی شێخ مەحمود ناچەسپێت، بەڵکو لەسەر ئەوانەش دەچەسپێت کە لە ژێر فەرمانڕەوایەتی ئەودا دەژین، بەڵام ئامادەنین بەرتیل بدەن (لە خەوما، ل ل ٤١ - ٤٢) .

**سێیەمین** دیاردەی خراپ کە لەم خەونەدا بەرجەستەکراوە بریتییە لە پشتگوێ خستنی خاو و خێزانی کەسانی کوژراو لە شەڕەکاندا و کەوتنە سەر شەقامی ئەوان و بوون بە سواڵکەر. ئەمەش واتای ئەوە دەگەیەنێت، ئەوانەی بەرگرییان لە نیشتیمان کردووە و ئامادەی فیداکاری بوون، خێزان و منداڵەکانیان بەقورسی باجی هەستی پاکی نیشتیمان پەروەری ئەوان دەدەنەوە (لە خەوما، ل ٤٤) .

**چوارەمین** دیاردەی خراپ کە لەم خەونەدا پیشان دراوە بریتییە لەوەی لەکاتێکدا میللەت لە هەژارییدا ژیانێکی پڕ کولەمەرگی بەسەردەبات، ژنانی ناو حەرەمسەرا هەرباسی ئاڵتوون و مجەوهەرات و یاقووت و جلی جوان و ئەڵماس و پیرۆزە دەکەن و هەر لە بیری ئەوەدان چۆن بەزۆر یان بەخۆشی شمەکی جوان و گرانبەها لە خەڵکی بسەنن و ئەوەی نەشیدات مێردەکەی حەپس دەکرێت و ماڵەکەی بە فەرمانی خانمی ژنی حوکمدار تالان دەکرێت (لە خەوما، ل ل ٤٩-٥٠).

**پێنجەمین** دیاردەی خراپ کە لەم خەونەدا دەبینرێت بریتییە لە دامەزراندن و دەرکردنی خەڵك لە پۆستێکدا بە میزاج و بەرتیل و ماستاو ساردکردنەوە. ئەمەش هەر بە فەرمانی خانمی ژنی حوکمدار بەڕێوە دەچێت (لە خەوما، ل ل ٥٠-٥١).

**شەشەمین** دیاردەی خراپ کە لەم خەونەدا بینراوە بریتییە لە کۆکردنەوەی زێڕ و سامانێکی زۆر، بەبڕی سەد هەزار لیرە بۆ حوکمدار و دەیان هەزار لیرە بۆ داردەستەکانی . ئەمە لەکاتێکدا دەکرێت کە مەعاشی تەقاویت نەدراوە و عەسکەر و مەئموورەکان ماوەی شەش مانگە بێ مووچە دەوام دەکەن. جا دواین بڕیاری حوکمدار ئەوەیە بۆ ئەوەی لە کۆڵ خۆیانییان بکەنەوە، هەریەکە و چەند حۆقە چەڵتووکێکیان پێ بدەن (لە خەوما، ل ل ٥٣-٥٤).

**حەوتەمین** دیاردەی خراپ کە لەم خەونەدا دەرخراوە بریتییە لە دەورەدرانی حوکمدار بە کەسانی نەزان و هەلپەرست و ماستاوچی و دەرکردنی فتوا بۆ دەست

بەسەراگرتنی ژن و ماڵ و منداڵی ئەوانەی کە بەگەڵ حوکمدار نەکەوتوون و داویانەتە پاڵ غەیرەدین. بە کورتی و بەکوردی، ئەنفالکردنی ژن و ماڵ و منداڵی خەڵکی بەرهەڵستکار (لە خەوما، ل ل ٥٥-٥٩).

**هەشتەمین** دیاردەی خراپ کە لەم خەونەدا زەق کراوەتەوە بریتییە لە دانانی پلان بەدزی لەلایەن حوکمدار و دارودەستەکەیەوە بۆ بریندارکردن و کوشتن و تیرۆرکردنی کەسانی نەیار و بەرهەڵستکار. ئەم هەموو کارانەش بەوپەڕی وریایی و نهێنی و شاراوەییەوە ئەنجام دەدرێت (لە خەوما، ل ٦١).

**نۆیەمین** دیاردەی خراپ کە لەم خەونەدا بەرچاو خراوە بریتییە لە بڕیاردان لەسەر دوارۆژی وڵات و رێك کەوتن لەگەڵ هەر لایەنێکی دەرەکی بەشێوەیەکی تاکڕەوانە و بەبێ گەڕانەوە بۆ دەسەڵاتی شورا و میللەت. ئەمەش وا لە کەسی بڕیاردەر دەکات کە بڕیاری چەوت و هەڵە بدات. هەر بۆیەش لە ماوەی سێ کاتژمێردا، دوای کۆبوونەوەی لەگەڵ سێ لایەنی جیاواز ، حوکمدار سێ جاران رای خۆی دەگۆڕێت: جارێکیان دەیشکێنێتەوە بەلای توورکدا (لە خەوما، ل ل ٦٣-٦٥) و دواتر بەلای ئینگلیزدا (لە خەوما، ل ل ٦٧- ٧٠) و پاشان بەلای سەربەخۆییدا (لە خەوما، ل ل ٧١-٧٢) و لە کۆتاییشدا بەلای هیچییانەوە نا، چونکە ئەگەر ئەو هەر شتێك بکات پێویستە سەرەتا بەرژەوەندی کەسی خۆی لەبەرچاو بگرێت (لە خەوما، ل ٧٣).

جا دوای بەراوردکردنی ئەو دیاردانەی کە (جەمیل سائیب) لە نۆڤلێتی (لەخەوما) بەڕوونی خستوویەتە بەرچاو لەگەڵ زانیارییەکانی ناو بەرگەکانی (یاداشت)ی مامۆستا (رەفیق حلمی) و شیعرەکەی شێخ محەمەد خالصی، کوڕی شێخ رەزای تاڵەبانی و شیعرە بەناوبانگەکەی (حەمدی) کە هەر هەموویان باس لە لایەنە خراپ و دزێوەکانی فەرمانڕەوایەتی سەردەمی شێخ مەحموود دەکەن، ئایا پێویستە کەس چیتر گومان لەوە بکات کە (جەمیل سائیب) لە کێشانی وێنەی ئەم سەردەمەی کۆمەڵگەی کوردەواری راستگۆ نەبووە؟!

ئایا لە هەر سەردەمێکدا چی لە نووسەرانی خاوەن هەڵوێست چاوەڕوان دەکرێت: شاردنەوەی راستییەکان و سپیکردنەوەی رووی رەشی کارە چەپەڵ و دزێوەکانی خراپەکارانی سەردەمەکەیان، یاخود ریسواکردن و رەخنەگرتن و بەرهەڵستکاری و وشیارکردنەوەی خەڵکی لە نهێنییە شاراوەکان؟!

**هەولێر: ٢٠١١/١٢/٣١**

---

# سەرچاوەکان


١- ئەحمەدی خانی، مەم و زین، ئامادە کردن و پەراوێزنووسینی : هەژار (پاریس ئینستیتیوتی کوردی پاریس،١٩٨٩).

٢- رەفیق حلمی، یاداشت (بەرگی یەکەم) (هەولێر: چاپخانەی رۆشنبیری و لاوان، ١٩٨٨).

٣- بەهات حەسیب قەرەداخی، بەڵێنەکانی ئینگلیز و گوتاری منەوەرانی کورد، (هەولێر: چاپخانەی رۆشنبیری، ٢٠١١)

٤- جمال بابان، أعلام الكورد (السليمانيه: مگبعە دەروون، ٢٠٠٩)

٥- جەمال بابان، پێشەکی کتێبی لە خەوما، هەولێر: دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس، ٢٠١٠)

٦- ئەحمەد بەگی ساحێبقڕان، دیوانی حەمدی، ساغکردنەوە و رێکخستن د. عەبدوڵلا خدر مەولوود (هەولێر: چاپخانەی رۆژهەلات، ٢٠١٠)




# تەکنیك و هونەر لە نۆڤلێتی (لە خەوما)

د. ئازاد حەمە شەریف

ئەگەر تەنیا لە روانگەی تـەکنیك و هونـەرەوە تەماشـای نـۆڤلێتی (لەخـەوما)ی (جەمیل سائیب) بکەین دەبینین کە نووسەر هونەرکارییەکی بێ وێنەی بە جۆرێکی وا تێدا بەکارهێناوە کە کاریگەرییەکی زۆر لەسەر خوێنەر بەجێ بهێڵێت.

لێرەدا ئێمە پەنجە لەسەر سێ لایەنی گرنگی ئەم نۆڤلێتە دادەنێین:

یەکەمیان: تەکنیکی نوێ لە نۆڤلێتی (لە خەوما)*

دووەمیان: رەگەزەکانی دراما/شانۆیی لە نۆڤلێتی (لە خەوما)

سێیەمیان: وەسفکردن لە نۆڤلێتی (لە خەوما)

پێویستە هەمووشمان ئەوەمان لەبیر بێت کە ئەم بەرهەمەی (جـەمیل سـائیب) ٨٧ سـاڵ بەر لە ئێستا نووسراوە و ئەگەر بە چاوی ئەو رۆژگارە سەیر بکرێت، دەبێتە سەرەتای هونـەری چیرۆکنووسین و نۆڤلێت لە ئەدەبی کوردیدا و لەلایەنی هونەریشەوە دەگاتە ترۆپکی داهێنان.

## یەکەم: تەکنیکی نوێ لە نۆڤلێتی (لە خەوما)

### أ) خەون و چڕکردنەوەی کات

سەرجەم رووداوەکانی ئەم کارە هونەرییە هەر هـەمووی لـە خەونێکدایـە و وەکـو هەمووشمان دەزانین خەون لە چەند چرکەیەك تا چەند خولەکێك زێتر درێژە ناکێشـێت.

---

*- جەمال بابان، پێشەکی کتێبی لە خەوما، هەولێر: دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، ٢٠١٠) ل ل ٢٧-٢٨. (هەر ئاماژەیەکی تر بۆ نۆڤلێتی لەخەوما لەم چاپەی سەرەوە وەرگیراوە(نووسەر)

بەڵام دەستڕەنگینی (جەمیل سائیب) لەوەدا دەردەکەوێت کە ئەو هەموو رووداوە زۆرەی سەردەمی شێخ مەحموودی لە ماوەی سێ چوار رۆژێکی گەشتەکە و شەوێك بەسەربردن لە کۆنە خانێك و تەنها شەوێکی زیندانیکردنەکەیدا چڕ کردۆتەوە و هەر هەمووشی ئاخنیتە ناو خەونێکی چەند خولەکی یان چەند چرکەییەوە. کەواتە لەم نۆڤلێتەدا سێ جۆرە کات هەن:

١- کاتی رووداوەکان: ئەمەش سەرجەم ماوەی حوکمداریێتی شێخ مەحموود دەگرێتەوە.

٢- کاتی ناو خەونەکە: ئەمەش سێ چوار رۆژی گەشتەکە و شەوێکی مانەوە لەناو خانەکە و تەنها شەوێکی زیندانیکردنەکەی پاڵەوانە بێناوەکەی نۆڤلێتەکە دەگرێتەوە.

٣- کاتی خەونەکە: ئەمەش بریتییە لە چڕکردنەوەی هەردوو زەمەنەکەی پێشوو لەناو چەند چرکەیەك یان چەند خولەکێکی پێش واگاهاتنەوە.

**ب) گەورەکردن و بچووکردنەوەی رووداوەکان**

یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی خەون ئەوەیە کە لە خەوندا شتی بچووك زل و زەبەلاح دەکرێت و شتی زل و زەبەلاحیش ورد و بچووك. مەبەستیش لەمە دانانی کاریگەری بەتێنە لەسەر خەونبین و گوێگری خەون. هەڵبەتە ئەم تەکنیکەش زۆر بەڕوونی لە نۆڤلێتەکەدا رەنگی داوەتەوە. ئەمەش ئەگەر شتێکمان بۆ دەربخات، ئەوەمان پیشان دەدات کە نووسەری بەرهەمەکە کەسێکی راستگۆ بووە بۆیەش خەونەکەی وەکو خۆی تۆمارکردووە بەبێ شێواندنی سنوور و تخووبەکانی پرۆسەی خەون و خەون بینین.

**ج) سەرەتا و کۆتایی نۆڤلێتەکە**

هەر هەموو ئەو رەخنەگر و لێکۆڵەرەوانەی کە باسیان لە (لەخەوما)ی (جەمیل سائیب) کردووە وای بۆچوون کە نۆڤلێتەکە تەواو نەکراوە و پێویست بوو بە چەند رستەیەك نووسەر کۆتایی بە خەونەکە بهێنابووایە. بەڵام دوای وردبوونەوە لە نۆڤلێتەکە دەرکەوت کە پێچەوانەی قسەکانی ئەوان راستە. چۆن؟

ئەگەر ئەو برا رەخنەگر و نووسەرانەی لەسەر ئەم نۆڤلێتەیان نووسیووە بچنەوە سەر خوێندنەوەی ئەو بەرهەمە و بەو چاوە بیخوێننەوە کە سەرەتای نۆڤلێتەکە بریتییە لە

کۆتایی خەونەکە و کۆتایی خەونەکەش بریتییە لە سەرەتای چیرۆکەکە ئەوا ئەوسا دەزانن چەند بە هەڵە ئەو نۆڤلێتەکیان لێکداوەتەوە. چونکە کابرای خەونبین کە لە خەوەکەی بەئاگادێتەوە ئینجا دێت خەونەکەی بۆ ئێمە دەگێڕێتەوە و چیرۆکەکە لەوێوە بەمجۆرە دەست پێدەکات: " شەوێك لە خەوما وا لە دنیا گیرم خواردووە...."(لە خەوما، ل ٣٥).

جا دوای ئەوەی ئەو برا رەخنەگرانە، لەو مەسەلەیە وردتر دەبنەوە، ئەوسا دەزانن کە (جەمیل سائیب) چەند کەسێکی هونەرزان و شارەزای تەکنیکی چیرۆك نووسین بووە. ئەم تەکنیکەی کە نووسەر لەم نۆڤلێتەدا بەکاری هێناوە پێی دەگوترێت تەکنیکی بازنەیی کە سەر و بنی چیرۆك پێکەوە دەبەستێتەوە. هەڵبەتە کاری وا ئاسان نییە و لەدەست هەموو چیرۆك نووسێك نایەت و تەنها نووسەری گەورە و شارەزا بەم تەکنیکە دەوێرن.

لایەنێکی تر کە زۆربەی رەخنەگران بە کەموکوڕی لە نۆڤلێتەکەی (جەمیل سائیب)ی دادەنێن ئەوەیە کە بۆچی خەونەکە کۆتاییەکی لۆجیکی نییە. جارێ پێش هەموو شتێك لۆجیك لە هەموو شتێکدا هەبێت هەرگیز لە خەون و خەونبینیندا نییە. خەون بۆیە خەونە چونکە شتی سەیرو سەمەرە و کەس نەدیدە لە مێشکدا دەخولقێنێت. ئەگینا ئەگەر خەون رێك لەگەڵ واقیع بێتەوە، ئەوا بێگومان، ئەمە خەون نییە و واقیعە. ئەم تەکنیکەش لەسەر دەستی گوزارەخوازەکان (ئێکسپرێشینیستەکان) زۆر برەوی سەند و بووە تەکنیکێکی سەرەکی شانۆی گوزارەخوازی (ئێکسپرێشینیستی).

**د) بەکارهێنانی تەکنیکی چیرۆك لەناو چیرۆك (Frame Story)**

لەم شاکارەدا نەك تەنیا چیرۆکێك هەیە، بەڵکو چەندین چیرۆك لەناو چیرۆکدا هەن. چیرۆکەکان لەبەر ئەوەی کەوتوونەتە بەر کاریگەری پرۆسەی خەون، چڕ و کورت و لەپڕ و خەستکراونەتەوە. ئەگەر بەتان و پۆی ئەو بەرهەمەدا بچین دەکرێت ئاماژە بۆ چیرۆکی (چەتە و کاروانچییەکان)، چیرۆکی (ژنە مێردکوژراوە سواڵکەرەکە)، چیرۆکی (ژنی حوکمدار و چۆنیەتی دامەزراندن و سزادانی خەڵك بە میزاج)، چیرۆکی (کۆبوونەوەی حوکمدار لەگەڵ دارودەستەی خۆی و پارە کۆکردنەوە بۆ خۆیان)، چیرۆکی (مووچە نەدان بە تەقاویت و سەربازان)، چیرۆکی (کۆبوونەوە لەگەڵ مەلاکان و فتوادان بۆ ئەنفالکردنی ژن و ماڵی بەرهەڵستکارن)، چیرۆکی

(کۆبوونەوەی حوکمدار لەگەڵ پیاوکوژان و دەستنیشانکردنی کەسانی بەرهەڵستکار بۆ بریندارکردن و تیرۆرکردنیان)، چیرۆکی (کۆبوونەوە لەگەڵ جلخوارە تورکپەرستەکان و لایەنگیریکردنی تورکەکان)، چیرۆکی (کۆبوونەوە لەگەڵ ئینگلیزپەرستەکان و لایەنگیریکردنی ئینگلیزەکان)، چیرۆکی (کۆبوونەوە لەگەڵ نیشتیمان پەروەرەکان و لایەنگیریکردنی سەربەخۆیی کوردستان)، چیرۆکی (کۆبوونەوەی حوکمدار لەگەڵ باوەڕپێکراوانی خۆی و نەکردنی هەرشتێك کە خزمەتی بەرژەوەندی تەسکی خۆی نەکات) و چەندین چیرۆکی تر.

ئەم هەموو چیرۆکانەی سەرەوە لەناو خەونێکدا چرکراونەتەوە و خەونەکەش بە چیرۆك گێڕدراوەتەوە و پاشتر نووسراوەتەوە. کەواتە رووداوەکانی ناو ئەم نۆڤلێتە بە دوو دانە فیلتەردا تێپەڕیوون تا دەگەن بە خوێنەر. فیلتەری یەکەمین خەونەکەیە و فیلتەری دووەمیش گێڕانەوەی خەونەکەیە. هەر ئەمەشە وا دەکات کە ئەم بەرهەمە شەقڵی بابەتخوازی (Objectivity) پێوە دیار بێت. هەڵبەتە ئەم تەکنیکە هونەرییە سەرکەوتووە نەبووایە بەهیچ جۆرێك سەرەداوی ئەم هەموو چیرۆکە پەرش و بڵاوە لێك گرێنەدەدران. ئەمەش ئەگەر شتێکمان بۆ دەربخات، ئەوە پیشان دەدات کە (جەمیل سائیب) چەند باڵادەست بووە لە هونەری چیرۆك نووسیندا.

## دووەم: رەگەزەکانی شانۆیی لە نۆڤلێتی (لە خەوما)

بەسەرنجێکی خێرا و وەرگێڕانی لاپەڕەکانی ئەم نۆڤلێتە خوێنەری ورد هەست بەوە دەکات کە ئەم بەرهەمە زیاتر بەلای شانۆییدا دەشکێتەوە، چونکە جگە لە ناونیشانە دراميیەکەی (لە خەوما)، سێ سەرەبابەتی بەم ناونیشانە دەست پێدەکەن: (پەردە گۆڕا) ، (پەردە وەرگەڕایەوە)، (پەردەیێکی تر). لەپاڵ ئەمانەشدا هەموو سەرە بەشەکانی دیکەی ئەم نۆڤلێتە ناونیشانی درامی سەرنجڕاکێشیان پێدراوە. بۆ نموونە: (گەیشتنە شار و ئەوەڵ قۆرت)، (ئەحواڵی خان و دووەمین قۆرت)، (رۆژەوەبوون و قۆرتی سێیەم)، (چیم بینی لەو ژوورەدا؟)، (گفتوگۆکردن و فتوا وەرگرتن...)،.

جا بەمەبەستی پتر کاریگەری بەجێ هێشتن لەسەر خوێنەر، لەم نۆڤلێتەدا هەموو رەگەزەکانی شانۆیی بەکارهاتوون. هەر لە چوارچێوەی (کات، شوێن، دەوروبەر)ەوە

بگرە تا دەگات بە (زۆرانبازی) و (زمانی گفتوگۆ و خۆدواندن و لەبەرخۆ قسەکردن و قسەکردنی لابەلا و گێڕانەوەی حیکایەتخوان) و (رووداو و گرێچن) و (بیرۆکەی شانۆیی) و (کەسایەتییەکان).

لێرەوە بەدوا یەکە یەکەی ئەو رەگەزانە دەخەینە بەرباس و لێکۆڵینەوە بەمەبەستی زێتر تیشك هاویشتنە سەر لایەنە درامی و شانۆییەکانی ئەم شاکارە هونەرییە.

**A. کات و شوێن و دەوروبەر**

١- لە خاڵی یەکەمدا باسی کات لەم نۆڤلێتەدا کراوە کە سێ جۆرە کاتە: کاتی رووداوەکان، کاتی ناو خەونەکە و کاتی خەونەکە (بۆ باشتر روونبوونەوەی ئەم لایەنە بچۆرەوە سەر بڕگەی (أ) لە خاڵی یەکەمی ئەم لێکۆڵینەوەیە.

٢- شوێن: دوو جۆرە شوێنیش لەم نۆڤلێتەدا هەن:

أ) شوێنی دەرەکی

ئەم شوێنە بریتییە لەو شوێنانەی شاکەسی نۆڤلێتەکە پێیدا رەت دەبێت هەر لە سەرەتای دەستپێکردنی گەشتی ناو خەونەکە تا دەگاتە زیندان. شوێنەکان بریتیین لە: رێگای نێوان کەرکوك و ناوچەی هەمەوەندەکان و قەراغی شاری سلێمانی کە شاکەس بە رێبواری (هەندێك جار بە پیادەیی و هەندێك جاریش بە سواری) پێیدا رەت دەبێت. هەروا ئەو (خانە)ی شەوی یەکەمی تێدا بەسەر دەبات تا بەیانی.

ب) شوێنی ناو زیندان

ئەمیش رۆڵی ناوەڕاستی تەختەی شانۆ دەبینێت و لەلای دەستە راست و دەستە چەپییەوە ژووری حەرەمسەرا و ژووری کۆبوونەوەی حوکمداری لێیە. هەردوو ژوورەکانی ئەمبەر و ئەوبەری ژووری زیندان رۆڵی دوو تەختەی شانۆ دەگێڕن چونکە نزیکەی سەرلەبەری رووداوەکانی ناو خەونەکە لەوێ روودەدەن. شاکەسی زیندانیکراو هەندێکجار بەخۆی دەبێتە سەیرکراو و هەندێکجاریش دەبێتە سەیرکەر. ئەمەش تەکنیکێکی نوێی (شانۆی داستانییە) و زۆر دوای (جەمیل سائیب) شانۆنامەنووسی ئەڵمانی (برتۆڵت برێشت) پێیەوە بەناوبانگ بوو. هەڵبەتە لەم نۆڤلێتەدا تەکنیکێکی دیکەی شانۆی داستانی (برێشتی) تێدایە کە ئەویش حیکاتەخوانە و دواتر باسی لێوە دەکەین.

B. **زۆرانبازی**

بڕبڕەی پشتی هەموو کارێکی درامی زۆرانبازییە. بەبێ ئەم رەگەزە هیچ درامایەك نابێتە بەرهەمێکی سەرکەوتوو. لەم نۆڤلێتەدا زۆرانبازی بەتێن لەسەر چەندین ئاست هەن:

أ) زۆرانبازی نێوان ئەشقیا و جەردە و کاروانچییەکان.

ب) زۆرانبازی نێوان دارو دەستەی حوکمدار و خەڵکی رەشورووت ، لەمانە (ژنی مێردکوژراو، تەقاویتی پارەپێنەدراو، سەربازی مووچە وەرنەگرتوو).

ج) زۆرانبازی نێوان ژنی حوکمدار و ژنانی تر کە ئەو هەموویان بە نۆکەر و خزمەتچی تێدەگات.

د) زۆرانبازی نێوان شاکەسی ئەم نۆڤلێتە و دارودەستەی بەرتیلخۆر و زۆرداری حوکمدار.

ه) زۆرانبازی نێوان حوکمدار و دارودەستەی مەلایان دژ بە بەرهەڵستکاران.

و) زۆرانبازی نێوان تورکپەرست و ئینگلیزپەرست و نیشتیمان پەروەرانی کورد.

C. **زمانی شانۆیی**

لەم نۆڤلێتەدا هەموو ئەو جۆرە زمانانە بەکارهاتوون کە شایستەی بەرهەمی شانۆیین. لەبەرهەمی شانۆییدا بەگشتی ئەو چوار جۆرە زمانە بەکاردێن:

أ) زمانی گێڕانەوە

ئەم نۆڤلێتە بە گێڕانەوەی خەونێك دەست پێدەکات و خەونگێڕەرەوەکە رۆڵی "حیکایەتخوان" دەگێڕێت کە ئەمەش یەکێکە لەو تەکنیکە نوێیانەی شانۆی (برێشتی) پێی بەناوبانگ بوو. نموونەی ئەوەش سەرەتای چیرۆکەکەیە کە وا دەست پێدەکات: " شەوێك لە خەوما وا لە دنیا گیرم خواردووە...."(لە خەوما، ل ٣٥).

ب) زمانی گفتوگۆ لە نێوان کەسایەتییەکان

ئەمەش لە گفتوگۆی نێوان شاکەسی ئەم نۆڤلێتە و مامە پیرەی کاروانچی و قوڵخچییەکان؛ شاکەس و کابرای خانچی؛ شاکەس لەگەڵ زیندانەوانەکان؛ گفتوگۆی نێوان ژنی حوکمدار و ژنانی حەرەمسەرا؛ گفتوگۆی حوکمدار لەگەڵ شەریکە بەشەکانی؛ حوکمدار و مەلاکان؛ حوکمدار و ئەفەندییە ئینگلیزپەرستەکان؛ حوکمدار و نیشتیمان پەروەرەکاندا دەردەکەوێت.

ج) زمانی لەبەرخۆ قسەکردن و خۆدواندان

ئەم جۆرە زمانە لەکاتی لێکدانەوە زۆرەکانی شاکەس لەگەڵ خۆیدا بەرچاو دەکەوێت. لە سەرەتای چیرۆکەکەوە ئەم رستەیە هەیە: "هەر بیر ئەکەمەوە لەبەر خۆمەوە ئەڵێم، یارەبی چی بکەم، چۆن هەوڵێك بدەم شتێکم دەست بکەوێ، ئیدارەی خۆم و ماڵ و منداڵمی پێ رێك بخەم و لە ژێر قەرز و نەبوونیدا دەربچم." ( لە خەوما، ل ٣٥)

نموونەی تری خۆدواندن و لەبەرخۆ قسەکردن لەکاتی گیرانی شاکەس بەتۆمەتی جاسووسیدا دەردەکەوێت کە دەڵێت: "منیش لەدڵی خۆمدا وتم نەخێر نەخۆشییەکەی کابرای خانچییەکە وتی منیش گرتم و رابورد." ( لە خەوما، ل ل ٤٣ -٤٤)

د) قسەکردنی لابەلا

نموونەی قسەکردنی لابەلا لەم نۆڤلێتەدا لە زۆر جێگا بەرچاو دەکەون. بەڵام لێرەدا من تەنیا پەنجە بۆ ئەو نموونەیە سەرەکییە رادەکێشم. دوای کۆبوونەوەی حوکمدار لەگەڵ هەرسێ دەستەی تورکپەرست و ئینگلیزپەرست و نیشتیمان پەروەرەکان، شاکەس لە کونی ئەو پەنجەرەیەی ئەوی تێدا زیندانی کراوە بەدزی ئەم کۆبوونەوەیە دەبینێت و گوێی لە هەموو قسەکانیان دەبێت و لە راز و نهێنی ئەو قسانەی حوکمدار ئاگادار دەبێت و بەشێوەیەکی لابەلا دەڵێت: "منیش ... لەبەرخۆمەوە ئەموت: یارەبی ئەمە چییە و ئەم کابرایە چ ئینسانێکە، کە هەر لە زەرفی سێ سەعاتدا، بە چەند چەشن گۆرا و بۆچی تۆزیك تێگەیشتن و لێکدانەوەی نییە، ئەمانەی هەموو بەلاوە باش بوو و لەگەڵ هەموویان قەراری دا و لە پاش نەختێك لە هەموویان پاشگەز بۆوە." (لە خەوما، ل ل ٧٢-٧٣)

**D. رووداو و گرێچن**

رووداوەکانی ناو ئەو نۆڤلێتە هێندە زۆرن هەر لە ژمارە نایەن. ئەمانەی خوارەوە هەرە دیارەکانیانن:

أ) بەرێکەوتن و سەرهەڵگرتنی شاکەس بەمەبەستی نان پەیداکردن بۆ خاو و خێزانە برسییەکەی.

ب) ناسینی پیرەمێردی رێبوار و بەزەیی پێداهاتنەوەی پیرەمێرد بە شاکەس.

ج) هێرشی ئەشقیا و جەردە بۆ سەر کاروانچییان.
د) بێنە و بەردەی پاسەوانانی زاڵگە بۆ بەرتیل وەرگرتن.
ه) چوونە ناو خان و بەسەربردنی شەوێکی سارد بە سکی برسی.
و) گریان و زاری و قیژەی ژن و منداڵی گیراوێك لە دەست دزان.
ز) هاتنی داروەدستەی حوکمدار و گرتنی شاکەسی نۆڤلێتەکە.
ح) پاڕانەوە و نوزانەوەی ژنی سەربازە کوژراوەکە بۆ خێر پێکردن.
ت) دارکاریکردن و سزادانی پیاوێك لە مەیدانێکدا.
ی) پیلان و پیلانکاری ژنی حوکمدار بۆ سەندنی خشڵ و زێڕ لە ژنانی تر .
ك) کۆبوونەوەی حوکمدار لەگەڵ برابەشەکانی خۆی و سامان دابەشکردن.
ل)کۆبوونەوەی حوکمدار لەگەڵ مەلاکان و فتوای ئەنفالکردنی ژن و ماڵی بەرهەڵستکاران.
م) کۆبوونەوەی حوکمدار لەگەڵ تورکپەرست و ئینگلیزپەرست و نیشتیمان پەروەران.
ن) دوایین کۆبوونەوەی حوکمدار لەگەڵ داروەدستەی خۆی و قسەکانی سەبارەت بە بەرژەوندی تەسکی خۆی.

هەروەها لەڕووی ڕێزکردن و تێك هەڵکێشکردنی ڕووداوەکان (جەمیل سائیب) ئەوپەڕی دەستڕەنگینی نواندووە و هەر ڕووداوێك ڕێ بۆ ڕووداوەکەی دوای خۆی خۆش دەکات و بەمجۆرەش زنجیرەیەکی بەردەوامی نەپساوەی سەرنجڕاکێش پێك دەهێنێت. ئەم ڕووداوانە بەرە بەرە بەشێوەیەکی درامی بەرز دەبنەوە تا دەگەن بە ترۆپکی درامی. ترۆپکەکەی ئەم نۆڤلێتە دەکەوێتە کۆتایی کاتێك بە چەند زەلامێك بەردەبنە گیانی شاکەسی زیندانیکراو بەر لە واگاهاتنەوەی لە خەوەکەیدا.

هەڵبەتەش هێشتنەوەی کۆتایی خەونەکە بەکراوەیی بۆ ئەوەیە سەرنجی خوێنەران/بینەران بۆ ئەوە ڕابکێشێت کە چارەسەرکردنی کێشەکە لەدەست ئەوانە و کێشەکەش بەردەوام دەبێت تا چارەسەرییەکی گونجاوی بۆ دادەنرێت.

### E. بیرۆکەی شانۆیی

ئەم نۆڤلێتە لەسەر بیرۆکەیەکی زۆر بەهێز بنیات نراوە کە ئەویش ستەمکاری حوکمداری ناوخۆییە بەرامبەر بە خۆوڵاتی و خۆسەپاندنە بەسەر ڕایەڵەکانی دەسەلات

بەناوی نیشتیمان پەروەری. هەڵبەتە حوکمدار لەم نۆڤلێتەدا وا وێناکراوە کە هەموو دەسەڵاتە ماددی و مەعنەوییەکانی کۆمەڵگە لە کەسایەتی ئەودا کۆببێتەوە. بەمەش بەرپرسیارێتییەکەی ئەو بەرامبەر خەڵك و مێژوو پتر دەبێت.

### F. کەسایەتییەکان

لەم نۆڤلێتەدا دە جۆر کەسایەتی بەرچاو دەکەون:

أ) کەسایەتییە پەراوێزییەکان: ئەو کاروانچی و خانچی و کاسبکارانە دەگرێتەوە کە بەهیچ جۆرێك بەشدار نین لە زوڵم و زۆرداری کردن لە کەسانی تر.

ب) دارودەستە ستەمکارەکەی حوکمڕان: هەموو ئەو قوڵخچی و نانخۆر و سمێڵ فش و چاوسوورانە دەگرێتەوە کە بەرجەستەی دەسەڵاتی حوکمدار دەکەن.

ج) کەسایەتییە یاخییەکان: هەموو ئەو ئەشقیا و جەردانە دەگرێتەوە کە لە ڕێگادا تووشی کاروانچییەکان دێن.

د) ژنە شەهید و منداڵە شەهید و برسی و تێنووەکانی ناو شار و تەقاویتە بێ مووچە و سەربازە چەڵتووك پێدراوەکان لە جیاتی مانگانە. ئەمانەش لە بەرەی ستەملێکراوانن.

ه) ژنی حوکمڕان و دەستەخوشکەکانی: ئەمەش هەموو ئەو کەسایەتییە چاوچنۆك و ماڵ زەوتکەرانەی حەرەمسەرا دەگرێتەوە.

و) دەستەی مەلایان و فتوادەران: ئەوان هەر هەموویان ئەڵقەی دەستی حوکمڕانن لە مەسائیلی ناوەخۆدا، بەلام لە مەسائیلی دەرەکیدا حوکمڕان دەکەوێتە بەر کاریگەری قسە و گوفتاریان کە بە زۆری بەلای تورکەکاندا دەشکێتەوە.

ز)دەستەی ئینگلیزپەرستەکان: ئەو هەموو کەسانە دەگرێتەوە کە بە جاسووس و خایەن و ناپاك لەم نۆڤلێتەدا ئاماژەیان بۆ کراوە.

ح)دەستەی نیشتیمان پەروەرە سەربەخۆکان: هەموو ئەو کەسانەن کە تا ئەوپەڕی پەراوێزخراون و حوکمدار هەر بۆ گاڵتە لەگەڵیان کۆدەبێتەوە.

ت) حوكمدار: كه لەم نۆڤلێتەدا وەكو پیاوێكی ستەمكار و زۆرداری بێ ویـژدان و كۆلەوار و نەزان و  بێبار وێنەی كێشراوە.
ك) كابرای زیندانی: وەكو كابرایەكی رۆشنبیری سێ رەهەنـدی كـە رەهەنـدەكانی (فیزیكی و كۆمەڵایەتی و دەروونی) بەباش تێدا بەرجەستە بووە پێشكەشكراوە. ئـەو زیندانییە دەبێتە شاكەشی ئەم نۆڤلێتــە چـونكە ترۆپكـی رووداو و كارەسـاتەكان لــە كەسـایەتی ئـەودا بەرجەسـتە دەبێـت. هـەروەها شاكەسـی ئـەم نۆڤلێتــە كەسـێكی گەشەكردووە لەلایەنی هۆشیارییەوە. چونكە لەسەرەتای نۆڤلێتەكەدا ئـەو وادەزانێـت بەرەو بەختەوەری هەنگاو دەنێت، كەچی لەكۆتاییدا دەبێتە خاوەنی ئەو هۆشـیارییەی كە هەرچەندی زوو لەم دۆزەخە رزگاری ببێت باشترە.

## سێیەم: وەسفكردن لە نۆڤلێتی (لە خەوما)

لە ساڵی ١٩٢٠دا ، پێش نووسینی ئەم نۆڤلێتەش (جەمیل سائیب) بە نووسـینی پارچە پەخشانێكی وەسفی بەهێز گـرەوەی سـێیەمی چـیرۆكی كـوردی بردبـۆوە؛ ئـەم پێشبڕكێیە بۆ نووسینی كوردی لەلایەن (مێجەرسۆن)ەوە رێكخرابوو.
وەسـفكردنی سـەرەتای گەشـتەكە و رێگاوبـان و شـەڕی ئەشـقیا و جـەردە و كاروانچییەكان و بێنەوبەردەی بەرتیل وەرگرانی قولخچی و شەوی مانـەوەی نـاو خـان و دز هاتنەسـەر ماڵـە هەژارەكـە و كڕووزانـەوەی ژن و منـداڵی سـەربازە كوژراوەكە و داد و سكاڵای تەقاویتەكان و  داركاری كردنی كابرای مەیدانەكـە و قسەوباسـی نـاو حەرەمسـەرا و كۆبوونـەوە زۆرەكـانی حوكمـدار و وەسـفی دارودەستەكەی هەمیشە بەزیندوویی لە مێشكی خوێنەراندا دەمێنێتـەوە. هـەر ئەمەشە لەپاڵ تەكنیكەكانی تر كە لەمەوپێش ئاماژەمان بۆ كردن وادەكـەن ئـەم نۆڤلێتە بگاتە ئاستی شاكارە ناودارە جیهانییەكان.

**هەولێر: ١/١/٢٠١٢**

# کەسێتی لە ڕۆمانۆکەی (لە خەوما)ی جەمیل سائیب دا

پ. ی. د. کەمال مەعروف

(لە خەوما) هەموو مەرجێکی ڕۆمانۆکەی تێدایە. ئەوەندە هەیە زۆر پەلوپۆی بەملا و بەولادا نەهاویشتووە. لەگەڵ ئەوەشدا، بەش بە حاڵی خۆم بە دەستپێکی هونەری ڕۆمانی کوردی دادەنێم، کە (جەمیل سائیب) بوێرانە کەم و کوڕی و خەوش و گەندەڵی سەردەمی شێخ مەحموود دەخاتەڕوو، ڕەخنە دەگرێت لە لایەنی دواکەوتوویی و گەندەڵی و دزی کردن و دەم چەورکردن و ڕێگری و سەرانە و کوشتن و زوڵم کردن، کە کۆمەڵگای کوردەواری لە بیستەکانی سەدەی بیستەمدا پێوەی گیرۆدە بوو. بەشێك لەو ئاریشانەش تا ئەمڕۆ دووبارە دەبنەوە.

کەسێتی پێکهاتەیەکی هونەری گرنگە لە چیرۆك و ڕۆماندا، بە هەوێن و سەرمەشقی چیرۆك و ڕۆمان دادەنرێ، لەتەك ڕەگەزەکانی تری وەك (شوێن و کات و گێڕانەوە)، کاریگەری بەرچاو لەسەر ڕووداوەکان بەجێدەهێڵێ. هەر لە ڕێگای کەسێتییەوە لە مەرام و کرۆکی ڕۆمان دەگەین. واتە، کەسێتی کەرەکتەرێکی سەرەکییە کە تیشك دەخاتە ناو ڕووداوەکانی دەقەوە. بەشێوەیەکی گشتی، کەسێتی ناو ڕۆمان دوو جۆرن. ئەویش کەسێتی سەرەکی و لاوەکی:

١- کەسێتی سەرەکی تەوەرێکی گرنگە کە هەموو ڕووداوەکانی ناو دەقەکە لە بازنەی ئەودا دەسوڕێنەوە. بەشێکی زۆری ڕووداوە سەرەکییەکانی ناو دەقەکە بە ئەنجام دەگەیەنێ و پەرەی پێدەدات. کەسێتی سەرەکی خاوەنی پێکهاتەیەکی ئاڵۆز و بەردەوام

لە گۆڕانکاری و پەرەسەندن دایە. رەفتار و کردەوەی تـازەی لـێ چـاوەڕوان دەکرێـت. رۆڵی سەرەکی دەگێـڕێ لـە یەکلاکردنـەوەی کێشـەکان بەلایەکـدا. سـیمایەکی تـری کەسێتی سەرەکی، کەسایەتییێکی زیندووە، بەردەوام لە گۆڕان دایە. کە لـە سـەرەتاوە خۆی دەردەخات، وردە وردە بەرەو ئاشـکرابوون دەچـێ و بـەرەوپێش هـەنگاو دەنـێ. هەموو رەگەزەکانی تری رۆمانەکە لە خزمەتی کەسـێتی سـەرەکی دان، مـەرج نییـە تەنیا کەسێك رۆڵی سەرەکی هەبێ. جاری وا هەیە زیاتر لە کەسـێك دەوری سـەرەکی دەبینێ. بەڵام یەکێکیان زیاتر رۆڵی بەرچاو دەگێڕێ. لـە رۆمانۆکـەی (لـە خـەوما)ی (جەمیل سائیب) خەوبینەر و دەسەڵاتدار رۆڵی کەسێتی سەرەکی دەبینن.

٢- کەسێتی لاوەکـی پێکهاتەیـەکی سـاکار و سـادەی هەیـە، رۆڵـی ناسـەرەکی دەگێڕێ و سیمایەکی چەسپاو و نەگۆڕ بەخۆوە دەبینێـت. لـە سـەرەتای بابەتەکـەوە تـا کۆتایی شێوەیەکی دیاریکراوی هەیە. دیارە پەیوەندییـەکی بـەهێز لـە نێـوان کەسـێتی سەرەکی و لاوەکی هەیە و تەواوکەری یەکترن. کەسێتی لاوەکی لـە خزمـەتی کەسـێتی سەرەکی دان، رووداوەکان بـەرەو پـێش دەبـەن. هـەروەها زمـانیش بـەهۆی گفتوگـۆی کەسەکانەوە رۆڵ دەبینێ. کەسەکانیش هەندێ جار لەنێو کۆمەڵدا هەن، هەندێ جـاریش فەنتازیای رۆماننووسی چێدەکات و وێنەیەکی هونەری جوان بـە رۆمانەکـە دەبەخشـێ. ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە سەرنجی خوێنەر بەلای رۆمانەکە رابکێشێ.

٣- رەهەنـدی کەسـێتی، کـە لایـەنی جەسـتەیی و کۆمەڵایـەتی و دەروونـی دەگرێتەوە. رۆمانۆکەی (لە خەوما)ی (جەمیل سائیب) ئەوەندەی گرنگی بـە لایـەنی دەروونی کەسەکان داوە کەمتر بەلای پیشاندانی دیوی دەرەوە چووە. کەسێتی لاوەکـی لە رۆمانۆکەی (لە خەوما)دا، ئەمانەن: کاروانچـییەکان، دز و جـەردە و ئەشـقیاکان، باجگر و ژن و خزمەتکاری ناو کۆشك و مەلاکان و هیتر.

کەسێتی سەرەکی زۆربەی کارەکان بە ئەنجام دەگەیەنێ، کە دەخزێتە زیندانەوە، بە چاوی خۆی ئەم شتانە دەبینێ و دەڵێ:

روانیم لەلای راستی ژوورەکە بەبەرزەوە دوو سێ پەنجەرەی بچووك هەیە، شەوق و روناکی چرای لێوە دیارە، بەڵام چونکە پەنجەرەکان لە بەرزی بوون، چاوم لە هیچ نەبوو، لەو دیوەوە دەنگە دەنگێکی زۆری لێ ئەهات. هەمووشی دەنگی ژن بوو ئەهات، هەریەکە لە ئاوازێك لێ ئەدا و قسە ئەکات. بەتەواوی گوێم لە هەموو قسەکان بوو، لای چەپی ژوورەکەیش دوو پەنجەرەی گەورەی هەبوو، ئەو دیوی هەموو قەنەفە و کورسی جوانی لێ دانرابوو.*

ئەم بڕگەیەی خوارەوەش دیوی دەرەوەی کەسێتی دەسەڵاتدار پیشان دەدات و دەڵێ:

دوایی سەیرم کرد یەکێك لە دوورەوە بە کەشوفشێکەوە، دە دوانزە کەسی بەشوێنیەوە تفەنگ بەدەست، فیشەك لغ لە پشت، خەنجەر و دەمانچە لەقەد، سەرزل سەرزل، کابراکە خۆی دانەکانی هەموو ئاڵتون بوون، وردە وردە هاتە پێشەوە، خەڵکەکە هەرچی دانیشتبوون بە جارێك راستەوە بوون. خۆتان لادەن، خۆتان لادەن پەیدا بوو... کابراکە کە هاتە پێشەوە بە کبر و غرورێکەوە، بە چەناگە نیوە سەلامێکی کرد و زوو سەیرێکی منی کرد. (لە خەوما، ل ل ٤٠-٤١)

ئەم بڕگەیەی تریش رەهەندی دەروونی کەسێتی دەسەڵاتدار زۆر جوان دەخاتە ڕوو و دەڵێ:

ڕوانیم گەورەکە هەردوو چاوی دەرپەڕیووەتە دەرەوە و سۆر و مۆر بۆتەوە، ئاگری لێ ئەباری، لە دڵی خۆما وتم: یا حافیز، یا ئەڵڵا،

---

*- جەمیل سائیب، لە خەوما (بەغدا: چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، ١٩٧٥)، ل ل ٤٣-٤٤ (هەر ئاماژەکردنێکی دیکە بۆ لاپەڕەکانی ئەم رۆمانۆکەیە لەو سەرچاوە وەرگیراوە و لەناو دەقی ئەم نووسینەدا دەردەکەوێ.) (نووسەر)

بۆم بکەیت بم پارێزی لە غەزەبی ئەم پیاوە! لەگەڵ قیژاندی بەسەرما وتی: ڕاستی بڵێ تۆ جاسوسی کێ یت و کێ تۆی ناردوە؟ زوو ڕاستی بڵێ، ئەگینا ئێستا بە دار پارچە پارچەت ئەکەم! (لە خەوما، ل ٧٢)

دیارە لە بیستەکانی سەدەی بیستەمدا لەبەر زوڵم و زۆرداری بەشێك لە خەڵك ئاوارە بوونە، دەسەڵاتیش لەسەر فەتوای مەلاکان ژن و ماڵیان حەڵاڵ دەکات، ئەمەش کار دەکاتە سەر دەروونی خەوبینەر بۆیە دەڵێ:

ئیتر من لەوێوە نەهۆشم ما و نە شعور، جارێ وەکو شێت هەستام قەدەرێك لە ژوورەکەدا ئەمسەر و ئەوسەرم کرد، هەرچی خوێن لە ڕەگەکانمدا هەبوو مابو، هەمووی کەوتە جوڵە جوڵ و هاتوچۆ، پێستی لەشم ئاگری لێ ئەبۆوە، هەردوو چاوم دەرپەڕی، دانەکانم تەقە تەق بە یەکیانا ئەدا، تەمام بوو پەلاماری پەنجەرەکان بدەم و هەڵ کوتمە سەر مەجلیسەکە. (لە خەوما، ل ل ٥٥-٥٦)

(جەمیل سائیب) لەم ڕۆمانۆکەیەیدا، رەهەندی کەسە لاوەکییەکانیش بەم جۆرە وێنە دەگرێ:

١- کاروانچیەکان کە لە شار نزیك دەبنەوە باجگرەکان ڕێیان لێ دەگرن بۆ ئەوەی دەمیان چەور بکرێ: "کاروانچیەکان سەری خۆیان قەبڵاند، یەکی شتێك پارەیان بۆ گرد کردنەوە، ئەمجا ڕێی نەجاتیان پێ نیشان دان." (لە خەوما، ل ٣٣) ئینجا یەکێ لە کاروانچیەکان باری کۆمەڵایەتی و لایەنی هەژاری خەوبینەر پیشان دەدات و دەڵێ:

کابرای کاروانچی وتی ئەمە پیاوێکی غەریبە، لە گەرمیانەوە هاتوە لێرە کاسبی بکا، فەقیرە، بێ دەسەڵاتە، وتیان نابێ هەڵبەت ئەمە شتێکی لەژێر سەردا هەیە، هەبێت و نەبێت ئەمە جاسوسە، بە فێڵ و تەڵەکە خۆی وا لێ کردوە. (لە خەوما، ل ٣٣)

٢- جەردە و ئەشقیاکان کە رێ لە کاروانەکە دەگرن کار دەکەنە سەر دەروونی خەوبینەر، تووشی ترس و دڵەڕاوکێی دەکەن:

یاخوا هەر دوشمنتان بیبینێ، لە پەنا گرد و لەو کۆردەرە و شیو هەر فڕکان فڕکانی تەریدە و جەردە بو، پۆل پۆل ئەهاتنە سەر رێگەمان و قەدەرێك شەڕە تفەنگ ئەکرا و زەفەریان نەئەبرد، خۆیان ون ئەکرد، هەتا دەمە دەمی عەسر بەم ڕەنگە رۆیشتن بەرێوە و منیش چونکە بە عومری خۆم ئەحواڵی وام نەدیبو، زۆر ئەترسام. هەر لەگەڵ تەقەی تفەنگێك ئەهات وەختە بو رۆحم بچێت، ئەموت ئەها هەر ئێستا ئەکوژرێم. (لە خەوما، ل ٣٠)



٣- خزمەتکار بەزەیی بە خەوبینەر دێتەوە و هاریکاری دەکات و دەڵێ:

خۆ ئەمە گاورسانی نیە ئەم فەقیرە لە بەیانیەوە بێ نان و بێ ئاو لێرە حبس کراوە، خوا هەڵناگری هەر لەخۆیەوە لەو پاشماوانە چەند پارچە نانێکی دامێ و کاسەیك ئاویشی لەلا دانام. (لە خەوما، ل ٤٢)

٤- مەلاکان: (جەمیل سائیب) لە ڕووی جەستەییەوە وێنەی دەرەوەی مەلاکان زۆر سەرنج راکێشەرانە دەکێشێ و دەڵێ:

روانیم چوار مەلای نورانی یەك لەدوای یەك هاتنــە ژوورەوە، هــەموو جبەی قۆڵ فش لەبەردا، چاویان ڕشتوە، میزەرەکانیــان هــەموو ســپی وەکو چوڕی شیر، هاتن سەلامیان بە ئەدەبــەوە کــرد و دانیشــتن. (لــە خەوما، ل ٥٠)

لە وەسفی وەلاکان بەردەوام دەبێ و دەڵێ:

مەلاکان هەر چواریان رەنگێکیان هێنا و بــرد و ســەیرێکی یــەکتریان کرد. لە دواییدا یەکێکیان تیا بوو نەختێك بە پەلــە قســەی ئــەکرد و دانیشی لە دەما نەما بوو، چــمکی مێــزەرە ســپیەکەی شــۆڕبووبوەوە خوارەوە هەتا لای پشتێنەکەی، عەسایەکی باسقەندی بەدەستەوە بوو، سیواکێکی درێژی کرد بــوو بــە پشــتێنەکەیدا، جــار جارێــك تۆزێــك بڕنووتی هەڵ ئەمژی، لکی فەقیانە ســپیەکەی لــە قــۆڵی جبەکەیــەوە هاتبووە دەرەوە. (لە خەوما، ل ٥٢)

٥- ژنەکان: نووســەر وێنەیــەکی زۆر جــوانی ژنــی دەســەڵاتدار دەکێشــێ، کــە ئەوانیش لە راوروت کردن و دەم چەورکردن بێ بەش نین. بۆیە خەوبینەر دەڵێ:

هەستام وردە وردە چومە بەر پەنجەرەکان کە بەســەر ژووری ژنەکانــدا بو،... گوێم دایە قسەکان، غەیری ئاڵتون و مجوهرات و جلــی جــوان و ئەم نەوعە قسانە نەبێ جاریێ هیچی ترم بەرگوێ نەئەکــەوت. دەنگــێ ئەهات ئەیوت قوربان ژنی فلانە کەس جوتێ گوارەی زۆر عەنتیکــەی هەیە، ئەو ساڵە مێردەکەی لە ئەستەمبوڵەوە بۆی هێناوە. ســێ رێــز ئەڵماسی تیا قایم کراوە، ئەڵێن لەوێ بە سەد و پــەنجا لــیرەی کڕیــوە،

بەڵام قیمەتی هەر تەواو نابیٚ، بە خوا ئەوە هەر بۆ تۆ جوانە، تـۆ لـیٚ ی بسیٚنە بۆ خۆت. ئەویش ئەیوت سبەینیٚ ئەنیٚرمە سەری خۆشی بیٚ و ترشی بیٚ لیٚ ی ئەسیٚنم. (لە خەوما، ل ل ٤٤-٤٥)

پاشان دەنگی پیریٚژنیٚ هات و وتی:

قوربان فلاٚنە ژن ئەموستیلەیەکی زمڕوتی هەیـە مـن خـۆم بـە شـەو دیومە وەك چرا ئەدرەوشیٚتەوە، دڵی نایەت بۆ خۆی بیکاتـە دەسـتی، چەند جار (٣٠) لیرەیان داوەتیٚ نایدا. میٚردەکەی ئەو سـاڵە لـە شـام کڕیویەتی بە چل لیرە بۆی، بە خوا ئەوە هەر بۆ دەست و پەنجـەی تـۆ جوانـە، ئـەویش وتـی بـە خـوا راسـت ئەکـەی مـن زۆر حـەز لـە ئەموستیلەیەکی وا ئەکەم، بەیانی بیرم بخەرەوە بنیٚرمە سەری بیهیٚنم. یەکیٚکیش وتی: بە خوا رەنگە دڵی نەیە بیدات، زۆری خـۆش ئـەویٚ، ئەویش وتی چۆنی نادا، بـە خـوا نەیـدا میٚردەکـەی حـبس ئەکـەم و ماڵەکەشیان تالاٚن ئەکەم. (لە خەوما، ل ٤٥)

پاشان ژنیٚکی تر وتی:

قوربان من بیستومە ماڵی فلاٚنە کەس پیرۆزەیەکیان هەیە، ساڵیٚ لـە کەربەلا کڕیویانە بە هەشـتا لـیرە هینـی شـای عەجـەم بـوە، لـەویٚ بەخشیویەتی دەست ئەوان کەوتوە، ئەوە بۆ تۆ جوان و باشـە، ئـەڵیٚن پیرۆزە بۆ رووناکی و چاو و هیٚزی دڵ چاکە، ئەویش وتی بە خوا راست ئەکەیت، خۆ ئەوان هەر خزمەتکاری خۆمان بوون، سبحەینیٚ زوو تـۆ بچۆ ئەو پیرۆزەم بۆ بهیٚنە. (لە خەوما، ل ٤٥)

لە کۆتاییدا  دەگەینە ئەو راستییەی کە کەسێتی رۆڵی گرنگ دەگێڕێ لە چیرۆك و رۆماندا. (جەمیل سائیب)  هەوڵی داوە لە ڕێگـای کەسـەکانەوە رۆژگـاری نالـەبار و شێواوی سەردەمی شێخ مەحموودی حەفید بخاتە ڕوو. پێم وایە (جـەمیل سـائیب) لـە کارەکەیدا سەرکەوتنی باشی بە دەسـت هێنـاوە و توانیویـەتی وێنەیـەکی خـەیاڵی و واقیعی سەردەمەکە بکێشێ.

**کۆیە ٢٠١٢/١/٧**

# له خه‌وما *

**خوا به‌خێری بگێڕێ:**

شه‌وێك له خه‌وما وا له دنیادا گێرم خواردووه. ساحێب كولفه‌ت و منداڵ، بێ پول و بێ پاره، ده‌ست سپی و بێ مایه ماومه‌وه. زۆر ئه‌حواڵێكی خراپ و ناخۆشم هه‌یه. هه‌ر بیر ئه‌كه‌مه‌وه له‌به‌ر خۆمه‌وه ئه‌ڵێم، یا ره‌بی چی بكه‌م، چۆن هه‌وڵێك بده‌م شتێكم ده‌ست بكه‌وێ. ئیداره‌ی خۆم و ماڵ و منداڵمی پێ رێك بخه‌م و له ژێر باری قه‌رز و نه‌بوونیدا ده‌ربچم. هه‌رچه‌نده سه‌رم هێنا و برد غه‌یری سه‌فه‌ركردن هیچ چاره‌یه‌كی ترم بۆ خۆم نه‌دۆزییه‌وه. وه‌ختیش ئاخر و ئۆخری پایزه، سارد و سه‌رمایه، زستانیش له پێشه‌وه‌یه، به‌ری دووره، ته‌ئمینی ئیداره‌ش لازمه. به ناچاری و ناعیلاجی كه‌وتمه سه‌ر خه‌یاڵی سه‌فه‌ر، له‌گه‌ڵ ماڵ و منداڵ ته‌گبیرمان كرد و قه‌رارمان دا كه سه‌فه‌رێك بكه‌م، به‌ڵكو هیچ نه‌بێ ئیداره‌ی ماڵ و منداڵه‌كه‌م پێك بێنم. منداڵه‌كانم له‌و مه‌مله‌كه‌ته به‌جێ هێشت بۆ خوا، خۆشم ناوی خوام لێ هێنا و هه‌ڵسام رووم كرد بۆ به‌ره‌وژوور وتم وڵاتی ئیسلامه. له‌و سه‌ره‌وه ئیسلام و پیاوچاك زۆرن، یاریده‌ی یه‌كتری ئه‌ده‌ن، منیش موسوڵمان ئه‌چم به‌ڵكو له‌وێ به هه‌ر نه‌وعێك بێت ئیداره‌ی ئه‌م زستانه‌م ته‌ئمین بكه‌م و بیهێنمه‌وه بۆ منداڵه‌كانم. دوو سێ كولێره‌م به‌سته پشتم و شوێن كاروان كه‌وتم، ئه‌و رۆژه به پێیان رۆیشتم، به‌ڵام چونكه قه‌ت به‌پێ نه‌ڕۆیشتبووم، زۆر هیلاك و

---

* ئه‌وه‌نده‌ی ئێمه پێمان زانیبێت (جه‌میل سائیب) له ماوه‌ی ژیانی خۆیدا ئه‌و تاقه شاكاره‌ی بڵاوكردۆته‌وه له‌گه‌ڵ تاقه په‌خشانێكی كورت، بۆیه به پێویستمان زانی ئه‌م ده‌قه شاكاره‌ی لێره چاپ بكه‌ینه‌وه، ئه‌گینا ئه‌مه بۆ شاكارنووسانی تر ناگونجێ چونكه ئه‌وان به‌رهه‌میان زۆره و مه‌ودای ئه‌وه‌مان نابێت ئه‌م كاره بۆ ئه‌وانیش بكه‌ین. (د. ئازاد)

ماندوو بووم، له پاش چەند سەعاتێك هێز له ئەژنۆم بڕا، هەرچەندم کرد و کۆشام توانای هەنگاوێکم نەمابوو بینێم بەرێدا. پێم هەموو بووبوو به بلۆق، هەناسەبڕکێم پێ کەوتبوو، زمانم بستێ دەرکێشابوو، هێزی قسەکردنم نەمابوو، ڕووانیم فائیدەی نییە، ناتوانم بڕۆم بەرێوە، قەرارەکەشم قەتعییه بۆ ئەم سەفەرە، هەر ئەبێ بچم، چونکه چارەی ترم نییه. پوولێ پارەیەکیشم پێ نییه که بیدەم بەکرێی ولاخ. هەرچەند سەرم هێنا و سەرم برد هیچ چارەیەکم نەدۆزییەوە، ئیللا ئەمە نەبێت. هاتم لەگەڵ یەکێك له کاروانچییەکان خۆم ڕێك خست، پیرەمێردێك بوو، چوار پێنج ولاخی پێ بوو، خۆشی تەنها بوو. وتم: مامه تۆ بۆچی نایەیت تاوتاوە من سوار بکەیت و ماندووم بحەسێتەوە، منیش له ڕێگاوبان خزمەتی ولاخەکانت لەگەڵ ئەکەم و له ئیشەکانتا یاریدەت ئەدەم. کابراکه پیاوێکی باش بوو وتی هەزار جار مەمنوونیش ئەبم. بەو ڕەنگه قەرارمان دا و ڕێك کەوتین و بۆخۆم سواری ولاخێك بووم هاتین بەرێوە، ئەو شەو و ڕۆژە به ڕەحەتی و بێ قۆرت و ئەمبەر و ئەوبەر هاتین بەرێوە. هیچ سەغڵەتیمان نەدی، له پاش شەو و ڕۆژێك ئیتر گەیشتینه حدوودی ئەو ولاتەی که بۆی ئەچووین.

یاخوا دوشمنی ئیمانت بێ! ئەو ڕۆژە له سێ چوار لاوە جەردە و ئەشقیا هاتنە سەر ڕێگەکەمان، بوو به تەق و هۆڕی تفەنگ و شەڕ و هەرا، فەقەت کاروانەکەی ئێمە قەلەبالغ بوون و هەموو تفەنگیان پێ بوو. لەبەر ئەوە جەردەکان هیچیان زۆریان بەسەریاندا نەئەشکا و ئەگەڕانەوە. شەو له مەنزڵ ماینەوە، سبحەینێ کەوتینه ڕێ، یاخوا هەر دوشمنتان ببینێ، لەم پەنا گرد و لەو کۆردەرە و شیوە هەر فڕکان فڕکانی تەریدە و جەردە بوو. پۆل پۆل ئەهاتنە سەر ڕێگەمان و قەدەرێك شەڕە تفەنگ ئەکرا و زەفەریان نەئەبرد، خۆیان ون ئەکرد. هەتا دەمەدەمی عەسر بەم ڕەنگە ڕۆیشتین بەرێوە و منیش چونکه به عومری خۆم ئەحواڵی وام نەدیبوو، زۆر ئەترسام. هەر لەگەڵ تەقەی تفەنگێك ئەهات وەختەبوو ڕۆحم بچێت. ئەموت ئەها هەر ئێستا ئەکوژرێم، له پاشاندا کاروانچییەکان وتیان ئێمە هەرچییەکمان کردووە، ئەبێ ئەم شەو خۆمان بگەیەنینه ناو شار، چونکه ئەگەر ئەمشەو لەم ناوەدا بمێنینەوە ئەم

جەردانە بەیانی چەند تاقمێکیان یەك ئەکەون، دێنە سەر ڕێگەکەمان هەرچی خراپە بەسەرمان ئەهێنن. قەراریان دا کە بە هەموویان نەوەستن و لێ خورن، ئەو شەوە هەر خۆیان بگەیەننە شار. منیش ئەم قەرارەم زۆر پێ خۆش بوو. چونکە ئەمویست سەعاتێك زووتر بگەمە جێی مەقسەد و هەموو ئومێدێکم لەوێ پێك بێت و لەم نارەحەتی و ترس و لەرزە نەجاتم بێت. لام وابوو هەر بگەمە ئەوێ ئیتر نۆرەی فەرەحی و خۆشیم ئەبێت.

دنیا لە پاش نیوەڕۆوە بوو بە هەور و هەڵڵا. کزەبایەکی زۆر ساردی ئەهات، جار جار برووسکە و چەخماخەی ئەدا. پاش عەسر تنۆکە تنۆکە دای کردە باران. ئێمەیش هەر ئەڕۆین، ئەڵێین لەسەر خوا. هەر چۆنێك بێت هەر بڕۆین چاکە. خێرا لێمان خوڕی هاتین بەڕێوە بارانیش هەتا بێت زیاد ئەکات. منیش لە سەرمانا وەختە زیڕە بکەم. شەویش هات بەسەردا تاریك و نووتەك. ئەسڵی ئەمەیە ئەڵێن "تاریکە شەوە گەلاڵی لەناو شەو بوو تاریکە و ئەموستە چاو"* کەس بەری پێی خۆی نەئەبینی، ترس و لەرز، سەرما و باران، زەندەقدار زەندەقی ئەچوو. بارانیش وەکو کوندەی سەرەوژێر دێتە خوارەوە. کەی کەم ئێستا کەم، شەست و ڕەهێڵە، کلاوبەسەر ئەبارێ. لەملاوە لەولاوە ئاو هەڵساوە، بەباوە ئەم بارانە ئەهێنێ، ئەیدات بەسەر و چاوی ئینساندا، قوڕ و چڵپاو، گەردەلوولێکە (العياذ بالله). منیش ئاو لە تەپڵی سەرمەوە دێتە خوارەوە لەبەری پێمەوە ئەچۆڕێتەوە. لەرزە لەرزی بەدەنم قرچ و هۆڕی دانم ئەهات، دەزوویوشك لە بەدەنمان دا نم بوو.* هەر خێرا خێرا ئەمپرسی، زۆرمان ماوە بگەینە شار یان نا؟ ئەیانوت هێشتا ماومانە، تاوتاو بەو حاڵەوە لەبەر هیلاکی خەویشم ئەهات و وەنەوزەکوتێم بوو، لە پڕێکدا کەرەکە لە ژێرما سەرسمێکی ئەدا و گرم ها ڕائەپەڕیم و خەبەرم ئەبووەوە، نەختێك چاوم ئەگلۆفت و بەهۆش ئەهاتمەوە. وردە وردە بیریشم لە حاڵی خۆم ئەکردەوە، چونکە لە عومراتی خۆم سەفەری وا نارەحەتم نەکردبوو پەشیمانیم حاسڵ کرد.

---

* پەندێکی پێشینانە، مەبەستی ئەوەیە دز و جەردە لەناوە.

* ئەمیش هەر پەندێکی پێشینانە، مەبەستی ئەوەیە هەموو گیانی تەڕە.

لەم ناوەدا و لەو قیامەتەدا دیسانەوە لە دوو سێ جێگەی تر جەردە هاتنە سەر ڕێگامان. کوڕە مەڕۆن رووتەوە بن، کوڕە نەیەنە پێشەوە ئەکوژرێن. تەقوتۆقی تفەنگ، گیز و هۆڕی گولله بە پەنا گوێچکەمانا وەختەبوو رۆحم بچێ، لە ترسانا هەر ئەوە بوو زەیرەم نەئەکرد. ترسولەرز و دڵەکوتێ، وەرە بەم حاڵەوە هەر سەعاتە نە سەعاتێك ئەمیش یەخەت بگرێ. هەر ئەڕۆیشتم ئەموت یارەبی تۆ نەجاتدەری نەجات، کەی ئەگەینە فەرەحی و نەجاتمان ئەبێت. خۆلاسە سەرتان نەیەشێنم سەعات چوار و پێنج بەدواوە لە دوورەوە دەنگی سەگوەڕ هات. وتیان ئەها وا نزیك بووینەوە، لە دڵی خۆما شایتمانێکی بە حەقم هێنا و خۆشی کەوتە دڵمەوە. ئەو لەشە ساردەم لە خۆشیان گەرم بووەوە، زیندوو بوومەوە، وردە وردە هاتین روانیمان لە دەرەوە تروسکەی چرا و ئاگر دەرکەوت، وتم ئۆخەیش شوکر وا نەجات بووم. بەم حاڵەوە هاتین گەیشتینە قەراغ شار، ئەمجاریش قەدەرێ شوکری خوام کرد کە لەو رەزالەت و موسیبەتە نەجاتمان بوو و گەیشتینە فەرەحی.

## گەیشتنە شار و ئەوەڵ قۆرت

سەیرم کرد لەو نیوەشەوەدا، لە قولغەیەکی قەراخ شار، سێ کەس بە تفەنگەوە دەرپەڕین و وتیان کوڕە مەڕۆن بزانین ئێوە کێن و لە کوێوە هاتوون و چیتان پێ هەیە و بۆ کوێ ئەچن؟ وتم ئەمە چی بوو، دەك بە زیادی خێرم نەکرد. نەخێر سەیرم کرد پیرە کاروانیان خستە حەلوەلا و شەقوشۆق، لەمیان ئەدا و بەویاندا ئەکوتا. پەلەماری ئەو باریان ئەدا، سەروپۆتەلاکی سێ چوارێکیان کوتایەوە. لەو ناوەدا قسەی خۆمان بێ منیش بەر یەك دوو شەپازللەی مزر کەوتم. من هەروا واقم وڕ مابوو ئەموت ئەمە چی بوو. ئێمە خۆشی خۆشی وا گەیشتینە جێی مەقسەد کەچی ئەم زرموکوتە چی بوو؟ وتیان: دەی درەنگە بزانین قاقەزتان چی پێ هەیە، بارتان چییە، لە کوێوە یەن؟ وتیان لە فلانە جێگەوە دێین و خەڵقی فیسارە جێین. بارمان شەکر و چایە، کاغەز و ماغەزیشمان هیچ پێ نییە، هانێ بمانپشکنن. خۆلاسە لەبەر ئەو باران و رەهێڵەیە نیو

سەعات زیاتر بەم گێرمە و کێشەیەوە بووین، تاکو کاروانچییەکان سەری خۆیان قەبڵاند، یەکی شتێك پارەیان بۆ گرد کردنەوە، ئەم جار رێی نەجاتیان پێ نیشان دان، لە پاشان دووان لەو باجگرانە هاتن بەلای منەوە، لەو تاریکاییەدا سەیرێکی سەروسەکوت و قەد و قیافەی منیان کرد. لێم مۆڕ بوونەوە، ئەم جار یەکێکیان شخارتەیەکی داگیرساند و تەماشایەکی کرد وتی: ئەمە چییە، کێیە؟ لە کوێوە هاتووە، بۆ کوێ دەچێ؟ کابرای کاروانچی وتی: ئەمە پیاوێکی غەریبە، لەو گەرمیانەوە هاتووە لێرە کاسبی بکا. فەقیرە، بێدەسەڵاتە. وتیان نابێ. هەڵبەت ئەمە شتێکی لە ژێر سەردا هەیە. هەبێت و نەبێت ئەمە جاسووسە. بە فێڵ و تەڵەکە خۆی وا لێ کردووە. ئەوانیش وتیان: کوڕە نەبەخوا جاسووسی چی، فەقیر و غەریبە هاتووە لێرە کاسبییەك بکات بۆ خۆی و چەند پارەیەك بۆ ماڵ و منداڵی پێکەوە بنێ. نەخێر کاروانچییەکان زۆریان وت و ئەوان کەمیان بیست. هاتنە پێشەوە لێم، دەوریان دام، هەموو لەشمیان پشکنی، سەر و کڵاویان داماڵیم، تەلیتەکیان سەنگ و سوژن دا. زۆر ئەملاوئەولایان کرد هیچ نەبوو، منیش خۆ کە ناوی جاسووسیم بیست هەر حەپەسام و تاسام هیچ قسەم پێ نەکرا هەر وا واقم وڕ مابوو. قەدەرێکی باش بەم رەنگە چەرمەسەرییان دام. هیچیان نەدۆزییەوە. ئەمجار دووانیان لاپەڕیان لێ گرتین. نەختێ سرپ و هۆڕیان کرد و هاتنە نزیك ئێمە، کابرای کاروانچییان بانگ کردە لاوە. لەگەڵ ئەویش قەدەرێك چرپەچرپیان کرد، کابرایەکیش هات بەلای منەوە. وتی: باوکم ئەمانە بە هیوای ئەوەن شتێکیان بدرێتێ، منیش سوێندم بۆ خواردن کە تۆ لە هیچا نیت و هیچیشت نییە بیاندەیتێ، فەقەت ئەوان دەست هەڵناگرن و چۆن لە ژێر چنگی ئەم بەدبەختانە دەرت بێنین. منیش تێ گەیشتم کە ئیشەکە نارەحەتە و ئەمانە تەشقەڵە ئەکەن. یان ئەبێ شتێکیان بدرێتێ یان ئێمە بە قەڵبەیەکدا ئەدەن و منیش کێچ لە باخەڵمدا بۆ پولێك سەوزەڵە گیانم ئەڵێ. هەرچەندە سەرم هێنا و سەرم برد، چارەسەرێکم بۆ خۆم نەدۆزییەوە، وتم فلانی تۆ خۆت ئەزانی کە من هیچم نییە بیاندەمێ و خۆمان لە شەڕیان لادەین و ئاگاشم لەم شتانە نییە کە ئەوان ئەیلێن، جا

کەیفی خۆیانە ڕەزام بە قەزای خوا دەسەڵاتم چییە. کابرای کاروانچی ئەم جاریش لەگەڵ هاوڕێکانی چوونەوە بەلایانەوە، قەدەرێکیان لەگەڵ وتن و ڕستیان، هەر ئەیانوت فائیدەی نییە. منیش بە جارێك سەری دنیام لێ هاتبووە یەك. ئەموت یاڕەبی چی بکەم؟ بۆ ریش هاتم سمێڵیشم نایە بان. لەو تەنگوچەڵەمەیەدا هیچ ڕێگایەکم بۆ خۆم نەدۆزییەوە. دوایی کابرای کاروانچی وتی باوکم خوا هەڵناگرێ ئێوە سەعاتێ زیاترە بەم تاریکە و سەرما و لێزمەیە، ئێمەتان لەم قوڕەدا ڕاگرتووە. ئێمە وا ئەچینە فلان خان ئێوە بەیانی وەرنە ئەوێ. سا لەوێ بەڵکو شتێ بە شتێك بکەین. بەم ڕەنگە ئەوانیش دەستبەردار بوون و بەرایی کاروانەکەیان بەردا. ئێمەش لێمان خۆڕی و چووینە ناو شارەوە. ئەما من لەم سەفەرە زۆر پەشیمان بوومەوە. دڵم گیرابوو. مەئیوس بووم و وتم ئەمە ئەوەڵی بێت، ئاخۆ ئاخری چۆن ئەبێ. لەو سەعاتەوە کە هاتبوومە دەرەوە لەماڵی خۆم هەتا ئەو دەقیقەیە بیرم لێ کردەوە و من لەو دوو سێ ڕۆژەدا چەندم مەرارەت بەسەرا هات و چەند نەوعە ئەزێت و موسیبەتم دی. چارەیشم هیچ نەبوو. نەڕێی ڕاکردنم بوو، نە توانای گەڕانەوە، هەر ئەمەندەم بۆ مابووەوە ئەموت خوا چاکی بکات. بزانین ناوچەوانم چی لێ نووسراوە. بەمانەیش ببڕێتەوە هەر چاکە، خوا خراپتر نەدا. وردە وردە هەر ئەڕۆم ئەم خەیاڵاتە ئەکەم. ڕۆیشتین هەتا بەهەر حاڵێك بوو گەیشتینە خانەکە و دەرگەیان لێ کردینەوە و چووینە ژوورەوە، سەرما، قوڕ، دڵۆپە، بێ ئاگری، لەرزێیکیش چوبووە ناو سکمەوە زۆرم سەرما بوو. هەموو لەشم بەجارێك داهێزرابوو. تێك شکابوو. هیلاك، ماندوو، مردوو، خەوم یەت. برسیمە، نەخۆشم. هەر نازانم بڵێم چی.

## ئەحواڵی خان و دووەمین قۆرت

بەهەر حاڵێ بوو، لە قوژبنێکی ژوورەکە بە تورسکەی چرای قوتیلکەی خانچییەکە بستێ جێگای وشکم دۆزییەوە. لەسەر تا جەواڵێکی کاروانچییەکان بە چیچکانەوە هەڵتروشکام و سەرم نایە سەر ئەژنۆم. لە ئەوەڵی عومرمەوە هەتا ئەو دەقیقەیە پەڕە

پەڕە تەئریخی ژیانی خۆم خوێندەوە کە لە دنیادا من بە ئەمەل و هیوای چی ژیاوم ئێستا چ رۆژ و سەعاتێکم دی، زۆر زۆر مەئیوس بووم دڵم پڕ بوو لە خوێناو، بەو رەنگە هەتا نزیکی سەعاتێك رام بوارد. کابراکانیش کەروباری خۆیان دامەزراند. هەر یەکە لە سووچێکەوە لاڵ و پاڵ لێی کەوتن. پڕخوهۆڕی خەویان لیٚ هەڵسا. گوێم گرت لەو نزیکانەوە لە ماڵێك دەنگی شیوەن و گریان و لاواندنەوە و کڕووزانەوە یەت. ئەمما چۆن دەنگیٚ! هەروا بەردی ئەتوانەوە. هەر وەکو بهێنی ساجێك ژیلەمۆ بکەیتە جەرگمەوە ئاگرم تیٚ بەربوو. خۆم لەبیر چووەوە، بیٚ پەروا وەکو شێت راپەڕیم چوومە دەرەوە. لە خانچییەکەم پرسی وتم: ئەم شیوەن و گریانە چییە؟ هیچێکی وا نییە ئەو ژن و منداڵانە مێرد و باوکیان کوژراوە. کابرای تاین بەڕەنگی وابیٚ ئەهمیەتانە وتی (ئەوە هیچ نییە) کە من لە جێگەی خۆم هەر وشك بووم. مەگەر من شتی وا ئەوەڵجارە ئەبینم و کابرایش ئەم نەوعە شتانەی زۆر دیوە. راهاتووە و ئەمانە هەر بەهیچ ئەزانیٚ.

منیش قەدەریٚ رامام و لەبەر ئەو سەرما و بارانە گوێم لەو گریان و کڕووزانەوەیە گرت و چەند فرمێسکی حەسرەتم هەڵڕشت. دوایی وتم یارەبی تۆ خەبیر و قادری چی بکەم و من چیم لە دەست یەت؟ هەروا بە هەناسەی ساردەوە گەڕامەوە ژوورەکەم و دانیشتم. هەر تاس ئەیبردمەوە، قەدەرێکی باش بەو ماتەمینییەوە سەرم نایەوە، هیچ فائدەی نەبوو. لە تاوانا هیچ خەویشم لیٚ نەئەکەوت. هەر ئەوەندەم زانی لەو دیو خانەکەوە تەقەی تفەنگ و هەرا و زەنا و زریکە و هاوار پەیدا بوو. چەند تەقەیەك هات. بوو بە غەڵبەغەڵب و گریان و شیوەن و بانگەبانگ. دیسانەوە خۆم نەگرت و دەرپەڕیمە دەرەوە و گوێم گرت. هەر ژن و منداڵ بوون لەو دیوەوە بە گریانەوە قسەیان ئەکرد. ئەپاڕانەوە و ئەلالانەوە. ئەم جارەیش لە خانچییەکەم پرسی وتم ئاخۆ ئەمە چییە، ئەم جارە چی بووە؟ وتی چووزانم پیاو ئەگەر من بۆ ئەمانە جوابی تۆ بدەمەوە ئەبیٚ خەریکی هیچی تر نەبم هەر جوابت بدەمەوە. شەو و رۆژیٚ سەد شتی وا لێرە ئەقەومیٚ، وتم ئاخر خاڵۆ تۆ عاجز مەبە ئینسان لەمانە دڵی ئەبیٚ بە ئاو. چۆن ناپرسی! وتی ئاخر تۆ شتی وات

نەدیوە بۆیە هەموو شتێ ئەپرسی. هێشتا ڕانەهاتوویت. ئەوە ساحێبی ئەم ماڵە نازانم چەند ڕۆژێکە لە سەر جاسووسی و ماسووسی گیراوە و فەلاقەیەکی زۆر کراوە و لە پاشان داوای جەزایەکی زۆریان لێ کردووە. ئەویش پارەی نەبووە بیدا ماڵەکەیان فرۆشتووە. ئەویش بەشی جەزاکەی نەکرد، ئێستاش خۆی هەروا حەپسە، کەچی ئەوا فەقیرە دز هاتووەتە سەر ماڵەکەشی ئەو تۆزە پڕووپیتەیشیان کە ماوە هەڵبەت بردوویانە. وا تفەنگیشیان پێوە ئەنێن. ئێستا منداڵێکیشی نەکوژرابێت هەر چاکە. وتم ئەرێ ئەم هەموو جاسووسە چییە لێرە هەیە؟ کابرای خانچی سەرێکی لێ لەقاندم و سەیرێکی فەساڵی کردم و تۆزێك پێ کەنی وتی: ئای باوکم ئەمە نەخۆشییەکە هەموو کەس ئەبێ بیگرێ. تۆ غەریبی هێشتا ئەمەت نەدیوە. بەڵام چاوت نەفرێ تۆیش ئەیبینی. ئیتر منیش بەماتومەلوولی هاتمە ژوورەوە و سەرم نایەوە و لێی کەوتم. فەقەت هیچ خەوم نەبوو، ئەحواڵێکی زۆر خراپ و ناڕەحەتم بوو. لە سەرمانا هەڵئەچۆقیم. برسی، دڵگیراو، عاجز، مات، هەر بیرم لە خۆم و لە دنیا ئەکردەوە. هەر سەعاتە نە سەعاتێکیش لەملا و ئەولاوە تەقوهۆڕی تفەنگ، هاواروبانگی خەڵق ئەهات. منیش لە تاوانا ڕائەچەنیم. فەقەت، نەمئەتوانی بچمە دەرەوە، هەر چۆنێك بوو بەو حاڵەوە ڕام بوارد هەتا بەیانی.

## ڕۆژەوەبوون و قۆرتی سێیەمین

بەیانی لە تاریکە و لێڵەدا بوو هێشتا، گوێم گرت لە دەرگایان دا. دەرگا کرایەوە، ڕوانیم سێ زەبەلاح هەڵیان کوتایە ژوورەوە، وتیان کوانێ کابرای جاسووسەکە. مامەی کاروانچی منی نیشان دان و وتی: ئەوەتە. باوکم ئێوە بۆچی ئینساف و ڕەحمتان نییە. ئەم فەقیرە غەریبە و هیچی لێ هەڵناسێ و سوێندی مەغلەزەتان بۆ ئەخۆم ئاگای لە هیچ نییە. لە تاو دەردی نەبوونی و کەمدەستی خۆی کۆتاوە بۆ ئێرە. ئێستا بێ دەسەڵات و بێ پارەیە، ناتوانێ سەری خۆی بقەبڵێنێ و خزمەتێکی ئێوە بکات. ئەوا لێرە خەریك ئەبێ. ئەگەر بۆی هەڵبسووڕێ ئیشێ، کارێ ئەگرێ بە دەستەوە.

لەمەودوا لەبەر دەستی خۆتاندا ئەبێ. ئەتوانن هەموو وەختێ بە هەوەسی خۆتان بیرووتێننەوە و لەبەرەوە حەقی ئەم چاکەیەتان بۆ بکاتەوە. کابرای کاروانچی بەم قسە مێچکەمێچکانە گەلێکیان لەگەڵ خەریك بوو، زۆریان بەدەور و پشتا هات لە ئاخری هەموو شتێکدا وتیان ئێمە ناتوانین وازی لێ بێنین. ئەم خەبەرە ئاخری ئەگاتەوە جێی خۆی، دوایی ئێمە تووشی موسیبەت و بەڵا ئەبین. کەوابوو ئێمە خۆمان بۆچی تووش بکەین. هەر ئەبێ بیبەین لەگەڵ خۆمان. کاروانچییەکانیش وتیان ئاخر ئەوا ئێوە ئەم فەقیرەتان برد و کردتان بە کوڵکی موسیبەت و ئەزیەت و لێدان و گرتن و ئەمانەوە چی بە ئێوە ئەبڕێ؟ نەوەڵڵا کەوابوو خوا هەڵناگرێ، رەحمی پێ بکەن وازی لێ بێنن. هەزارتان بۆ دنیا کردووە، ئەمەش بۆ خوا بکەن. ئەمە بەم گێرە و کێشەیەوە بووین هەتا نزیکی هەتاو کەوتن. خوا کاریان راست بێنێ ئەو کاروانچییانە بەدەوروپشتی ئەواندا هاتن و تەفرەیان دان، بەڵام بێ فائیدە بوو. ئەوان هەتا ئەهاتن شێتگیرتر ئەبوون و ئاگریان ئەگرت. ئاخری یەکێکیان وەکو هار پەلاماری منی دا و قۆناغە تقەنگێکی کێشا بە کورتە کەلەکەما وتی: هەڵسە با بڕۆین. تەماتە بەم گێلەگێلە و خاوەخاوە هاتووی لێرە جاسووسی بکەیت. ئێستا من ئەزانم چیت بەسەر ئەهێنم. کوڕە وتم پیاوی چاك بن رەحم و موسوڵمانەتیتان بێ. بە خوا هیچم بەبەرەوە نییە. ئەمە چەند رۆژە بەم باران و سەرمایە هاتووم بەڕێدا. هیلاك و برسی و نەخۆش و غەریب، خوا قەبووڵی نییە  وازم لێ بێنن و ئەزیەتم مەدەن. هەر ئەوەندەم زانی یەکێکی تریان لە پشتەوە زرموهۆڕ دامییە بەر پێ لەقە و شەپازللە وتی: یاڵڵا پێشمان کەوە. وا ئەزانی سەری دنیا بەپووش گیراوە. ئەوی تریشیان لێم هاتە پێشەوە بەپاڵەپەستۆ بەهەر سێکیان دایان گرتم (عەیب نەبێ) بە شەق و زللە و لێدان و سەروسەکوت کوتاندنەوە پێش خۆیان دام. ئیتر هەرچەندە کاروانچییەکان پاڕانەوە و لالانەوە هەوڵ و تەقەلایان دا و دەخالەتیان پێ کردن، بێ فائیدە بوو، پارەی نەکرد و رایان فڕاندم بۆ کۆلان. هەروا لە کۆلان و بازاڕدا هێنامیان بەرێوە، خەڵق و خوا هەروا تەماشایان ئەکردین، بەعزێ کەس ئەمڕوانی بەزەیی بەمنا ئەهات لەبەر خۆیەوە پرتەوبۆڵەیەکی

ئەکرد، بەعزێك کەسی تر پێم پێ ئەکەنین، ئەیانوت ئەمە جاسووسە با بیخو. تەماشام ئەکرد لە ناو شاردا بەعزێك قیافەتم ئەبینێ هەروا ئینسان زراوی لێ ئەتۆقێ. هەریەکە دە دوانزە چەفتە و مشکی و جامانەی رەنگاورەنگیان تێك ئالآندووە و بەسەریانەوە بەستووە هەرەیەکە بەقەدەر بەرداشێ. چوار ریز و پێنج ریز فیشەکیان لەخۆیان دابوو. خەنجەر و دەمانچەیان کردبوو بەقەدیانا. هەروا خوێن لە ناوچەوانیان ئەباری. تووشی ئێمە بوون ئەیانوت: ئەمەیش رەنگە جاسووس بێ. ملۆزمەکانی منیش ئەیانوت: بەڵێ جاسووسە، منیش لە دڵی خۆما وتم نەخێر نەخۆشییەکەی کابرای خانچییەکە وتی منیش گرتم و رابورد. هەروا بەم رەنگە ئەڕۆیشتین دنیاش زۆر سارد و سەرما بوو. هەور و هەڵڵا بەباوە پڕوشەی ئەکرد. ئەلعەیاز و بیللا، سەیرم کرد لە کۆڵانێکدا گەیشتین بە ژنێك خۆی و دوو منداڵی رەش و رووتی پێخاوس سەرقۆتین لەو بەر سەرما و قوڕەدا بەگریان و شیوەن ئەکڕووزێنەوە و ئەپاڕێنەوە. ئەلاڵێنەوە و هەڵئەچۆقن. ژنەکە پەلی منداڵەکانی گرتبوو و هەرسێکیان ئەگریان وەك باڵاڵووك فرمێسك بەچاویانا ئەهاتە خوارەوە. کە چاوم بەوانە کەوت و ئەو ئەحواڵەم دی، بەجارێك خۆمم لەبیر چووەوە و وتم: ئاخۆ ئەم قوڕبەسەرانە چییان لێ قەومابێ؟ نەمزانی منیش حەپسم و ملۆزمم بەدواوەیە. بێ ئیختیار لە ژنەکەم پرسی خوشکەلێ ئەوە چیت لێ قەوماوە وا ئەگریت؟ هەر ئەوەندەم زانی لە پشتەوە کابراکان زرموهۆڕ دایانمە بەر شەپازللە و قۆناغە تفەنگ. وتیان تۆ دەخڵت چییە بەسەرەوە، هەرچی هەیە و نییە تۆ بۆچی ئەپرسیت؟ یەکێك لە زەلامەکان بە رق و گاڵتەوە وتی: ئەوە چییە. ئەوە مێردەکەی لەم بەینەدا لە شەڕی فلآنە جێگە عەسکەر بووە و کوژراوە. ئێستا ئەمانە کەسیان نەماوە و هیچیان نییە، شێت بوون داوای مەعاش و ئیدارە ئەکەن وا ئەزانن پارە رژاوە. لە دڵی خۆما وتم بەخوا باشە. مێرد و ماڵی بڕوا، بەم رەنگە داوای مەعاش بکا و تۆیش وا بەگاڵتەوە جوابم بدەیتەوە. هەڵبەت لەو جێگەیەش کە داوای مەعاشی کردووە، زۆر باش و بەدڵی خۆیشی بەڕێ خراوە، بۆیە وا بە پێکەنین و کەیف خۆشی گەڕاوەتەوە. زۆر زەریفە. بە هەناسەی ساردەوە نەختێکی تر رۆیشتین گەیشتینە

مەیدانێك لەوێ سەیرم کرد سێدارەیەك هەڵخراوە لە ژوور ئەویشەوە سێ چوار داری تر پێکەوە داچەقاوە و پیاوێکیان پێوە بەستووە. بەو سەرما و بەفر و بارانە چەند کەس دەوریان گرتووە. رووت و قووتیان کردۆتەوە، بەتۆیی کراس و دەرپێ، زەلامێکی بێ ئینساف بەدارێکەوە وەستاوە لەو قوڕبەسەرە ئەدات. ئەمما چۆن لێدانێك. زرموهۆڕی دارەکانی ئەمپەڕوپەڕی ئەو مەیدانە ئەگرێتەوە. کابراش هاوار ئەکا و ئەپاڕێتەوە و ئەلاڵێتەوە و خوا و پێغەمبەر ئەهێنێتە رجا، ئەزریکێنێ و ئەقیژێنێ و ئەویش هەر لێی ئەدا و گوێ ناداتێ. کە ئەوەم دی هەموو لەشم هاتە لەرزین و دڵم داخورپا. هێز و هەناوم لێ بڕا، وشك بووم لە جێگای خۆم. پێی رۆیشتم نەما، رەق راوەستام. یەکێك لە ملۆزمەکان تێی خوڕیم وتی ئەوە بۆچی راوەستاوی. وابزانم ئەمەت پێ خۆشە سەیری بکەیت. چاوت نەفرێ تۆیش بەخزمەتی ئەگەی. ئەمیش وەکو تۆ لەسەر جاسووسی گیراوە. وا داری تێ ئەبڕن. منیش هیچ هۆش و شعوورم نەمابوو کە جوابی بدەمەوە. لە عەزرەتانا هەروا وشك وەستابووم، ئاخری پەلیان راکێشام و رایان فڕاندم سەرەوژوور پێش خۆیان دام. ئیتر منیش نە دڵم مابوو نە چاو تا بزانم بۆ کوێ ئەچین. هەروا بەو کۆلانانەدا تێیان پەڕاندم، هەموو دار و بەرد بۆنی خوێنیان لێ ئەهات. بەجارێ رۆحم چوو. ئەوەندەم نەزانی گەیشتینە بەر دەرگایەکی گەورە. قەلەباڵغێکی زۆری لێ وەستابوو. هەر مەڕۆ مەڕۆ و نابێ نابێ بوو. کەسیان نەئەهێشت بچێتە ژوورەوە. ملۆزمەکانی لەمەڕ من وتیان ئەمە جاسووسە ئەمشەو نیوەشەو گرتوومانە و هێناومانە ئەبێ بیبەینە ژوورەوە. ئەوانیش وتیان جارێ نەختێ راوەستن. ئێستا ئیشی خسوسی و موهیم هەیە نابێ کەس بچێتە ژوورەوە، قەدەرێ راوەستن. هەر کەسێکی تریش ئەهات هەروا رایان ئەگرت. نزیکەی سەعاتێك ئێمەیان لەوبەر سەرما و بارانە راوەستاند. خەلقێکی زۆر لەوێدا گردبوونەوە. هەروا بەعزێك لەوانە کە ئەهاتن رایان ئەوەستاندن لچێکیان هەڵئەقوڵتاند و لەبەر خۆیانەوە ئەیانوت ئەها هەر ئەم جارە ئیشی موهیم و خسووسی نەبوو، دوایی سەیرم کرد یەکێك لە دوورەوە بەکەش و فشێکەوە دە دوانزە کەس بە شوێنیەوە تفەنگ بە دەست، فیشەکلغ لە پشت،

خەنجەر و دەمانچە بەقەد، سەرزل سەرزل، کابراکە خۆی دانەکانی هەموو ئاڵتوون بوو، وردە وردە هاتە پێشەوە. خەڵکەکە هەرچی دانیشتبوون بەجارێك راستەوە بوون. خۆتان لادەن، خۆتان لادەن پەیدا بوو. کە نزیك کەوتەوە منیشیان هەستاندە سەر پێیان وتیان راوەستە بەپێوە. منیش لەتاواندا بەلەرزەلەرز هەستام و راوەستام. کابراکە کە هاتە پێشەوە بەکبر و غرووریکەوە، بە چەناگە نیوە سەلامێکی کرد و زوو سەیرێکی منی کرد، وتی ئەمە چییە؟ مڵۆزمەکانم سنگیان نایە پێشەوە وتیان قوربان ئەمە جاسووسە، ئەمشەو گرتوومانە، وا هێناومانە. کابراکە ئەم جارە بە غەزەبەوە تێم مۆڕ بووەووە و پرسی: لە کوێوە هاتووە؟ یەکێك لە مڵۆزمەکان چووە پێشەوە بە سرپە دوو سێ قسەی لەگەڵ کرد. ئەویش سەرێکی بۆ لەقاند وتی: ئێ کەواتە بیهێننە ژوورەوە. ئەو تێ پەڕی چووە ژوورەوە. دوایی پەلی منیشیان گرت و رایان کێشام بۆ ژوورەوە. حەوشێکی گەورە و ئاوەدان. باخ و حەوز و باڵەخانەییێکی خۆش. هەروا بردمیان هەتا بەر بینا و باڵاخانەکە. لەوێ بە چەند پلیکانەیەك سەریان خستم. راڕەوێك بوو سیخناخ بوو لە تفەنگچی و زەلامی غەریب و عەجیب کە ئینسان هەر لە چاوپێکەوتنیان ئەتۆقی. قەدەرێك لەوی رایان گرتم، لە پاشان مڵۆزمەکان دامیانە دەست دوو سێ نۆبەتچی و زەبەللاح خۆیان ملیان شکاند و رۆیشتن. منیش لە قوژبنێکەوە هەڵتوتام بۆ خۆم سەرم کز گرت لەبەر باری خوادا چاوەڕوانی قەزا و قەدەر بووم. وتم بزانم چی تریش ئەبینم. ئەو رۆژە بەو رەنگەوە لەو سووچەدا بۆخۆم هەڵتروشکام. نە نانێك نە ئاوێك. نە لێپرسینەوە، هیچ نەبوو... ئەم زەلام بەو زەلامی ئەسپاردم. لە سەد کەس زیاتر هاتوون پرسیویانە ئەمە چییە؟ وتویانە جاسووسە و بەعزێکیان بە غەزەبەوە لێم مۆڕ ئەبوونەوە و لێم ئەهاتنە پێشەوە. ئەموت ئێستا هەڵم ئەلووشن و بەعزێکیشیان بەنیوە پێکەینەوە لێم ورد ئەبوونەوە و بە تەئسیرەوە روویان وەرئەگێڕا.

وەرە سێ چوار رۆژ بەم سەرما سەهەندەیە بەهیلاکی بەرێگەوە وەرە. شەو بەو رەنگە بەبرسێتی و بێ خەوی رابوێرە. بەیانی بەو حاڵەوە بتهێنن بۆ ئەو جێگایە هەر

سەعاتی مردنێك ببینە. ئەو رۆژەش وا بیَ زاد و ئاو داتنێن. ئینجا سەیری رەنگوڕووم بکەن، ئەبیَ چیم لیَ هاتبیَ. چاکە لە برسانا هەر وا گیانە گوێینەیەکم تیا مابوو کە ئەجوولامەوە هەموو لەشم ئەلەرزی. وەختی پاش نانخواردن کە شەوی بەسەراهات یەکێك لەو خزمەتکارانە وتی: خۆمەئەمە گاورسانی نییە ئەم فەقیرە لە بەیانییەوە بیَ نان و بیَ ئاو لێرە حەپس کراوە. خوا هەڵناگریَ هەر لە خۆیەوە لەو پاشماوانە چەند پارچە نانێکی دامیَ و کاسەیەك ئاویشی لەولاوە دانام. وتی: ئەوە بخۆ. منیش وەکو هار پەلامارم دایە. نانەکەم خوارد و چەند قومێك ئاوم کرد بەسەرا. تۆزێك زیندوو بوومەوە، هۆشێکم هاتەوە بەبەرا. ئیتر کەسێك لە منی نەپرسییەوە. هەر ئەموت ئاخۆ کەی منیان بیر بکەوێتەوە و نەجاتم بدەن. بەرەڵلام بکەن و بۆ خۆم بچمە دەرەوە. لە دڵی خۆما وتم شەرتم ئەمە بیَ، سەعاتێك لە دەست ئەم دەعبایانە نەجاتم بێت ئەو رێگەیەی کە بیگرمە بەر ئیتر ئاوڕ نادەمەوە و سەری خۆم لەو وڵاتە خوێناوییە زاڵمە دەرکەم و دەقیقەیەك لەو وڵاتە کاولەدا نەمێنم، بەڵام جاریَ خۆ هیچ لێپرسینەوە نییە. لە پاش قەدەریَ روانیم یەکێك بە عەزەمەت و جەبەرووتێکەوە هاتە ڕاڕەوەکە. خەڵکەکە هەموو هەستان و راوەستان و ئیشارەتی منیشیان کرد. منیش بە نیخەنیخ هەڵسام و بەپێوە راوەستام. سەیرم کرد هەروا هات و وردە وردە بەناو خەڵقەکەدا بەپشم و غەزەبێکەوە بەخەڵکەکەدا هەڵڕوانی. ئەم جار چاوی بە من کەوت. وتی: ئەمە چییە. ئەم دەعبایە کێیە؟ وتیان: قوربان ئەمە جاسووسەکەیە کە بەیانی هێناویانە. وتی: ئەی بۆچی بە منیان نەوتووە؟ ئا فلانەکەس بانگ کەن. کابرای کە سەرلەبەیانی لە دەرگای حەوشە هات و منی لەگەڵ خۆی هێنایە ژوورەوە بانگ کرا. ئەویش بە راکردن هاتە پێشەوە. وتی: چی ئەفەرمووی قوربان؟ وتی: ئەم جاسووسە چییە و لە بەیانییەوە هێناوتانە بۆچی بە منتان نەوتووە. وتی: قوربان سەر لە بەیانی عەرزم کردی مەشغوڵ بوویت فەرمووت جاریَ راوەستە. وەختی پاش قاوەڵتی ئەوە بوو دیسانەوە عەرزم کردیتەوە فەرمووت ئێستا نا. عەسریش کە عەرزم کردیت کەچی تووڕە بوویت. ئێوارە هاتم عەرزت بکەمەوە، میوانت هات. ئێستاش خەریك بوو

بێمەوە عەرزت بکەمەوە، ئەمە زۆر موهیمە وەکو ئەوانی تر نییە. ئەویش چاوی چووقاند و دەستێکی برد نای بە ناوچەوانییەوە. قەدەرێکی چاك راما. منیش هەروا بە ترس و لەرزەوە تەماشای ئەکەم و ئەڵێم رەنگە ئێستا بیر لە ئەحواڵی بێدەسەڵاتی و بێگوناحیی من بکاتەوە و بەزەیی پێما بێتەوە و هەر ئێستا ئەمر بکات بەرەڵڵام بکەن و رەنگە دڵنەواییشم بکەن بەخوا. کەچی هەر ئەوەندەم زانی سەری بەرز کردەوە و هەردوو چاوی دەرپەڕی. وتی: راست ئەکەن بە قەبری باوکم ئەمە زۆر دەهشەتە. ئادەی بیکەنە ئەو ژوورەوە زۆر چاك ئاگاتان لێ بێ هەتا بانگی ئەکەم و لێی ئەپرسمەوە. ئەرێ گەڕان، ئەمە هیچ قاقەز و ماقەزی پێ نەبوو؟ کابرا وتی: نەخێر قاقەزیان پێ نەدیوە. هەڵبەت شاردوویەتییەوە. لە تەحقیقاتدا ئەمانە دەرئەکەون. ئەویش وتی: وایە راستە. دەبیبەن بۆ ئەو ژوورە. منیش لە جێی خۆم هەروا وشك بووم. زوبانم بەسترا. حەپەسام. ئەوەندەم زانی دوو زرتەبۆز نەوینە پەلم و بردمیانە ژوورێکی گەورە و تاریك لەوێ دایاننام و دەرگای ژوورەکەیان لەسەر داخستم و بە تەنها بەجێیان هێشتم.

## چیم بینی لەو ژوورەدا؟

لە پاش بەینێك منیش هۆشێکم هاتەوە بە خۆما، سەیرێکی ژوورەکەم کرد و وتم بزانم ئەو ژوورە چ ژوورێکە. ئەمە ئاخۆ زیندانە، حەپسخانەیە، چییە؟ رێی راکردن و سەردەرکردنی هەیە یان نا؟ چونکە لە دڵی خۆما وتم من وا تووشی ئەم دەعبا بێ ئینسافانە بووم هەتا مومکن بێ چارەسەرێکی خۆم بکەم و خۆم دەرکەم و نەجاتم ببێ. لای خۆی بۆ ریش هاتم کەچی سمێڵیشم نایە بان. روانیم لەلای راستی ژوورەکە بە بەرزەوە دوو سێ پەنجەرەی بچووك هەیە. شەوق و رووناکیی چرای لێوە دیارە، بەڵام چونکە پەنجەرەکان لە بەرزی بوون، چاوم لە هیچ نەبوو. لەو دیوەوە دەنگە دەنگێکی زۆری لێ ئەهات. دەنگی ژن بوو ئەهات. هەریەکە لە ئاوازێك لێ ئەدا و قسە ئەکات. بە تەواوی گوێم لە هەموو قسەکان بوو، لای چەپی ژوورەکەیش دوو پەنجەرەی گەورە

هەبوو، ئەودیوی هەموو فەنەفە و کورسیی جوانی لیّ دانرابوو. ژوورەکە رازابووەوە. ژوورێکی رێکوپێك بەڵام چۆلوهۆڵ کەسی لیّ نەبوو، چرایشی لیّ ئەسووتا، منیش قەدەرێك رامام. وتم: یارەبی چی بکەم من چیم کرد بە خۆم، ئەمانە چین ئەیانبینم؟ من لە کویّ و ئەمانە لە کویّ؟ ئاخۆ ئیّستا ماڵ و منداڵم لە چیبیا بن و بەتەمای چیی من بن؟ من لەبەرچی وەکو شیّت ماڵ و منداڵی خۆم بیّکەس و بیّدەر، بیّ ئیدارە و گوزەران بەجیّ هیّشت و هاتمە ناو ئەم ئاگربارانە، زۆر دڵم بەحاڵی خۆم و ماڵ و منداڵەکەم سووتا. چەند فرمیّسکیّکی گەرم بە چاوما هاتە خوارەوە و هەناسەیەکی ساردم هەڵکیّشا. وتم: یارەبی تۆ قادر و خەبیری کەیفی خۆتە شوکرم بەبەشت، تۆ خۆت نەجاتدەری نەجاتم بدەی لەم موسیبەت و بەلاّ ناحەقە. ئەمە چ جیّگا و لایەکە، ئەمە چ نەوعە مەخلوقیّکن لیّرەدا، ئەمانە چ دڵ و دەروونیّکیان هەیە، من چۆن رزگار ببم لە دەست ئەم زالمە بیّ ئینسافانە، هەروا قەدەرێك لەم خەیالاّتانەدا بووم دوایی وتم فائیدەی نییە، بزانم دوایی ئەم کارە بەچی ئەگات، جاریّ با بزانم ئەم ژوورەی کە دەنگی ئەم ئافرەتانەی لیّ دیّت چییە و لە قسە و گفتوگۆی ئەوان ریّگەی نەجات ئەدۆزمەوە بۆخۆم یان نا. هەستام وردە وردە چوومە بەر پەنجەرەکان کە بەسەر ژووری ژنەکاندا بوو. لەویّ راوەستام گویّم راگرت. بە تەواوی گویّم لە هەموو قسە و ئەمبەر و ئەوبەریان بوو، بەڵام چاوم لە هیچ نەبوو. گویّم دایە قسەکان. غەیری باسی ئاڵتوون و مجەوهەرات و جلی جوان و ئەم نەوعە قسانە نەبیّ جاریّ هیچی ترم بە گویّ نەکەوت. دەنگیّ ئەهات ئەیوت: قوربان ژنی فلاّنە کەس جووتیّ گوارەی زۆر عەنتیکەی هەیە، ئەو ساڵە میّردەکەی لە ئەستەمبوڵەوە بۆی هیّناوە. سیّ ریز ئەڵماسی تیا قایم کراوە. دەڵیّن لەویّ بە سەد و پەنجا لیرەی کڕیوە ، بەڵام قیمەتی هەر تەواو نابیّ، بەخوا ئەوە هەر بۆ تۆ جوانە. تۆ لیّی بسیّنە بۆ خۆت. ئەویش ئەیوت: سبەینیّ زوو ئەنیّرمە سەری خۆشی بیّ و ترشی بیّ لیّی ئەسیّنم. ئەو شتی وای بۆ چییە. با بەبیّ پارە ئەوە بدا بەمن. لە پاش ئەو دەنگی پیرەژنیّك هات لەولاوە وتی: بەقوربان فلاّنە ژن ئەموستیلەیەکی زمڕووتی هەیە من خۆم بە شەو دیومە وەك چرا ئەدرەوشیّتەوە. دڵی

نایەت بۆخۆی بیکاتە دەستی، چەند جار (٣٠) لیرەیان داوەتێ نایدا. مێردەکەی ئەو ساڵە لە شام کڕیویەتی بە چل لیرە بۆی. بەخوا ئەوە هەر بۆ دەست و پەنجەی تۆ جوانە. ئەویش وتی: بەخوا راست ئەکەی من زۆر حەز لە ئەموستیلەیەکی وا ئەکەم. بەیانی بخەرەوە بیرم بنێرمە سەری بیهێنن. یەکێکیش وتی: بەخوا رەنگە دڵی نەیە بیدات. زۆری خۆش ئەوێ. ئەویش وتی: چۆنی نادا، بەخوا ئەگەر نەیدا مێردەکەی حەپس ئەکەم و ماڵەکەشی تالآن ئەکەم. ئەو پەڕۆ بەسەرانە شتی وایان بۆ چییە.

گوێم گرت و ژنێکی تر لەولاوە وتی: بەخوا قوربان من بیستوومە ماڵی فلآنە کەس پیرۆزەیەکیان هەیە، ساڵێ لە کەربەلا کڕیویانە بەهەشتا لیرە، هینی شای عەجەم بووە، لەوێ بەخشیویەتی دەست ئەوان کەوتووە. ئەوە بۆ تۆ جوان و باشە. ئەڵێن پیرۆزە بۆ رووناکیی چاو و هێزی دڵ چاکە. ئەویش وتی: بەخوا راست ئەکەیت خۆ ئەوان هەر خزمەتکاری خۆمان بوون. سبحەینێ زوو تۆ بچۆ ئەو پیرۆزەیەم بۆ بهێنە. ئەویش وتی: چاکە قوربان. دوای ئەوانە گوێم گرت یەکێك هاتە پێشەوە وتی: قوربان فلآنە کەس تۆپێ تاقەی یەمەنی و دوو چەفتەی سورمەی زۆر چاکی هێناوەتە خزمەتت، ئەڵێ ئێمە خۆی ئەزانێ هەر خزمەتکاری ئەم قاپییە بووین. کوڕەکەم هەتا ئێستا هەر تووتنچی بووە. جگەرەی فرۆشتووە و ئێستا هیچ دەرامەتی نییە و زۆر کەمدەستە خۆی خستۆتە ئەم قاپییە کە ئەمر بکەیت کوڕەکەی بکەن بە زابت. وتی: ئا تاقە و چەفتەکان بێنن بیانبینم. بەخشوهۆڕ هێنایانە پێشەوە. وابزانم بەر دڵی کەوت، وتی: هەڵی گرن. ئەیەڕۆ. جا ئەمەیشی پێ نەئەویست خۆ ئەوان هەر باوکیشیان خزمەتکاری خۆمان بوون. ئا فلآنە کەس بچۆ بە فیسارە کەس بڵێ ئەبێ سبحەینێ ئەم کوڕە بە زابت قەید بکات. بە قەبری باوکم نەیکات دڵم عاجز ئەبێت. شڵپ دەستی ماچ کرد و قەدەرێ دوعای بۆ کرد و رۆیشت. لە پاشان گوێم گرت. یەکێکی تر هات (ئەمە دەنگی پیاو بوو). وتی: قوربان کوێخا فلآن هەمووومان ئەزانین رەچەڵەکیان هەموو لەم قاپییەدا بڕاوەتەوە. باو و باپیریان هەموو خزمەتکاری ئەم قاپیە بوون، کەچی ئێستا بە قسەی بەدخوا بۆیان لێ داوە و حەپسیان کردووە.

خەریکن بیفەوتێنن، ئەمەش رەوای حەق نییە بوختای پێ ئەکەن. مەگەر خوا بیزانێت چەند خزمەتی هەیە من ئەیزانم بۆ ئێوە چەند جار خوێنی ناوەتە کاسە و فلانە جێگە و فلانمە جێگە. ئەو ساڵە خۆی بە کوشت دا و خوا نەیکوشت و چەند کەسی کوشت. بە هێواشێکیشەوە وتی: بارێك برنج و هیزەیەك رۆن و پێستەیەك پەنیریشی هێناوە بۆ مەتبەخ و دە پێنج لیرەیشی هێناوەتە خزمەت خۆت. خانم ئەمەی بیست وتی: چۆن حەپس کراوە و کێ حەپسی کردووە و بۆچی حەپس کراوە؟ ئەوە هەر هی خۆمان بووە، بە قەبری باوکم قەبوولی ناکەم، ئا فلانە کەس بچۆ بڵێ هەر ئێستا ئەبێ کوێخا فلان بەرەڵڵا بکرێ. هەر ئەمشەو ئەبێت بێتە دەرەوە (لە دڵی خۆما وتم خۆزگەم بەخۆی). شڵپ دەستی ماچ کرایەوە، ئەویش بڕایەوە.

دواجار گوێم گرت پیرەژنێکی تر هاتە پێشەوە بە منجەمنجەوە وتی: قوربان فلانە کەس هاتۆتە خزمەتت. مێردەکەی لە بەغدا هاتووەتەوە. بەشی دوو کەوا گوروونی گوڵباتمانی هێناوە. ئەوا بەم عومرە گەیشتووم شتی وام نەدیوە و نەبیستووە. هەروا پڕشنگی لێ ئەبێتەوە. ئاوی چاوی پیاو ئەبات. بەخوا ئەوە هەر بۆ کەوای خۆت لائیقە. تۆپێ کەتانی رێزە و تۆپێ برنجۆکی چاکیشی هێناوە. ئەیەڕۆ تۆ چۆن قەبووڵ ئەکەیت، فلانەکەس، ها، لەبیرت نایەت ساڵی حریت حریتەکە وتیان چەندێ قسەی خراپی کردبوو، بەخوا قوربان راستە بێ ئەدەبیشە، بەڵام ئێوە هەر نازانن ئیش بکەن. ئێستا ئەوەتا کراوە بە مودیری فلانە دائیرە. ئەمیش هەروا بێ مەئموورییەت ئەسووڕێتەوە. ئەویش وتی: بە قەبری باوکم بەو قورعانەی لە سەر رانی راستم دام ناوە ئاگایشم لێ نییە و نەمزانیوە. ئەگینا من چۆن قەبووڵم ئەکرد. ئەی ئەوە نەئەبوو زوو پێم بڵێن. ئا بچن بە فلان بڵێن... عەزل ئەکرێ و مێردەکەی ئەم لە جێگای ئەو ئەبێ دانرێ. شڵپە دەست ماچکردنێکی تر هات. تێ وردبوومەوە لەم نوعە ئیشانە و گەلێك ئیشی تری لەمانە زلتر. هەمووی لەو سەعاتەدا لەو ژوورە بەو رەنگە بڕایەوە. منیش لە دڵی خۆما وتم ئیشی ئێرە وا دیارە هەمووی عیبارەتە لە خەڵك رووتاندنەوە و شتی باش و بە قیمەتی ئەم و ئەو زەوتکردن و بە بەرتیل هەتیو و مەتیو لە سەر ئیشی زل و گەورە دانان و

ماڵی تاقمێك بە قوڕگرتن و هەموو عالەم باو و باپیریان خزمەتکاری ئەو قاپییە بـوون. لەبەر خۆمەوە وتم من نە خۆم و نە باوکم وا دیارە خزمـەتکاری ئـەم قاپییـە نـەبووین و تۆپە تاقە و پارچە ئەڵماس و یاقووتیشم نییە بیدەم. کەوابوو لەم ژوورە ڕێگـای نـەجات بـۆ خـۆم نادۆزمـەوە. ئـەم ژوورە مەحکەمـەی لاهـای بـوو. مەجلیسـی لـۆزان و عەسبەتولئومەم بوو، چی بوو. لە زەرفی سەعاتێکدا سەد نەوع ئیشـی تیـا حـەل بـوو و بڕایەوە. هەموویشی کوتوپڕ جێبەجێ بوون. نانی چەند کەس بڕا و خوێنی چەند مەزڵووم ون بوو و چەند کەس دامەزرا. حەق و ماڵی چەند کەس زەوت کرا. دووا جار وتم با بچم بەلای ئەم لاوە بزانم لـەم لایـەوە چـی ئـەبینم و لـەم ڕووناکییـەوە ڕێـی نـەجات هـیچ ئەدۆزمەوە یان نە؟ پەنجەرەکانی ئەملا زۆر نزم بوون. هـەموو شـتێکم ئـەبینی، ڕوانـیم گەورەکە کە ئەمری کرد منیان خستە ئەو ژوورە خۆی بە کەش و فشێکەوە دانیشتووە و فڵقوهۆڕ نێرگەلە ئەکێشێت. کابرای تریش کە سەر لە بەیانی لەگـەڵ مڵۆزمـەکان مـنی هێنایە ژوورەوە، ئەویش لە خوارەوە وەستابوو. هەرچی حەرەکات و وەزعیەتی گەورەکـە هەیە هەمووی هەر غەزەبە و ئەنانییەتـە. هەرچـی حـەرەکات و سـەکەناتی ئەویشـیان هەیە، هەمووی هەر تەسلیم و ئیتاعەتێکی پڕ لە قوماربازی و درۆ و ڕیاییـە. یـەکێکی تریش لە پەنا دەرگاکە ڕاوەستابوو، فشەی ئەهات، دەستێکی خستبووە سـەر مشـتووی خەنجەرەکەی، هەموو لەشی ئەجولایەوە. هەروا خوێن لە هەموو ئازای ئەباری. بێـدەنگ و بێسەنگ کەس قسەی نەئەکرد هەموو قوڕوقەپیان کردبوو. لە پاش نـەختێ گەورەکـە سەری بەرز کردەوە رووی کردە کابرای دان ئاڵتوون وتی: تۆ نابێ قەت قسەیەکی ڕاسـتت ببێ. ئاخرییەکەی تۆ سـەری مـن بـە فەتـەرات ئـەدەیت. ئـاخر ئـەو هـەموو هـاژە و هووشەیەی تۆ کردت نەتیجەی کوانێ. تۆ کە هاتیتەوە وتت چـی. کەچـی ئێسـتا دنیـا چۆنە، ئەوانەی تۆ هەڵت ڕشتن هەموو درۆ و فیشاڵ بـوون. بـەخوا تـۆ هـەر بـۆ کوشـتن چاکی. ئەویش وتی: قوربان بە چیت باوەڕە. ئەوانەی عەرزم کردیت، هەموو ڕاست بـوون و هیچیان درۆ نەبوون. بەڵام من بڵـێم چـی مەسـئەلەی مەشـهوورە ئـەڵێ (دار پـوازی لەخۆی نەبێ ناقڵێشێ). لە پاش من هەر لە قەومەکانی خۆمان چـوون ئیشـەکەیان لـێ

تێك داین. ئەگینا ئێستا ئیش لە جێگایەکی تر نەبوو. کولۆبنەکەی کە لای خواروو وەستابوو، ئەویش هەڵی دایە وتی: بەخوا بە قوربان راست ئەکات، قسە هەر ئەمەیە. ئیتر ئەویش بەبێ وردبوونەوە و لێکدانەوە کوتوپڕ وتی: بەخوا راستە و دەستی کرد بە قسەی ناشیرین و جنێوی خراپ بەوانە. دەستێکی دا بە دەستا وتی: ئاخ من چی بکەم، ئەترسم هەر نەگەم بەو رۆژە. ئەمانە وجوودیان لە ناودا هەڵگیرێ. کولۆبنەی لای خواروو دیسانەوە هەڵی دایە وتی: قوربان هێشتا لەناو خۆماندا هەزار کەسی خراپمان تێدایە. هەر خەریکی ئیش تێکدان و جاسووسین. بەخوا ئەمانە دەفع بکرێن و لەناو هەڵگیرێن چاکە. گەورە لەم قسانە رقی هەستا و چاوی لێ دەرپەڕی و مارپێچی نێرگەلەکەی فڕێ دا و هەستایە سەر پێیان وتی: هەرچی ئیش لە من تێك بدا و سەرم لێ بشێوێنێ نابێ بمێنێ. کوانێ مەلاکان نەهاتن. ئەوانیش وتیان: قوربان نیوسەعات زیاترە چوون بەشوێنیاندا. هەر ئێستا دێن. ئاغا و ئەوان هاتوون ئەوەتان لەولا دانیشتوون. وتی: باشە با مەلاکانیش بێن (وەکو لە پێشەوە تەرتیباتێکیان کردبێ و خەریکی ئیشێك بن کە بە مەلاکانی هەڵسوورێنن وا بوو) ئەویش لە جێگەی خۆی دانیشتەوە. نەختێکی پێ چوو. سەری هەڵبڕی رووی کردە کابرای کولۆبنە وتی: لیرەکانت گۆڕیوەتەوە. وتی: بەڵێ قوربان بەڵام نرخی لیرە تۆزێك زیادی کردووە. ئەم حەفتەیە ئێمە چوار پێنج هەزارمان زیاتر گۆڕێوەتەوە لەبەر ئەوە لە ناو بازاڕ زیادی کردووە. ئەگەر چەند رۆژێکی تر سەبر بکەین، بەڵکو ئەوسا ئەوەندەی تریش بگۆڕینەوە. هەروا بەرەبەرە هەتا تەواو ئەبێ، کابرای تریش وتی: قوربان بەعزێك بانقەنۆتی هەزار روپیەیی و سەد روپیەییش ئەگەر بگۆڕێتەوە ئەوانیش سووك و رەحەتن، خراپ نین. ئەویش وتی: باشە. بەڵام جارێ هەر لیرەکان بگۆڕینەوە باشترە. ئەوانیش وتیان: لیرە لەم یەك دوو مانگەدا گەلێك زیادی کردووە. چونکە ئێمە لەم بەینەدا زۆرمان گۆڕیوەتەوە. ئەم خەبەرە ئەڕوات بەملا و ئەولادا. هەتا هەشت نۆ رۆژی تر رەنگە لیرەیەکی زۆر بێت بۆ ئێرە. ئەوسا ئێمەش دە پانزە بیست هەزارێکی تریش ئەگۆڕینەوە. ئەویش وتی: من ئەمانە نازانم. ئەم مانگە هەتا ئەچێتە سەر ئەبێ سەد هەزار لیرەی ترم بۆ بگۆڕنەوە و بۆم تەواو بکەن.

ئەوانیش هەردووکیان وتیان: تۆ خـۆش بیـت ئینشـاڵڵا تـەواو ئـەبێ. منـیش لـەم وەختەدا لە دڵی خۆما وتم ناکات لەم هەموو پارەیە کە گشتی هـینی موسـوڵمانانە دەست بەرێ هەزار لیرە بدا بە من بڵێ بڕۆرەوە ناو ماڵ و منداڵی خۆت و دانیشە بە رەحەتی بیخۆن. ئەمجا رووی کردە کابرا وتی: قسەی خۆمان بێ ئێسـتا تـۆ و فلانـە کەس، یەکی دە هەزار لیرەیەکتان ناوەتە سەر یەك. ئـەویش بـە پێکەنینـەوە وتـی: قوربان سەری تۆ خۆش بێت، هەموو دنیا هینی ئێمەیە. وتی: نـە ... ئـەم قسـانە هیچن، ئێستا ئەویش خۆی دێتە ئێرە. لێی بپرسە بزانە من راست ئەکەم یـان نـە؟ مەگەر هەر من ئێوە بناسم. هەروا لەم نەوعـە قسـانە بـەعزێك گفتوگۆیـان کـرد. دواجار کابراکە وتی: قوربان تەقاویتەکان هەراسیان بە عالەم هەڵگرتووە بۆ مەعاش نازانم ئەمرتان بەچییە. ئەویش توورە بوو وتی: مەعاش لە کوێ بێنم بـۆ تـەقاویتی موبارەك. وا عەسکەر و مەئموورەکان دوو مانگە مەعاشیان وەرنەگرتووە. ئـەویش وتی: قوربان زۆریان هەیە شەش مانگە پوولێکیان وەرنەگرتووە. ئەمانـەش هـەموو ڤیرسیچمە و نەبەز و سەهەندەن. لە هەر قوژبنێکەوە رێگایـان بـوو، داوا ئەکـەن و هاوار ئەکەن. سەریان لەم عالەمە سەندووە. لە هەموو ماڵان و کـۆڵان کـە یـەکێك ئـەبینن دەسـت دەکـەن بـە تـەعجیزات. ئـەویش وتـی: ئەمانـە چەقاوەسـوون و چەرداوەڕوون، کەواتە خۆ پارە نادرێ بەوانە. ئەم مانگە هەروا یەکی چەند حوقەیەك چەڵتووکیان بدەنێ لە جیاتی مەعاش با بیخۆن یاخوا هەر ئەوە بخۆن. ئەمانە بۆچی چاکن مەعاشیان بدرێتێ؟ ئەویش وتی: قوربان باشە.

ئەمجا یەکێك هاتە ژوورەوە وتی: قوربان مەلاکان تەشریفیان هێناوە. فەرمووی: بەخێر بێن با بێنە ژوورەوە. روانیم چوار مەلای نوورانی یەك لە دوای یەك هاتنە ژوورەوە. هەموو جبەی قۆڵفش لەبەردا، چاویان رشتووە. مێزەرەکانیان هەموو سپی وەکو چۆڕی شیر، هاتن سەلامیان بە ئەدەبەوە کرد و دانیشتن. هەموو لێویان ئەجووڵایەوە. لام وایە ویرد و سەڵاواتیان ئەخوێند. لە پێش ئەوان سێ چوار کەسی تر هاتن. یەکێکیان پیاوێکی گەورە دیار بوو. هات چووە لای ژوورەوە دانیشت.

ئەوانی تریش لە خوارەوە دانیشتن. دوو سێ کەسی تریش بە پێیانەوە وەستابوون. منیش نەختێك دڵم خۆش بوو وتم ئێستا ئەم پیاوە کە ئەم مەلایانە و ئەم زاتانەی کۆ کردۆتەوە ئومێد وایە شتی باش بکات. هەڵبەت هەموو ئیشێك بەمشاوەرەی عولەما و پیاوی زانست و باش و تێگەیشتوو ئەکات. خۆ هیچ نەبێ ئەمانە مەیدانی زوڵم و ناحەقی و زۆر نادەن. ئینشاڵڵا لەم ناوەدا ئیشی منیش دێتە ناوەوە و منیش نەجاتم ئەبێ. بەم ئومێد و ئەمەلە دڵم خۆش بوو. هەموو لەشم کرد بە گوێچکە، وتم: ئەبێ هەموو قسەکانیان ببیەم. هەناسەم لەخۆم بڕی، وشك وەستام وتم بزانم خوا چی ئەکات. ئەمە من جارێ هەر بۆ شتێك ئەگەڕێم بەڵکو ڕێگای نەجاتێك بۆخۆم بدۆزمەوە و لەم تاریکییەدا ڕووناکییەك ببینمەوە. هەتا ئەهات ئومێدم زلتر ئەبوو. ئەموت: خۆ من هیچم لە سەر نییە، سووچ و گوناهێکم نییە. هەڵبەت خوا ڕەحم ئەنێتە دڵیەوە. ئەم کابرایە بەخوت و خۆڕایی من تووشی هیچ ناکات. ئەمجارە گەورەکە ڕووی کردە یەکێك لە ڕاوەستاوەکان وتی: قسەی مەحرەم و خسووسی هەیە وریا بن کەس لەم دەورە نەبێ. قسەکانمان لە ناو خۆماندا نەچێتە دەرەوە. ئەویش چووە دەرەوە و لە پاش نەختێك هاتەوە وتی: قوربان کەسی لێ نییە. خۆ ئاگاشیان لێ نەبوو کە لە ژووری ژنەکانەوە قسەیان ئەکرد ئەیانوت ئەمشەو مەلاکان و فلان و فیسار گرد کراونەتەوە ئیشیان هەیە. لەوێوە دوو سێ ژنی دەستوپێوەند تەگبیریان کرد کە لە پشتەوە بچن گوێ لە قسەکان بگرن. لەو وەختەدا گوێم لە ترپوهۆڕی پێیان بوو. لەودیو هۆدەکەوە کە منی تێدا بووم، سێ چوارێك چوون و لەوێ وەستان و گوێیان لە قسەو باس گرت.

## گفتوگۆکردن و فتوا وەگرتن، ئەمر بەئیجراکردن، مەسئەلەی سیاسییە

لە پاشان گەورەکە دەمی هەڵهێنایەوە و نەختێك بە تووڕەییەوە دەستی بە قسەکردن کرد وتی: من ئەمە چەندساڵە هەوڵ و تەقەلا ئەدەم، برینداری و حەپسی و ڕەزالەتم کێشا، ئەنواعی موسیبەت و مەرارەتم چێشت. دەستم لە سەر و ماڵی

خۆم شت، هاتم تێکۆشام وتم بەڵکو ئەم میللەتە بۆخۆی هەناسەیەکی رەحەتی هەڵکێشێت سەربەست و ئازایانە بۆخۆمان بژین و دەستی بێگانەمان بە سەرەوە نەبێ، ئێمەیش وەکو ئەم میللەتانەی تر بکەوینە رەحەتی و خۆشی و زیادی و گەورەیی، دەوڵەمەند و سەربەرز بین. دینەکەمان بەرز بێتەوە. چەند جار چووم بەگژ ئینگلیزدا، لەگەڵ تورکیا تێك چووم، تەشەبوسم بە روسیە و بولشەویك کرد، چەند خوێنمان رشت. من ئەمانەم هیچیان بۆ خۆم نەکردووە، هەموویانم بۆ ئەم دین و میللەتە کردووە. وتوومە با میللەتەکە بکەوێتە رەحەتی و سوعادەتەوە. دینەکەمان زیاد بکات و بەرز بێتەوە، کەچی لەگەڵ ئەم هەموو ئەحواڵانەدا ئەوەتا هەمووەمان ئەیبینین بەشێکی زۆر لەم میللەتە لایان داوە لە من و چوون شوێن غەیرەدین کەوتوون. رۆیشتوون بۆ وڵاتان خزمەتی فکری ئەوان ئەکەن. هەموو ماڵ و حاڵ و ژنیان بەجێ هێشتووە لێرە و خۆیان لە وڵاتان بەدیار غەیرەدینەوە دانیشتوون و ئێمە واین لەم حاڵ و رەزاڵەتەدا. عەسکەر و مەئموور و عولەماکانمان هەموو ئیحتیاج و بێ ئیدارە ماونەتەوە. ئاخۆ فتوای شەرعی بۆ ئەمانە چۆنە؟ رووی کردە مەلاکان وتی: ئەی عولەمای میللەت بزانم ئێوە دەرحەق بەمانە، بەم زاڵم و بێ دین ومورتەدانە(!) قسەتان چییە و ئەڵێن چی؟ ئاخۆ ماڵ و حاڵ و ژنی ئەمانە چییان دەرحەق بکرێت باشە؟ مەلاکان هەر چواریان رەنگێکیان هێنا و برد و سەیرێکی یەکتریان کرد. لە دواییدا یەکێکیان نەختێك بە پەلە قسەی ئەکرد و دانیشی نەمابوو. چمکی مێزەرە سپییەکەی شۆڕ بووبووەوە خوارەوە هەتا لای پشتێنەکەی، عەسایەکی باسقەندی بە دەستەوە بوو. سیواکێکی درێژی کردبوو بە پشتێنەکەیدا، جار جار تۆزێك بڕنووتی هەڵئەمژی، لکی فەقیانە سپییەکەی لە قۆڵی جبەکەیەوە هاتبووە دەرەوە، هەر عەجەلە و پەلەی ئەکرد بۆ قسەکردن، لە پڕێکدا تێی هەڵکرد و وتی: بەڵێ ئەم نەوعە شەخسانە کەوا خزمەتی دینی خۆیان ناکەن و بۆ دین و ئاین هەوڵ نادەن و شوێن غەیرە دین ئەکەون و لە پێناوی دین و ئەحکامی شەریعەتی غەڕادا سەعی ناکەن و خزمەتی غەیرەدین ئەکەن بە موافق

قەولی ئیمام... و ئیمام... و ئیمام... کێ (ئیتر نازانم ناوی دە دەوانزەیەك لەم ئیمامانەی هەڵڕشت. هەر ناوی موجتەهید و ئیمام بوو وەك برێشکەی گەنمەشامی لە دەمی هەڵئەتۆقی) ئەمانە بەنەزەر مورتەد و بێ دین تەماشایان ئەکرێ، لازمە ماڵیان هەموو بۆ بەیتولمال سەرف بکرێ، ژنیشیان لێ تەفریق بکرێ و ئەمانە لە پاش مرووری عیدەی شەرعی ئەتوانن شوویەکی تر بۆ خۆیان بکەن. یەکێکی تر لە مەلاکان وا بزانم زمانی وەکو نەختێك لاڵ بێ وابوو، چونکە هەر قسەیەکی ئەکرد، تفێکی قوت ئەدا و بە توورتوورە کەلیمەیەکی تری تەواو ئەکرد. لەگەڵ قسەکان خێرا خێرا دەست و پەلی ئەجوولاَیەوە، سەر و سنگی ئەهێنا و ئەبرد وتی: بەڵێ وەکو فلاَن ئەفەرموێت وایە. ئەمانە قەولێکی مەعرووف و موعتەبەر و موقتەدابهین. یەکێکی تری ملدرێژیان تێدا بوو، چاوشین، موو زەرد، وەکوو شینەشاهۆ ملی هەڵبڕی و سنگی دایە پێشەوە وتی: خۆ من بۆ ئەم مەسائلی شەرعییەیە دەمێکە خەریکم و هەوڵ ئەدەم، هەتا وەکو هەموو ئەم نەوعە مەسئەلانەم خستووەتە سەر کاغەز (دەستی کرد بە باخەڵیا کاغەزێکی نووسراوی درێژی هێنایە سەر مێزەکە) وتی: هەر ئەمەش نییە، زۆر شتی تری وا هەیە. ئەم ئیشانە وا چاکە سەعاتێك زووتر جێبەجێ بکرێ و بەربەستی ئەم ئەحوالاَنە بکرێت، ئەگینا ئەم دینە بەجارێك مەحو ئەبێتەوە، بەڵێ بە هەموو مەزهەبێك ماڵ و ژنی ئەمانە بۆ ئەم بەقیەتولمۆئمنینە حەلاَڵە و رەوایە. ئنجا رووی کردە سەرسپییەکەی لای سەرووی هەموویانەوە وتی: قوربان، تۆ چی ئەفەرموویت، ئەویش مەلایەکی ریش ماشوبرنج بە ویقارەوە لای سەرووی هەموویان کەوتبوو بەعەزمەت دانیشتبوو وەکو چاوی نەختێك کز بێت وا دیار بوو کە مەلای سوورە قاقزەکەی خستە سەر مێزەکە، ئەو گورجوگۆڵ هەڵی گرت و عەینەکێکی کردە چاوی سەیری کرد، ئەویش ئەم جارە کاغەزەکەی دانا و دەستی کرد بە گفتوگۆ (بە قسەکانیا وا دەرئەکەوت خەڵکی ئەو گەرمیانە بێت) وتی بەڵێ ئەم مەسئەلەیە زاهیرە بە هەموو مەزهەبێك ماڵ و سەروەتیان لێ جوێ ئەکرێتەوە و ئەم قەولانە هەموو موسەدەقن.

منیش لە ژوورەوە هەروا تاس ئەیبردمەوە، ئەموت ئەی هاوار بە مالْم، بەخوا من و هەزاری وەکو من بێتاوان و بێگوناح مەحو بووینەوە، من ئومێدی چیم هەبوو، کەچی چیم دی و چیم بیست، بەجارێك ئەژنۆم شکا و موچڕکێك لە تەپڵی سەرمەوە هات، لە بەری پێمەوە دەرچوو، هەروا حەپەسام، هۆش و شعوورم نەما، تەمام بوو بە هەردوو چەپۆك بدەم بە سەری خۆما هەتا هێزم تیایە بقیژێنم، دوواجار سەیرم کرد گەورەکە ئەم جاریش بە دەنگێکی بەرزەوە وتی: ئەمە باشە، مەسئەلەیەکی تریش هەیە ئەویشتان بۆ بکەمەوە، ئەوانیش چاویان لێ سوور بووبوو، فەرموو بزانین ئەو چۆنە...
وەکو پێم وتن ئێمە ئەمە هەمووی لە رێی دینی ئیسلامدا ئەکەین، ئێستا غەیری ئەوانەی کەوا رۆیشتوون و لەملاولا خزمەتی غەیرەدین ئەکەن، بەعزێك بۆ نەمانی ئێمە و ئەم حالْە (کە هەموو بۆ دینی ئەکەین) هەولْ ئەدەین جاسووسی بۆ غەیرە دینەکە ئەکەن و لە جیاتی تەلقینی ئەهالییەکە هەر خەریکی کفرکردن و گالْتە بە مەشایخ و عولەمای موحتەرەمن. ئەمانە ئەگەر هەروا بمێنن، ئەمینم ئەو تۆزە دینە کەوا ئێمە هەولْ بۆ زیادیی ئەدەین بەجارێك مەحوی ئەکەنەوە. ئێمەش و عولەمای میلەتەکەش (جاروبار بۆ قووەتی قسەکانی خۆی وەکو خوێی چێشت ناوی عولەماکانی تێ ئەخست) ئەفەوتێنن، ئەم نەوعە، ئەشخاسە موزیڕانە بەناوی دینەوە فەوتاندنیان لە ئێمە واجب و لازمە یان نا؟
سوورەی چاوشین لە پڕێکدا قسەکانی لەدەم قۆستەوە و تێ هەلْچوو وتی: ئاخر ئەوەی منیش عەرزم کردن و نووسیومە ئەم مەسئەلەیەیە، ئەگەر بێت و حالْ بەم رەنگە دەوام بکات ئەوا دین و دنیامان بەجارێ مەحو ئەبێتەوە، لە زووەوە بەرهەلْستیی ئەمە نەکرێت نابێ، بەهەموو مەزهەبێك نەهێشتنی ئەمانە بۆ دین و میللەت مەسلْەحەت و لازمە. هێشتا ئەو قسەکەی تەواو نەکردبوو مەلا بڕنووتی کێشەکەیان ملی قوت کردەوە و هەلْی دایە و بەپەلەپەل و خێراخێرا دەستی پێ کرد، دە دوانزە (قال ، یقول، قیل)ی تری هەلْڕشت، دیسانەوە ناوی چەند ئیمامێکی تری خوێندەوە. فەرمووی: بەلْێ ئەمانە بەناوی بەقا و تەحکیمی دینەوە و مەسلْەحەتی مولْك و میللەتەوە لازم و

واجبه. جووته مەلاکەی تریش دەستیان دا بە سنگا بە (صدقت، صدقت، أحسنت، أحسنت) تەسدیقیان کرد و فتوایان لە سەردا. یەکێك لەوانە دانیشتبوون و لە ئەوەڵی ئەم قسانەوە چرکەی لە خۆی بڕیبوو، بە هەموو ئەعزاکانییەوە گوێی لەم قسانە گرتبوو. وەك مەئمووری ئیجرای ئەم فتوا ناحەقانە بێت و هەموو ئۆباڵ و گوناحی ئەمانە لەسەر ئەوبێ. لە پاش ئەم قسانە وتی من قسەیەکتان عەرز ئەکەم، بزانم ئێوە چی ئەفەرموون، وتیان: بفەرموو بزانین ئەڵێی چی؟

وتی: ئەم خەڵقانەی کەوا ئێستا ئێوە سەر و ماڵ و ژنیانتان حەڵاڵ کردن، ئەمانە ئەگەر بێتو خۆیان لێرە مەوجوود بوونایە و مدافعەیەکی شەرعیی خۆیان بکردایە، دیسانەوە ئێوە لەسەر ئەم قەول و فتوایە ئەمان یان نا؟

سوورەچاوشینەکە و لاڵەپەتەکە هەردووکیان بەجارێ هەڵیان دایە وتیان: مدافعەی وەکو چی؟ ئەویش وتی: بەڵکو ئەمانە بڵێن ئەم حکوومەت و ئیدارەیە حکوومەتێکی وا نییە کە بتوانێ جارێ بەم رەنگە ئیدارەی ئەم موڵك و میللەتە بکات و خۆی و میللەتەکەی بێنێتە ناو و ببێ بە ساحێبی ئەم هەموو ئیسلامە و بچێت بەگژ ئەم حکوومەتانەدا و لە نەتیجەدا ئەم عیبادوڵڵایە تووشی فەلاکەت و زەرەری گەورە بێت. بەم رەنگە ئیشی ناچێتە سەر، ئێمەش لەبەر ئەوە وامان کردووە و ئەیکەین (کابرا نەیئەویست یاخود نەیئەوێرا بە تەواوەتی دان بە هەموو قسەکاندا بنێ بۆیە هەر ئەوەندەی بۆ بێژرا). ئیتر ئەو مەلایەی کە لە سەروو هەموویانەوە دانیشتبوو جوابی دایەوە وتی: ئاغا، ئاغا، ئەو مدافعەیە شەرعی نییە و لە نەزەری شەریعەتدا مەردوودە، چونکە ئەمانە وا دیارە لەسەر مەحوی دینن. کەوابوو ئەم مەعزەرەتانەیان لێ قەبووڵ ناکرێ (لەم قسانەدا گەورەکە رەنگێکی هێنا و برد، رەنگی سوور بووەوە، بەتیلایی چاو سەیرێکی هەموو مەلاکان و ئاغاکەی کرد، لە پاشان چاوی گەش بووەوە و دامرکایەوە). ئیتر ئاغاش قسەی پێ نەما وتی: کەوا بوو هیچ.

ئیتر من لەوێوە نە هۆشم ما و نە شعوور. جارێ وەکوو شێت هەستام قەدەرێك لە ژوورەکەدا ئەمسەر و سەرم کرد، هەرچی خوێن لە رەگەکانما هەبوو مابوو، هەمووی

کەوتە جولەجول و هاتوچۆ. پێستی لەشم ئاگری لێ ئەبووەوە، هەردوو چاوم دەرپەڕێ، دانەکانم تەقەتەق بە یەکیانا ئەدا. تەمام بوو پەلاماری پەنجەرەکان بدەم و هەڵکوتمە سەر مەجلیسەکە، دەست بنێمە بینی مەلاکان و ئەوانی تر، وتم: یارەبی ئەمە چ دڵ و دەروون و ویجدانێکە، ئەمە چ تەتبیقاتی شەرع و قاعیدەیەکە، ئەمانە چۆن ئەم قەرار و فتوایەیان دا؟ ئەوانەی کە رایان کردووە و خۆیان لە شالاو و هالاوی زوڵم و زۆری ئەم زاڵم و خوێنخۆرانە نەجات داوە ئەوا بەجارێك ژن و ماڵیان حەڵاڵ کرا: ئەوی لە ژێر لافاوی غەدری ئەمانەدا ماوەتەوە وەکو ئەمان خەریکی پیاوکوشتن و زوڵم و زۆر نییە. ئەوەتا وا فتوای کوشتنی ئەویش دراوە ئەیکوژن. ئاخۆ ئەمانە هیچ لە خوا و قیامەت و لێپرسینەوە و عەزاب ناترسن، چونکە ئەم زمانە هەروا لە دەمی ئینساندا تەڕ و پاراو نابێت. ناترسن کە لێیان بپرسن: ئایا ئێوە بە چ حەق و سەڵاحییەتێك وا لەم عیبادوڵڵایە ئەکەن؟ جارێ وتم ئەم کابرایە کەوا هەر ناوی دین ئەبات و ئەڵێ من بۆ دینم کردووە و لە رێی دیندا ئەیکەم هیچ تەریق نابێتەوە و لە خوا ناترسێ بڵێ من چ حەقێکم بەسەر ئەم عیبادوڵڵایەوە هەیە. ئەبم بەباعیسی مەحوی سەروماڵیان. بە چ ناوێکەوە و بۆ چ دینێك و بە حوکمی کام شەریعەت ئەمانە دەرئەکەم؟ ئەمانەی لە تاو زوڵم و زۆر وازیان لە ملك و ماڵ و نامووس و حەیسییەت و جێگای خۆیان هێناوە و دەربەدەری وڵاتان بوون، ئاخۆ ئەمانە شوێنی غەیرەدین کەوتوون، یاخود لە ترسی ئەم جۆرە زوڵم و گەورە ناحەقانە (کە دار و بەرد لە بەری ئەلەرزێ) و نیشتوومەتە سەریان بەناوی ناحەق ماڵ و خوێنیان ئەخۆم و ئەخۆمەوە، رایان کردووەتە پەنای عەدالەت و ئەمنییەت. زۆرم بەلاوە سەیر و عەجایب بوو کە خۆی لە پێش مەجلیسەکەدا قسەی لەسەد و هەزار و دووسەد و هەزار ئەکرد، کە مەعلوومە ئەمەی لە ماڵی ئەم موسوڵمانانە پێکەوە ناوە و ئەم عالەمەی خستووەتە سەر ساجی عەلی، بووە بە باعیسی چەند هەزاران مەخلووق، کەچی ئێستا بە چ روویەکەوە جەسارەت ئەکات ئەم نەوعە قسانە ئەکات و ئەم مەلا موبارەکانەیش چەند گورجوگۆڵ بێ گرێ و قۆرت ئەم فتوا ناحەقەیان دا. هیچ بیریان لەوە نەکردەوە ئەم

خەڵقە بە ڕەنجی شان و عەرەقی ناوچەوان خوێنیان بووە بە ئاو هەتا ماڵ و حاڵێکیان پێکەوە ناوە، ئێمە بە چ حەق و شەریعەتێك بڵێین بەجارێ لە دەستیان وەربگیرێ و بدرێ بەم زاڵم و خوێنخۆرە بێ ئینسافانە.

وتم: ئەی خالیق، ئەی مونتەقیم، ئەی قەهار، ئەی عالیمولغەیب، تۆ چی لەمانە ئەکەیت، ئەمانە لە ڕۆژی خۆیاندا چۆن حیسابیان ئەبینی، تۆ لە حەقی ئەمانە چی ئەکەیت؟ ئاخۆ لە دەفتەری مەحکەمەی گەورەی تۆدا گوناحێکی تری وەکو ئەمە قەید کراوە یان نا؟ تۆ بۆ ئەمانە چ نەوعە جەزایەك دائەنێیت؟ تۆ چۆن ئەم حاڵانە قەبووڵ ئەکەیت مەگەر هەر بەحری بێ بنی حیلمی تۆ ئەمانە قووت بدا. تۆ چۆن ئاگر نابارێنی بەسەر ئەم قەومەدا، تۆ ئەو غەزەبەت کە وەکو ئاگر وایە بۆچی بۆ ئەم تاقمە نایەتە جۆش؟ تۆ بۆچی هەر ئێستا ئەمانە بەناخی عەرددا نابەیتە خوارەوە و حەقی ئەم میللەتە قوربەسەرەیان لێ ناسێنی. ئەی ویجدان، ئەی ئینساف ئێوە کە ناوتان هەیە و بۆچی ئێستا ناچنە سوورەتی ئینسانەوە و بێن یەکی چەپۆڵەیەکی زل لە سەروچاوی ئەمانە بنێین و مەحوویان بکەنەوە؟ ئای... ئای... ئای...

ڕوانیم هیچ شتێك نییە و هیچ پەیدا نەبوو، منیش هەروا وەستام لە جێگای خۆم وشك بووبووم. ئەوان هەر قسە ئەکەن، منیش لەبەر خۆمەوە هەر ئەڵێم پەح، پەح، پەح ئەمە چی بوو من دیم. من لە کوێم، ئەمە خەوە یان نا؟ بۆیە هەر دوو چاوی خۆم گلۆفت وتم بەڵکو ئەگەر خەوە خەبەرم بێتەوە، کەچی ڕوانیم هەموو شتێك هەر لە جێگەی خۆیەتی و ئەو جانەوەرانە هەر لە بەرچاومن. هەموو لەشم لە تاوا هاتە لەرزین و دڵم کەوتە کوتەکوت و سەرم گێژی خوارد. لەپڕێکا گرم بە دەما کەوتم بەعەردا. لە ئێش و ئازاری کەوتنەکەم هۆشێکم هاتەوە بەبەردا و هەستامەوە بیرێکم کردەوە وتم ئەمانە فائیدەیان نییە بابزانم چی ماوە بیبینم. هەستام وردە وردە چوومەوە پێشەوە گوێم گرت، هەر قسەیان ئەکرد، بەڵام دوایی قسەیان بوو، هەر ئەوەندە حاڵی بووم وەکو مەلاکان لە مکافاتی ئەم خزمەتە گەورەیەدا کە کردوویانە

داوای شتێکیان کردبێ و ئەویش وەعدی دابنێ کە بیانداتێ، ئیتر ئەوان چوونە دەرەوە، لەو ناوەدا مەلای بڕنووتیکێش لە دەرگاکەوە گەڕایەوە هاتە پێشەوە وتی: ئومێدم وایە ئینشالڵلا خوا هەر موەفەقت بکات مادام تۆ ئەوەندە بۆ ئەم دینە هەوڵ ئەدەیت و تێ ئەکۆشیت، خوا و هیمەتی پیران پشتیوانت بن، ئەویش پێکەنینێکی بۆ کرد، ئیتر ئەوان ڕۆیشتن و مانەوە خۆیان.

دوای ڕۆیشتنی مەلاکان ئنجا یەك دووانێکی لەو پیاوانە بانگ کردە پێشەوە، یەکێکیان کوڵەبنەیەك بوو رانك و چۆغە لەبەر، بە گفتوگۆکەیدا وا دیار بوو ئەمە یەکێکە لە ئاغاواتی ئەو ژوورە چونکە قسەکانی وا دیار بوو کە جیایە لەگەڵ ئەوان. هەر ئەمیش بوو لە وەختی فتوادانەکەدا ئیعترازی لە مەلاکان گرت. یەکێکی تری کەچەڵەی پۆشتە و پەرداخ، خەنجەرێکی دەسك ماهی و دەمانچەیەکی باش بە قەدەوە ئەمیش هەر رانك و چۆغەی لەبەرا بوو، بەڵام هەر بە زمانی خۆیان قسەی ئەکرد، هەر ئەمیش بوو کە بۆ مەسئەلەی لیرە گۆڕینەوە قسەی لەگەڵ ئەکرد، ئەم دووانەی بانگ کردە پێشەوە. لە بەردەم خۆیدا زۆر بە ئەسپایی و هێواشتر، قەدەرێکی چاك قسەی لەگەڵ کردن. بە ئەتوار و دەست هەڵسووڕاندن و حەرەکاتەکەیاندا دەر ئەکەوت کە ئەمە تەرتیباتێکە ئەو بۆیان دائەنێ و بەعزێك ئیشیان پێ ئەسپێرێ و ڕێگەیان نیشان ئەدا، لەم تەرتیبات و فسەفسە بۆم دەرکەوت کەسێکی پێ نیشاندان و بۆی دیاری کردن کە ئەمانە پیاو و زەلامیان بۆ تەعین بکەن و بیاننێرن بیانکوژن. ئیتر من لەم حاڵانەدا کەوا بەبەرچاوما دێت و ئەڕوا هیچم پێ نەمابوو، هەر ئەموت یارەبی ئەمە چییە من ئەیبینم، من هەر ئەوەندە تێ دەگەیشتم ئەیانوت: چوار تفەنگچی بچێت بۆ سەر فلان لە فلان وەختا بچنە ئەوێ، بۆ بەعزێکیان کوشتن و بۆ بەعزێکیان ترساندن و بریندارکردن دانرا. خۆلاسە هەتا نزیك سەعات سێ بەم کەینوبەینەوە بوون، لە پاشترا ئەوانە هەموویان ڕۆیشتن، هەر گەورەکە خۆی و یەکێکی دانیشتوو و یەکێکی راوەستاو لەوێ مانەوە.

## پەردە گۆڕا

ئەم جار یەکێك هاتە ژوورەوە، بەهێواشییەکەوە وتی: قوربان فلان و فیسار هاتوون چی ئەمر ئەکەیت. ئەویش قەدەرێك راما و بیری کردەوە. بۆڵەیەکی لێوە هات. بەساردیێکەوە وتی: بابێنە ژوورەوە. سەیرم کرد سێ کەس هاتنە ژوورەوە، هەوەڵەمینیان یەکێك بوو کورتەباڵا رەنگێکی رەشتاڵە، تازە سمێڵی رەش کردبوو، ئەویان لە پێشەوە هات، گەورەکەیش بە گفت و لوتفێکی رووکەشەوە قیام و بەخێرهاتن و پێکەنینێکی لەگەڵ کرد و لای سەرەوە دانیشت. دووەمیان یەکێکی تر بوو کەڵەگەت و رەنگ سپی، بەڵام وەکوو هەموو لەشی گوشرابێ و هەرچی خوێن لە لەشیا بێت دەرهێنرابێت وابوو. بەقەدەر زەرەیەك سووریی خوێن لە گۆشتیا دیار نەبوو، زەرد زەرد ئەتوت لیمۆیە. ئەویش بەخێرهاتن کرا و دانیشت. دوای ئەو یەکێکی تر کوڵەبنە، هەڵەشە پەلەپەلکەر هات. بە عەزەمەتێکی وشکەوە دانیشت. ئەم سیانە هەرسێکیان هاتن و بەو رەنگە دانیشتن. جگەرە و قاوە و ئەمانە خورا و خورایەوە.

لە پاشاندا ئیشارەتی خلۆەت کرا و دەرگا داخرا. گەورەکە و ئەو سیانە و یەکێك لەوانی تر کە لە پێش مەلاکانەوە هات و لای سەرووی گرتبوو (ئەم کابرایە وا دیار بوو یان لە هەموو دیزەیەکدا ئەسکوێ بێت و یاخود زۆر مەحرەمی گەورەکە بێت، بەڵام بەوەدا کە زۆر ئەهەمییەتێکی نەئەدرایە لام وایە بە وشکی خۆی خۆی بەگەورە دانابوو و خزمایەتیی لەگەڵ گەورەکەدا هەبوو، بۆیە بە سمێڵێکی نەختێك فشەوە جارجارە بەقایم یەك دوو قسەی لاپەرەسەنگی ئەهاویشت) ئەوە هەر مایەوە. کابرای کوڵەبنە و گەورەکەش هەر وەستابوون، یەعنی هەموویان شەش کەس لەوێ مانەوە، منیش وتم بزانین چ رەنگێکە لەم دانیشتنەدا چەند خوێنی ناحەق ئەڕوا و بزانم من هیچ رێگەی دەرچوون و نەجاتم بۆخۆم ئەدۆزمەوە؟ ئەم جار گەورەکە دەمی هەڵهێنایەوە، رووی کردە خەڵقەکە وتی: ئەبێ بزانم چی ئەڵێن و چیتان پێیە. لەو سێ کەسە، کورتەباڵاکەی کە لە ئەوەڵەوە هاتبووە ژوورەوە وتی: ئەڵێن مەسڵەحەت

بۆ تۆ وایە لەگەڵ توركدا رێك بكەوی و بە ئەمر و قسەی ئەوان هەڵسووڕێیت. بنێری بەشوێن ئەواندا كە بێن لێرە دانیشن، ئەوسار ئێرە بە تەواوەتی بۆ تۆ ساغ ئەبێتەوە و شكڵی حكوومەت ئەگری. ئەوسا تۆش ئەتوانی لەگەڵ ئەوان بەرامبەر بە دوژمن هەموو شتێك بكەیت، كە ئەوان بوون بە پشتیوانت، جێگە و مەوقعی تۆ گەورەتر و مەحكەم ئەبێ، كە تۆ لەگەڵیاندا رێك كەوتی و ئەوانت هێنایە ئێرە، ئەوسا ئەوانیش مەجبوور ئەبن لەسەر تۆ شەڕیش بكەن و ئیشی چاكیشت بۆ رێك بخەن. وڵاتەكەشمان بەتەواوی بكەوێتە رەحەتییەوە. ئەویش وتی: ئاخر قسەكانی ئێوە زۆر باش و مەعقوولە، منیش لەلام باشە، بەڵام من هەتا ئێستا غەیری قسە نەبێ هیچی ترم لەوان نەدیوە. فەعالیاتێكیان نییە. ئەوان بە چوار عەسكەری رەشوڕووت و برسییەوە هاتوون هەر خەریكی راووڕووت و خەڵق رووتاندنەوەن. ئەوان هەر پارە كۆئەكەنەوە و خۆیان ئەژێنن، ئیشەكانیان هیچی لە حكوومەت ناچێ. من بە چ شتێكی ئەمانە پشتئەستوور ببم و چۆن لەگەڵیان رێك بكەوم و ئەمنییەتیان پێ بكەم؟ ئەمجا كابرای رەنگزەرد هەڵی دایە وتی: قوربان ئەمە تۆ چی ئەفەرمویت، ئەمەش نەوعە سیاسەتێكە كە ئەوان ئەیكەن. ئەمە لەبەر ئەجنەبی و قسەی دووارۆژە بەم رەنگە هەڵئەسووڕێن، ئەگینا ئەم حەرەكاتانە هەموو بەئەمری (ئەنقەرە)یە. دەقیقە بە دەقیقە ئەمر لەوێوە وەرئەگرن. ئیستقلال بێ و ئیمتیاز بێ و موختارییەت بێ، هەر ئەوان بیدەن بۆ هەموومان مەسڵەحەتە، ئەگەر بێت و لەگەڵ ئەواندا رێك نەكەویت ئەوە موحەقەقە فەلاكەت بەسەر خۆت و میللەتەكەت ئەهێنیت. ئەگەر بەم قسانەی من باوەڕ ناكەیت ئەوە قاقەزی رەسمی (دەستی كرد بەم باخەڵ و بەو گیرفانیا بەعزێك قاقەزی شڕی دەرهێنا و سەیری كردن و هینی ئەم باخەڵی خستەوە ئەو گیرفانییەوە و نەختێك خۆی خەریك كرد، دوایی دەستی دا بەدەستا و بەناخۆشییەكەوە وتی: ئا وەڵڵا نەمهێناوە).

كوڵەبنەكەی لای خواروو كە دانیشتبوو بە دەنگێكی نووساوەوە كەوتە جولەجول وتی: بێ قەزابیت ئەمە ئیشە تۆ ئەیكەیت، ئاخر چەندم عەرز كردی لە بیرت نەچێ. ئەویش

وتی: دەسا چی بکەم وا لە بیرم چووە، خۆ ئێوە بەچاوی خۆتان دیوتانە و خوێندووتانەوە، ئەوانیش بەجووتە وتیان: ئاخر بۆ ئێستاش لازم بوو کە ئەمیش ببیبینیٚ. وتی: قەید ناکات بەلاّم بۆ جارێکی تر هەر ئەیهێنمە خزمەتی خۆشی کە بیخوێنێتەوە (انجا کە عیان چ حاجت بە بیان). ئەمە مەسئەلەیەکی ئاشکرا و دیارە بە بەرچاوەوە هیچ کاغەزیش نەبێت، هەر ئەمە ڕێگەیەکی راست و رووناکە. ئایا لە نوقتەی دیانەت، ئایا لە سیاسەتدا، یا لە هەر خسووسێکی ترەوە کە بیخوێنیتەوە و بیگریٚ، لەمە زیاتر چارە نییە، پەنا و پشتیوانی ئێمە هەر تورکە و تورك... باوك و باپیرە گەورەمان هەر لەگەڵ ئەواندا بوون. خۆشمان هەر پەروەردەی دەست و تەربییەی ئەوانین. گەورەمانن و ساحێبمانن. خۆلاسە ئێمە لەگەڵ ئەواندا نەبیٚ ناژیین و ئیدارە ناکەین. ئەوان ئیسلام و ئێمە ئیسلام. ئایا بە حەسەب دیانەتەوە وە یاخود بە حەسەب شتی ترەوە بێت هەر ئەوان چاکن. قسە هەزارە و دووانی بەکارە. ئێمە و تورکیان وتووە ئەگینا ئێمە چۆن لەگەڵ حکوومەتی ئینگلیزدا هەڵئەکەین. ئەوان لە پاش دوو سیٚ ساڵ ئەمانخەنە سەر ساجی عەلی. هەموو چێوی سواڵمان ئەدەنە دەست. کەس کەس ناناسێت. هەر کەسە بۆ خۆی گەورەی خۆی ئەبیٚ. گەورە و بچووکی نامێنیٚ. قەدر و ئیعتیبار لە ناو ئەچیٚ. ئەمڕۆ ئەم وڵاتە کە هەر جەنابت ئەناسن، ئەوسا کەس هەر ئاوڕت لیٚ ناداتەوە. تۆ چیت و من چیم. گەورەکەش لەم قسانەی کە بەدڵی بوو، زۆر موتەئەسیر بوو، وتی: راستە منیش باوەڕ ئەکەم و ئەزانم کە وایە و بۆ ئێمە هەر ئەمە چاکە و لەوە چاکتر و باشتر چارەیەك نییە، بەلاّم ئێستا ئەڵێن تورك ئەو تورکە نەماوە کە ئێمە دیومانە. ئێستا ئەوان دەخلیان بەسەر دیانەت و شەریعەتەوە نەماوە. خەلافەتیان هەڵگرتووە و خەلیفەیان دەرکردووە. هەرچی ئاداب و ئاینی ئیسلام هەیە هەموویان وەرگێڕاوە. شێخ و مەلایان هەموو دەرکردووە، تەکیە ومزگەوتیان داخستووە. ژن و پیاو پێکەوە لە چاپخانە و مەیخانە سەربەست هەڵئەستن و دائەنیشن. شەبقەیان لەسەر کردووە. قورئانیان تەرجەمە کردووە بۆ تورکی. مەسئەلەی تەلاّق و نیکاحیان گۆڕیوە. کەوابوو فەرقی ئەمان و ئەوان چییە. بگرە ئەجنەبییەکە چاکترە.

ئەم جار هەرسێکیان هەڵیان دایە، بە پێکەینەوە وتیان: قوربان هەڵبەت تۆش بەم پڕوپاگەندانە باوەڕت کردووە؟ ئەم قسانە غەیری بوختان و درۆ نەبێ، هیچی تر نییە. خۆ شوکر جەنابت دنیات دیوە و لە سیاسەت ئەزانی. ئەمە گوایە بەم قسانە فکری خەڵق لە حەق تورك ئەگۆڕن و تێکی ئەدەن. ئەگینا بە هەموو شتێك تەئمینت ئەکەین کە ئەم قسانە هەمووی ئیفترایە و بێ ئەسڵە ئەگەر دین و ئیسلامییەت بێ لای ئەوانە. تۆ چۆن ئەبێ باوەڕ بەم قسانە بفەرموویت؟ ئیتر کابراش بەم قسانە هاتە سەر بارێکی تر. بەهاژە و هووشەی ئەمانە تەواو بڕوای کرد وتی: کەوابوو با ئێمە یەکێك بنێرین بۆ لای ئەوان کە موزاکەرە و گفتوگۆیان لەگەڵدا بکات و قەرارێکی قەتعی و قەول و تەعهەدات تەواو وەربگرێ. رێگە و دامودەزگا بۆ ئێمە دابنێن بە نەوعێکی وا کە بۆ ئێمە چاك بێت ئەوە بەو جۆرە باشە و منیش بەم رەنگە زۆرم پێ خۆشە. هەرچەندە ئەترسم ئەم جارەش بێ فائیدە بێ چونکە ئەمە سەری چەند جارەیە کە پیاو ئەنێرین و بێ فائیدەیە. ئەم جارە ئەبێ بە رەنگێکی وا و یەکێکی وا بنێرین کە بێ نەتیجە نەمێنێتەوە. ئەوانیش وتیان: زاتەن مەقسەدی ئێمەیش ئەوەیە کە یەکێکی تێگەیشتوو و راست و پاك بچێ و موافقی مەتڵەب مەسئەلەی ببڕێتەوە و جوابی قەتعی بهێنێتەوە با ئەم جاریش وەکو جاران نەبێت.

ئێستا وا فلان حازرە (روویان کردە کوڵەبنەی دەنگنووساو) ئەویش هەستایە سەر پێیان وتی: بەڵێ من حازرم، ئەفەرموون لە سبحەینێ زووتر نییە من ئەڕۆم و هەرچۆنێك ئارەزوو ئەکەن و قەرار ئەدەن ئەیبڕمەوە. دووانەکەی تریش وتیان: زۆر باشە لازمە لەم خسووسەوە چی پێویستە ئەو شەرایت و قەول و قەرارە بنووسرێتە کاغەز و ببەیت لەگەڵ خۆت. گەورەکەیش وتی: باشە. رووی کردە کابرای زەردە وتی: تۆ کاغەزێکی باش و درێژ بنووسە لەم خسووسەوە زۆر بەدیقەت و بیهێنە من ئیمزای ئەکەم، ئەمیش حازر بێت هەتا دوو رۆژی تر بڕوات، خوا حافیزی بێت. لە پاشان گەورەکە رووی کردە کابرای کە لە ئەوەلی مەجلیسەوە هاتبوو لای سەرووی گرتبوو وتی: تۆ لەم خسووسەوە چی ئەفەرمویت؟ ئەویش وتی: هەر چۆنێك ئێوە لاتان باش

بێت ئەوا منیش لام باشە. کوڵەبنە کەچەڵەکەی لای خوارەوە وەستابوو. ئەویش هەڵی دایە وتی: بەخوا شت لەمە باشتر نابێ. ئیتر لە سەر ئەمە قەرار درا و گەورەکە بەدڵ و دەروونێکی ساف و بێ گرێوە وتی: لە سبحەینێ زووتر نییە کاغەز بنووسرێ، کابرایش سبحەینێ بەخێر بڕوا. بە روویەکی پێکەنیناوی و دڵێکی خۆشەوە هەستان ڕۆیشتن. مایەوە گەورەکە و کابرای لە ئەوەڵ مەجلیسەوە هاتبوو لەگەڵ کوڵەبنەی کەچەڵەکە. ئەم جار گەورەکە وتی: ئێستا وا باشە بزانین ئەم جارە ئیش چۆن ئەبێ. کابرای کوڵەبنەی کەچەڵە وتی: قوربان سەری تۆ خۆش بێت باش ئەبێ و ئەبێ باش بێت. کابرای تریش وتی: ئومێد وایە هەر باش ئەبێ. لە پاشان گەورەکە کوڵەبنەکەی بانگ کردە پێشەوە بەهێواشییەکەوە پێی وت: تۆ ئێستا بچۆ ئەو پیاوانە حازر بکە. مەیەڵە کەس پێ بزانێت. لە ماڵی خۆتان دایان بنێ. تەمیەیان بکە کە نەیەڵن کەس پێ بزانێ و خۆت لەگەڵ فلاندا تەرتیباتیان بۆ دابنێن هەتا جێبەجێ ئەبن. ئیتر چونکە نەختێك بەچرپە قسەیان ئەکرد. هەموو قسەکانیانم گوێ لێ نەبوو. دوایی کوڵەبنەکە وتی: قوربان سەری تۆ خۆش بێ هەرچۆنێك ئەمر و ئارەزووی تۆ بێت وا جێبەجێ ئەبێت، ئیتر ڕۆیشت بۆ دەرەوە.

## پەردە وەرگەڕایەوە

ئەم جار مانەوەی خۆی و کابرای ئەوەڵ بە جووتە، ئەمە لەو قسە و باسانەدا ژنەکان لە پشتەوە کە هاتوون گوێ ئەگرن. هەر ترپوهۆڕ دێن و ئەچن. قسەکانی ئەوان ئەبەن بۆ ناو ژنەکان و بە فسەفس ئەیگێڕنەوە. منیش هەر لە جێگەی خۆم وشك ڕاوەستاوم. وتم: ئەمە سێ پەردە گۆڕا، یەك لە یەك ناخۆشتر و خراپتر. ئەم کابرایە چ نەوعە ئینسانێکە و ئەوانە چ دەعبایەکن؟ با بزانم دوای ئەمیش چی ئەبێ. لە پاش نەختێك کابرایەك هاتە ژوورەوە ناوی دوو سێ کەسی برد کە هاتوون بۆ حزوور، چی ئەمر ئەکەیت؟ ئەویش بە پێکەنینەوە رووی کردە کابرای تەنیشتی وتی: سەیرە... با ئەوانیش بێن، با بزانین ئەوان ئەڵێن چی؟ ئەم جار ئەمری کرد وتی: بابێنە ژوورەوە.

روانیم لە پاش تۆزێك دەرگا کرایەوە. سێ کەس هاتنە ژوورەوە. یەکێکیان قۆڵی لە عەبا هەڵکێشابوو. بە کەشوفشێکەوە پێش کەوت. گەورەکەش فەرموو فەرمووی بۆ کرد بە بەگم فەرموو فەرموو جێگەیەکی پێ نیشان دا، ئەمری کرد بە دانیشتنی. ئەویش بە ئەدەبەوە دانیشت. لە دوای ئەوەوە یەکێکی تر هات چاکەت و پانتۆڵی لەبەردا بوو، قیافەتەکەی لە قیافەتی عەسکەری ئەچوو. ئەویش جێگەی نیشان درا و دانیشت. ئەمیش نەزۆر کەڵەگەت بوو نەزۆر کورت. نە لەڕ بوو، نە قەڵەو لە عومری چل ساڵێدا دیار بوو. لە پاش ئەو یەکێکی تر هات لە قیافەتی توجاڕا بوو.

لە پاش هەموویان کابرای کە سەر لە بەیانی لە دەرگای حەوشە ئەمری کرد و منی لەگەڵ خۆی هێنایە ژوورەوە ئەویش هات و بەپێیانەوە راوەستا و دەرگاکەیان داخست. بە گەورەکەوە شەش کەس مانەوە. منیش لە بەر خۆمەوە وتم با بزانم ئەم جارە چی ئەبێت و لەم مەجلیسەدا چی پەیدا ئەبێ. دواجار دیسان ئیشارەتی خەڵوەت کرایەوە. کابرای بە پێیانەوە چووە ئەو دیوی دەرگاکەوە وتی، کەس نییە بەم دەورەدا. بەڵام ژنەکان لەودیوەوە هەر فڕکەفڕکیانە دێن و دەچن. ئەم جار لە پاش خۆشوبێش و ئەمانە کابرای کە لە هەوەڵەوە هاتبووە ژوورەوە کەوتە قسەکردن. ملی لێ هەڵبڕی و کە قسەکانی ئەکرد چاوی لێ دەرئەپەڕی بەهێز و قووەتێکەوە قسەکانی ئەکرد، ئەموت ئێستا تووشی شتێك ئەبێت. هەردوو دەستی بەملا و بەولادا ئەسووڕایەوە. ئەیویست ئەو ئەوقسانەی هەموو بێ ئەوەی دەنکی لێ برژێ و لە ناو بچێ بیخاتە مێشك و دەروونی خەڵکەکەوە. قسە کەوتە سەر باسی سیاسەتی تورك و ئینگلیز.
رووی کردە گەورەکە وتی: قوربان ئێستا ئیش بە رەنگێکی وا دیاری داوە کە منداڵی ساوایش تێ ئەگا و ئەیزانێت ئەم میللەتە و ئەم وەزعەتە بێ ئەمەی حکوومەتی ئینگلیز دەستی بەسەرا بکێشێ و پشتیوانیی بکات ناژی و سەر ناگرێ. ئەگەر ئێمە ئومێدێکمان بەبوونی خۆمان و سەربەرزی و گەورەیی ولاتەکە ببێ، هەر بەواستەی حکوومەتی ئینگلیزەوەیە، ئێستا کەوا ئێمە هەوەڵی ئیشمانە و چاومان لە رووناکیی پاشەڕۆژمانە، دیارە خۆمان لە خۆمانەوە هیچمان بۆ پێك نایەت و سەرناگرێ چونکە

نه سەروەت و نه سەنعەت و نه تیجارەت و نه هیچێکی وامان هەیە که خۆمانی پێ بژیێنین. لەبەر ئەوە ئێمە مەعین و پشتیوانێکمان ئەوێ که ئەویش مەگەر هەر حکوومەتێکی گەورە و بەدەست و دەوڵەمەندی وەکو ئینگلیز بێ. ئەمجا رووی کردە پیاوەکەی تەنیشتی ئەوی چاکەت و پانتۆڵی لەبەردا بوو وتی: بابە وایە یان نا؟ ئەویش دەمی کردەوە دەستی کرد بە قسەکردن وتی: ئێمە ئەگەر تەماشای قازانجی عمومی تۆ و هەموو میللەتەکە بکەین و دوارۆژی خۆمان بخوێنینەوە، سەربەخۆ ئیش نەکەین، چارە هەر ئەمەیە بە ئسولێکی مەعقوول لەگەڵ حکوومەتی ئینگلیزدا رێك بکەوین و ئەمینم حکوومەتی ئینگلیزیش زۆر شتی باش بۆ ئێمە ئەکات. خۆ ئەگەر بێت و ئێمە ئومێد و ئەمەلمان بە تورك بێ، ئەوە سەهویەکی زۆر گەورەیە ئەکەین چونکە چەند ساڵە چی بۆ کردووین تا ئێستا بۆمان بکات. ئەوە نموونەیەکیانە لە بن دەستمانە ئەیبینین بە بەرچاومانەوە خەریکی راووڕووت و تالاّن و ئیعانە و خۆلەوەڕاندن و دەستبڕینی ئەم عالەمەن. خۆیان لەوانەن کە چاوەڕوانی دەستی ئێمە بن نەك ئێمە هینی ئەوان. میللەت پێناسین و سەربەستیدان و فیکری گەورەیی و سەربەرزیدان و ئەو نەوعە شتانە لای ئەوان نییە. غەیری (کیسرم بیچرم) و رووتاندنەوە و زوڵم و زۆر و کوشتن و بڕین هیچی تر بۆ ئێمە ناکەن. ئەو معامەلەیە کە تۆ نەفسی خۆت لەگەڵ ئینگلیز کردت ئەگەر نیوەی ئەوەت لەگەڵ توركدا بکردایە ئەمین بە دە دەفعە ئیعدام کرابوویت. تۆ بزانە ئەم بەینە تورك هێشتی کەس بزانێ باسی میللەت و قەومییەت چییە و چی نییە. سەروەت و تیجارەتێك کە لەم چوار پێنج ساڵەدا بۆ ئەم میللەتە پەیدا بوو، بە پەنجا ساڵ لە زەمانی توركدا پێك نەئەهات. من ئەمینم ئەگەر جەنابت لەگەڵ حکوومەتی ئینگلیزدا رێك بکەویت دوو شەشی ئەم میللەتەیە. ئێمە کە میللەتێکین ئێستا موحتاجی موعاوەنەت و رێگە پێشاندانین و میللەتێکی ئیسلامین. بەم حاڵەوە موحەقەق و دیارە لەگەڵ توركدا بەهیچ رەنگێ پێکەوە ناژین. تورك ئێستا ئەو تورکەی پێشوو نەماوە کە ئێمە دیومانە. نە دین و نە ئاینیان لا نەماوە. ئەگەر ئینگلیز دەخلی نییە بەسەر دیانەت و ئادابی میللەتێکەوە، بەخوا تورك نایەڵن بەهیچ

رەنگێك شتێك بڵێین، نە رەعایەتی دین و نە حورمەتی ئاداب و ئایین نامێنێ. عولەما و مشایەخمان بێ قەدر و بێ حورمەت، کەس لێیان ناپرسێتەوە. ئەوی بە دەستیشمانەوەیە هەموومان لێ وەرئەگرنەوە. عەسکەر و تەکالیفی حەرب و ئیعانە و ئەنواع خەرج و باج، هەر بەمانە ماڵمان بە قوڕ ئەگرن. بەڵام حکوومەتی ئینگلیز وا نییە. ئێمەش بەرێوە ئەبا و دەوڵەمەندمان ئەکات. خۆشی خێر و قازانجمان لێ ئەبینێ. ئێمە ئەگەر خۆمان تێگەیشتنمان ببێت و ساحێب هۆش و شعوور بین و هەوڵ و تەقەلا بدەین بە عەقڵ و مەعریفەت بێینە پێشەوە رەنگە لە پاش مودەتێکی تر بۆمان حەقێکی گەورە و جێگایەکی باشمان دەست کەوێ. ئەم جار جەنابیشت ئەو قسانەی من ورد بکەرەوە و موحەقەق بزانە قسەکانم هیچیان بۆ ئەمەل و غەرەزی شەخسی نییە. مەحزا بۆ مەنفەعەتی عموومی قسە ئەکەم. ئەگەر خۆشتان بە مەسڵەحەتی ئەزانن ئەوا بۆ ئەم خسووسە قەرارێك بدەن، با ئیتر بکەوینە رەحەتی و سەربەستییەوە ئەمینم ئەمڕۆ ئەگەر جەنابت لەگەڵ حکوومەتی ئینگلیزدا رێك بکەویت جێگە و مەقامێك کە ئەو بیدا بە تۆ هیچ حکوومەتێکی تر ناتداتێ و هەر کەسێکی تر نەوعە قسەیەکی ترت عەرز بکات موحەقەقە یان بۆ ئەمەلی شەخسییە یان مەقسەدی ئەوەیە فەلاکەت بەسەر جەنابت و میللەتەکە بهێنێت، ئەمەش خوا قەبووڵی نییە، ئینسان  بە خوتوخۆڕایی بە دەستی خۆی خۆی بخاتە تەهلیکەوە. رێگای رووناك و راست بەبەر چاوەوەیە لە پێشمانەوەیە بۆچی لادەین. دوو کەسەکەی تریش کە رەفیقی ئەم پیاوە بوون ئەوانیش دەستیان کرد بەم نەوعە قسانە و چەند نموونە و میسالێکیان بۆ هێنایەوە وتیان: ئەوە میسر، ئەوە عێراق، ئەوە هیندستان.

خۆلاسە بەم قسە مێکەمێچکانە وایان لێ کرد، کابرایان لەم بارە بردە سەر بارێکی تر، هەموو فیکر و قسەکانیانی تەسدیق کرد. وتی: منیش باوەڕم هەیە کە ئەمە وایە بەڵام ئێمە چەند وەختە لەگەڵ حکوومەتی ئینگلیز خەریکین. ئەو بە تەواوەتی رێك ناکەوێت ئێمە چی بکەین. ئەوانیش وتیان: ئەمە خەریك بوون نییە، لازمە بە سوورەتێکی مەعقوول و باش چەند مادەیەك بهێنرێتە قەڵەم بە نەوعێکی وا نە شیش

بسووتێ و نە کەباب، بۆ هەردوو لا باش بێ و دەست بدا. هەر دوولامان قازانجی لێ ببینین. ئەوسا بزانە ئەویش قەبووڵی ئەکات یان نا؟ ئەگەر ئەفەرموویت با چەند کەسێکی تێگەیشتوو بچن بۆ بەغدا. لەوێ قسەی لێ بکەن و قەولوقەرارێکی باش بدەن و لەگەڵیا رێ بکەوین. بەڵکو ئینشاڵڵا هەموو لایەك لە سایەی جەنابتانەوە بکەوینە خۆشی و رەحەتییەوە و بحەسێینەوە. وتی: منیش زۆرم پێ خۆشە و حەزی پێ ئەکەم ئەمەم پێ لە هەموو شتێك پێ باشترە. ئێوە خۆتان سبحەینێ لە جێگایەك گرد ببنەوە و چەند مادەیەك بنووسین کە وەکو ئێوە ئەڵێن بۆ هەر دوو لا باش بێت. ئەوسا یەك دوو کەسی تێگەیشتوو هەڵبژێرین و بیاننێرین. ئەگەر وا بێت، گوایە من چۆنی پێ مەمنوون نابم و بۆچی پێم باش نەبێ؟ ئنجا رووی کردە کابرای سمێل فش کە لە ئەوەڵی هەموو مەجلیسەکەوە هاتبوو لای سەرووی گرتبوو، وتی: تۆ ئەڵێی چی؟ وتی: بەخوا باشە. ئەم قسەیە زۆر جوان و مەعقوولە ئیش لەمە باشتر چۆن ئەبێ؟ خێری پێوە بێت. ئەمە لە هەموو شتێك چاکترە. بە هەموویان لەسەر ئەمە قەول و قەراریان بەست. لە پاشان ئەوانیش هەستان بە مەمنوونی رۆیشتن. لە وەختی رۆیشتندا گەورەکە رووی کردە ئەو پیاوە کە قیافەتی چاکەت و پانتۆڵ بوو. وتی: زاتەن دەمێکە ئەمەت ئەوێ. تۆ خۆت ئینگلیزی، بەڵام بە پێکەنینەوە پێی وت وەکو گاڵتەی لەگەڵ بکات، ئەویش وتی: قوربان کەسمان ئینگلیز نین، بەڵام بۆ خێر و مەسڵەحەتی خۆمان و تۆیش و میللەتەکەیش ئەگەڕێین. ئیتر ئەوان پشتیان هەڵکرد و رۆیشتن. ئەمیش بەهێواشی سەرێکی راوەشاند و چاوێکی لە پیاوەکە مۆڕ کردەوە لە ژێر لێوەوە پرتەوبۆڵەیەکی کرد تێ نەگەیشتم چی وت.

## پەردەییێکی تر

مایەوە خۆی و کابرای سمێڵ فش و کابرای کە سەر لە بەیانی منی لەگەڵ خۆی هێنایە ژوورەوە. (دان ئاڵتوون) گەورەکە هەستا بە ژوورەکەدا تۆزێك سووڕایەوە. بیرێکی کردەوە وتی: ئەمیشمان وا، ئەوانیش وتیان: بەڵێ. ئەویش پێ کەنی و

وتی: کوڕە بەخوا من گاڵتەم بەمانە دێت. ئەوانیش وتیان: سەری تۆ خۆش بێت ئینشاڵڵا هەموو شتێك چاك ئەبێ (وەکو چاکیەتی دنیا بەسترابێت بەسەری ئەوەوە). لە پاشا گوێم گرت لە دەرەوە هەراهەرا و دەنگەدەنگ پەیدا بوو، گرموهۆڕ و قاووقیژ، وتم: ئاخۆ ئەمە چی بێت! روانیم دەرگاکە کرایەوە، چەند کەسێك هاتنە ژوورەوە، بەعزێك بە عەبای ماویی شین و فەقیانەی سپیی درێژ، سەر و پێچی زل، گوڵنگەی چەفتە هاتۆتە خوارەوە، کاکۆڵ بەلای ملیاندا شۆڕ بووەتەوە، لە خەنە و وەسمەدا مۆر بووە. بەعزێکی تر شەرواڵ و مرادخانییان لەبەر کردبوو، پشتێنی شاڵیان بەستبوو. چەفتە و مشکیی زۆریان تێك ئالآندبوو، هەموو چوار ریز و پێنج ریز فیشەکیان لە خۆیان دابوو. خەنجەر و دەمانچە بە قەدەوە، هاتن دانیشتن دەستیان کرد بە قسەی هەلەقومەلەق، یەکێك ئەیکوشت، یەکێك ئەیبڕی، ئیتر مەپرسە لەبەر خۆمەوە وتم ولولولولولو... ئەم دەعبایانە ئێستا دنیا ئەڕووخێنن، یەکێك دەستی خستبووە سەر مشتووی خەنجەر، یەکێك دەستی بە دەستکی دەمانچەوە، شایان بە سەپانی خۆیان نەئەزانی.

وردە وردە کەوتنە قسە و گفتوگۆ، لە پاش چەند قسەیەك گەورەکەش گورجوگۆڵ فیکری گۆڕا و هاتە سەر قسەی ئەوان. کەوتنە سەر باسی ئیدارە و سیاسەت و حکوومەت. بەم نەوعە قسانە کردیان بە قیڕە و هەرا وەك حەمامی ژنان بوو بە قاووقیژ کەس نەیئەزانی ئەڵێ چی، هەر کەسە لەبەر خۆیەوە قسەی ئەکرد. وتیان: ئێمە هەموو بۆچی چاکین بەکەڵکی چی دێین؟ ئەمە چەند ساڵە عومرمان رابواردووە، ئیتر ژیانمان بۆ چییە نامانەوێ، یان ئەبێ هەر خۆمان بین. جارێکی تر خۆمان ناکەین بە ژنی کەس. هەر سەری تۆمان بۆ خۆش بێ، ئیتر چاومان لە کەس نییە. بە خوا نە تورك و نە ئینگلیز نایەڵن بە رەحەتی و سەربەستی دانیشین. تورك بێ (مەمەد ئۆغڵی)یەکانیان*

---

*مەمەد ئۆغڵی (کوڕی محەمەد) مەبەست لە تورکەکانە.

(أیشك كەرەتە وهەریف) [**]مان لیٚ ئەهیٚننە پیٚشەوە. هەر نایەڵن چاومان بکەینەوە. بەسەر و ماڵمانەوە بەشی ئیعانە و مبایەعە و ئیعدامی ئەوان ناکەین. ئینگلیز بێن شەبقە بەسەر، سەبیلێك ئەگرن بەلای دەمیانەوە، ساحێب، ساحێب، ئەبیٚ تەشییان لەبەردا بڕێسین. فەکن فەکنمان لیٚ دائەنێن. کەسمان ناتوانین پەل ببزێوین. کەوابوو نەوەڵڵا هیچمان ناویٚ. هەر خۆمان بین و ئەبیٚ هەر خۆمان بین و دەستی کەسمان بەسەرەوە نەبیٚ. یەکێك لەلای خوارەوە وەستابوو وتی: باشە ئێمەیش هەموو پێمان خۆشە کە هەر خۆمان بین و دەستی کەسمان بەسەرەوە نەبێت. بەڵام ئێستا ئێمە خۆبەخۆیی خۆمان ئیدارە ناکەین و خۆمان پیٚ بەخێو ناکریٚ. حکوومەتێکی گەورە لازمە یارمەتیمان بدا و چاودێریمان بکات. ئەگینا زەحمەتە هەر لەملاولاوە قوتمان ئەدەن و ئەمانخۆن. ئەوانیش وتیان: کەس ناتوانیٚ بمانخوا. خوا یار بیٚ، تورك بیٚ، ئینگلیز بیٚ هەر کامێکیان پەلامارمان بدەن کلاوکلاوێنەیان پیٚ ئەکەین. هێشتا ئەوان شێری جەنگەڵی کوردستانیان نەدیوە. تەیارە و تۆپ و مەترالیۆزی ئەوان لای ئێمە پەشمن. ئێمە خزمەتکاریی کەس ناکەین. سەری ئەمەمان بۆ خۆش بیٚ (ئەموستیان بۆ گەورەکە راکێشا)، بە هیمەتی مشایەخان کارێك ئەکەین لە هەموو دنیادا دەنگ بداتەوە.

ئیتر هەر یەکە لە ئاوازێك لەم چەشنە قسە و هاژوهووژانەیان هەڵڕشت. گەورەکە بەرەبەرە هاتە سەر قسەی ئەوان وتی: بەخوا ئەگەر (بەد)ی ناو خۆمان لێمان گەڕێن، ئێمە بۆ خۆمان زۆر چاك ئەژین. ئەگەر دنیا ببێت بە ئاگری سوور ئیدارە ئەکەین. من قەترەیەك خوێنم هەیە بۆ ئەم ئیشە ئەیڕێژم یان ئەوی بمانەویٚ ئەیسێنم. ئەوانیش هەموو لە خۆشیاندا کەوتنە جوولەجوول وتیان: قسە هەزارە و دووانی بەکارە. قسەی راست و حەق ئەمەیە. هەرچی محەمەدییە محەمەد سەڵاوات. هەر کەس شتێکی ترت عەرز بکات، ئێمە لە کویٚ و ئەسیری لە کویٚ! ئێمە ئەبیٚ لە سایەی تۆوە سەربەست بژین. هەرکەس لەگەڵمان ناکات وای بەحاڵی.

---

[**] أیشك كەرەتە: واتا بیٚ عەقڵی کەر. هەریف: قسەیەکی تورکیی سووکە.

لەگەڵ ئەم قسانەدا هەندێکیان جارجار فەقیانە سپێکانیان لێ هەڵئەکرد و قۆڵیان هەڵئەماڵی، هەندێکیان دەستیان بۆ دەمانچەکانیان ئەبرد وەکو دوژمن بەرامبەریان راوەستابێ و پەلامار بدەن. چاویان لێ سوور بووبوو. منیش لە ژوورەوە هەروا وەختە بوو زراوم بچێ، وتم ئێستا پەلاماری دار و بەرد ئەدەن و ئەیکەن بە هەرا.

خۆلاسە، ئاخری هەموویان قەراری ئەوەیان دا کە هیچ حکوومەتێك قەبوڵ ناکەن. هەر خۆیان بن. بەم رەنگە قەرار درا و ئەوانیش هەڵسان و رۆیشتن. گەورەکە زۆری پێ خۆش بوو. لە پاش رۆیشتنی ئەوان مایەوە خۆی و کابرای سمێڵ فش کە لە ئەوەڵی هەموو مەجلیسەوە دانیشتبوو (کە ئەویش وا دەرئەکەوت ئەم قەرارەی ئاخری لە هەموو قەرارەکانی تر لا باشتر بوو) و کابرای کە سەر لە بەیانی منی لە دەرەوە هێنایە ژوورەوە. سێ بە سێ مانەوە. منیش زۆر سەرم لەم حاڵە سوورِ مایەوە. هەروا تاس ئەیبردمەوە. لەبەر خۆمەوە ئەموت: یارەبی ئەمە چییە و ئەم کابرایە چ ئینسانێکە، کە هەر لە زەرفی سێ سەعاتدا، بە چەند چەشن گۆڕا و بۆچی تۆزێك تێگەیشتن و لێکدانەوەی نییە؟ ئەمانەی هەموو بەلاوە باش بوو و لەگەڵ هەموویان قەراری دا و لە پاش نەختێك لە هەموویان پاشگەز بووەوە. لە پاشان خۆبەخۆ خۆیان کەوتنە گفتوگۆ و قسە. دوایی گەورەکە وتی: ئەم قسانە هەموو بەلامەوە پەشمن و گاڵتەم پێیان دێت، من بۆچی بۆ ئەم خەڵکەی خۆم تووشی ئەزیەت و دەردەسەری بکەم. ئەوەی قازانج و خێری خۆمی تیا نەبێ نایکەم. من هەتا پارەیەکی زۆر نەخەمە سەر یەك و لە بابەت ئیش و کاری خۆمەوە دڵم رەحەت نەبێ، ئەمانە هیچیان ناکەم. هەر کەسێك بێت بە هەوەسی خۆی، بۆ قازانج و کاروباری خۆی قسەیەك بکات، بۆچی من شێتم، منالّم، هەروا شوێنیان بکەوم و بە قسەیان بکەم. ئەگەر لێم بگەڕێن هەتا ئیشی خۆم وەکو ئەیزانم جێبەجێ بکەم ئەوا باشە. ئەگینا من خۆم ئەزانم چی ئەکەم.

ئەوانەی لە خزمەتیا بوون وتیان: بەخوا راست ئەفەرەمووی، تۆ مەجبووریەتت چییە. خۆت بۆ ئەم خەڵقە تووشی زەحمەت و نارِەحەتی ئەکەیت. ئەمانە بە چ کەڵکێکی تۆ دێن، مەسڵەحەتی ختۆ چۆنە وای بکە. بە قسەم ئەم و ئەو مەکە. ئەمانە هیچیان خێرخواهی تۆ

نین. ئیتر من لەم وەختەدا، نە هۆشم لە سەر خۆم ما، نە شعوور، بەبێ ئەمەی بزانم من چیم و لە کوێم، لە خۆمەوە بێ ئیختیار دەستم کرد بە قاقای پێکەنین، پێکەنینێکی وا کە لەو دیوەوە هەموو راچڵەکین و راپەرین و سەیری یەکتریان ئەکرد. ئەمە چییە و ئەوە چی بوو. گەورەکە تووڕە بوو، چاوە شینەکانی دەرپەڕی و وتی: ئەوە کێ بوو. دوایی کابرای دان ئاڵتوون وتی: قوربان ئەوە کابرای حەپسەکەیە کە لە سەر جاسووسیەت گیراوە، خۆت فەرمووت لە ژوورەوە دایبنێن. ئەویش زۆر بە تووڕەییەوە دەستەکانی راوەشاند و وتی: حای، حای، بە خوا باشە. کەوابوو ئاگای لەم هەموو قسە و مزاکەرانەی ئێمە بووە. دەرپەڕییە دەرەوە، بوو بە هەرا و بگرە و بەردە. خۆیان و بەردەستەکانیان پێکا ئەهاتن. کەس ئەیئەزانی چییە و چی ئەکات. منیش ترسام وتم: ئای چیم کرد بەخۆم. بۆچی وام کرد؟ ئادەی ئەو جاسووسە بێننە دەرەوە. ئەوەندەم زانی دەرگا کرایەوە. یەك دوو زەبەح هاتن بە پەلکێشان رایان فڕاندمە دەرەوە. روانیم گەورەکە هەر دوو چاوی دەرپەڕیوەتە دەرەوە و سوور و مۆر بووەتەوە. ئاگری لێ ئەبارێ. لە دڵی خۆما وتم: یا حافیز، یا ئەڵڵا، بۆم بکەیت بمپارێزی لە غەزەبی ئەم پیاوە.

لەگەڵ قیژاندی بەسەرما وتی: راستی بڵێ تۆ جاسووسی کێیت و کێ تۆی ناردووە؟ زوو راستی بڵێ، ئەگینا ئێستا بە دار پارچە پارچەت ئەکەم. منیش شڵەژام. هەر نەمزانی بڵێم چی. وتی: درەنگە راستی بڵێ. منجەمنج مەکە. ئادەی دار بێنن. ئەو وتی: ئادەی دار بێنن من هەموو لەشم هاتە لەرزین، وتم: قوربان بەخوا، بەو خوایەی باوەڕت پێی هەیە، من جاسووس نیم و ئاگام لە جاسووسی نییە، لای خۆم هاتمە ئێرە کاسبی بکەم، پیاوێکی هەژار و بێدەسەڵاتم، بۆ خاتری خوا ناهەقیم لێ مەکەن. خوا هەڵناگرێ. هەر ئەوەندەم وت: وەکو شێت شاڵاوی بۆ هێنام و پەلامارێکی دام وەختەبوو قووتم بدا. دانەکانی لێ بردم بە ریچا وتی: ئەی جاسووس نیت چی ئەکەی لەو ژوورەدا، دیارە هاتووی قسەکانی ئێمە بەریتەوە. وتم: قوربان خۆ من بەهەوەسی خۆم نەچوومەتە ئەو ژوورە، بە ئەمری خۆت خراومەتە ئەوێ، من دەسەڵاتم چییە. ئەمجار دەستی هەڵهێنایەوە، بەهەموو هێز و قووەتی خۆی شەپازللەیەکی لێ دام، شریخەکەی دەنگی دایەوە، هەردوو چاوم لە عەزرەتدا بروسکاندی.

سەرم کەوت بە دیوارەکەدا، وتی: بەڵێ، بەڵێ جاسووس نیت، بەهەوەسی خۆت نەچوویتە ئەو ژوورە، بەڵێ جاسووس نیت، ئا رای کێشنە خوارەوە بۆم تا نیشانی بدەم جاسووس چۆن ئەبێ. ئیتر دوژمنی ئیمانت بێ. هەر ئەوەندەم زانی سەگ و گورگی جەهەننەم پێنج شەشێ رایان کێشام لە پێپیلکانەکان بردمیانە خوارەوە بۆ حەوشەکە. شەویش کردبووی بە سایقە کزەبایەکی ساردی ئەهات، عەرزەکە بەستبووی، تەقەتەقی سەهۆڵەکە، سەرمایەکی وا تف هەڵدەی ئەیبەستێ، رووم کردە عاسمان وتم: خوایە تۆ لەسەر حەقی. ئەمانە وا بە ناحەق وا بە من ئەکەن! بەڵام هیچ سوودی نەبوو. کڕووزانەوەی من هیچ نەگەیشتە جێی خۆی. ئیتر وەك مەڕی قەساب بە سێ چوارێك گرتمیان. بە سەردەما بەسەر ئەو سەهۆڵەدا رایان کێشام. وام ئەزانی سەرم ئەبڕن. ئیتر لە دڵی خۆمدا بەتەمای خۆم نەمام وتم: ئینا لیلا، تەسلیمی قەزا و قەدەر بووم. وتم: ئیتر هیچ چارەم نەما، دەسەڵاتم چییە و چی بکەم. وا ئەم زاڵم و بێ دین و بێ وجدانانە هەر ئەمکوژن، خوا حەقم بستێنێ.

ئیتر یەکێك نیشتە سەر قاچم. یەکێکی تر بە سەر شانمەوە دایان مرکاندم و دامیان بە عەردەکەدا، لە پەلوپۆیان خستم. چرچەم بۆ نەکرا. من زاتەن ئەوەندەم هێز تیا نەمابوو کە پەل بجووڵێنم. یاخوا قەت نەیبینی! شڵپوهۆڕ خۆ بە دار دای گرتم بە تووڕەیی و غەزەبەوە. ئەوەڵ دار کە دای وەشاند، وامزانی شیرێکی تیژە ئەیکەن بە لەشما. دامە زریکە و هاوار. من هاوار ئەکەم ئەو زیاتر دار ئەوەشێنێ.

من لە ژێرەوە وەك گا ئەبۆڕێنم. جوولەم بۆ نەدەکرا. چونکە سوارم بووبوون. دەنگم دەرنەدەهات. ئەپاڕامەوە، ئەلالامەوە. بۆخوا، بۆ پێغەمبەر. تۆ ئەسحابان. تۆ مەلائیکان و ئەولیا، تۆ قورئان. تۆ قەبری باوکت. هاوار، داد، هاوار، هیچ سوودێکی نەبوو. هێزم لێ بڕابوو. ئەو هەر ئەیوت راستی بڵێ. پڕ بە دەم ئەم قیژان بەخوا جاسووس نیم. هیچ نازانم، راستی چی بڵێم ئیتر، هیچ و هیچ* ....

---

* ئەوەی شایانی باسە، ئەم چیرۆکە لە کاتی خۆیدا هەوەڵەکەی لە رۆژنامەی (ژیانەوە) ژمارە (٢٩ی ساڵی ١ رۆژی ١ـ ٧ـ ٩٢٥)دا بڵاو کراوەتەوە. هەروەها باقییەکەی لە رۆژنامەی (ژیان)ی ژمارە (١)ی ساڵی (١) رۆژی ٢١ـ ١ـ ٩٢٦ و ژیانی ژمارە (٢٦) ساڵی (١) رۆژی ٢٩ـ ٧ـ ٩٢٦دا بڵاو کراوەتەوە.

# بەرهەمەکانی

**زنجیرەی شاکارنووسانی کورد لەسەدەی بیستەم دا :**

١- محەمەد مەولوود مەم

٢- موحەڕەم محەمەد ئەمین

٣- جەمیل سائیب

٤- ئەحمەد موختار جاف

٥- ئیبراهیم ئەحمەد (وەك شاعیر و چیرۆکنووس)

٦- دلّشاد مەریوانی

تێبینی : بڕیار بوو کە (١٠) شاکارنووسی کورد لەم زنجیرەدا جێبکەمەوە، بەڵام چونکە ئەم کارە کات و ماندووبوونێکی یەگجار زۆری پێویستە، بۆیە بڕیارمدا جارێ تەنها کار بۆ ئەو (٦) شاکارنووسە بکەم و تەنیا ئەوان لەم زنجیرەدا بکەم بە ماڵ. جا ئەگەر تەمەن و کات هەبوو ئەوانی تریش لە دوای ئەوان تەواو بکەم.

تا ئێستا سێ شاکارنووس لەم شەش شاکارنووسانەی سەرەوە تەواو کراون کە ئەمانەن (محەمەد مەولوود مەم، موحەڕەم محەمەد ئەمین، جەمیل سائیب). ئەم زنجیرەیە تەنیا ئەو شاکارنووسانەی کە لە سەردەمی خۆیان و دوای خۆیان لەلایەن رەخنەگرانەوە بە چاکی ئاوڕیان لێنەدراوەتەوە، دەخاتە بەر تیشك و ئەوانەی کە خەڵکانی تر گرنگیان پێداون لێرەدا بە ئاسانی جێیان نابێتەوە.

هەر بەم بۆنەیشەوە سوپاسی هەرکەس و لایەن و دەزگاییێك دەکەم کە هەر لێکۆڵینەوەییێکی رەخنەیی، یان نووسراوێکی دیکەی ناو رۆژنامە و گۆڤارەکان لەسەر شاکارنووسانی داهاتوومان کە (ئەحمەد موختار جاف ، ئیبراهیم ئەحمەد، دڵشاد مەریوانی)ن لەلا دەست دەکەوێت بۆ رەوانە بکات، من یەگجار سوپاسمەندیان دەبم و لە کتێبەکانی داهاتووشماندا لە سوپاسنامەدا ناویان دەبەم و چەند دانەیەکیش لە کتێبە چاپکراوەکان بە دیاری پێیان دەبەخشم. هاوکاری هەرکەس و لایەنێك دەبێتە مایەی سەرکەوتنی زیاتر و پوختترکردنی زنجیرەی شاکارنووسانی کورد لە سەدەی بیستەم دا.

**د. ئازاد حەمە شەریف**